زنجیرەی کەلەپیاوانی ئیسلام
٢

# السلطان عبد الحميد الثاني

## آخر السلاطين العثمانيين الكبار



# سوڵتان عبدالحمیدی دووەم

## دوا سوڵتانە گەورەکەی عوسمانی

نووسینی: دکتۆر محمد حرب

وەرگێڕانی: دکتۆر ئیبراهیم ئەحمەد شوان

تفسیر
١٤٢٥ك هەولێر ٢٠٠٤ز



سولتان عبدالحمیدی دووەم

دوا سولتانە گەورەکەی عوسمانی

# زنجیرەی کەڵەپیاوانی ئیسلام

هەندێ لە کەسایەتیە ناودارەکانی ئیسلام، کە لە مێژوی مرۆڤایەتی ڕۆڵی کاریگەریان هەبووە و، گۆڕانکاری مەزنیان ئەنجامداوە، سەرکەوتنەکانیان بووەتە مایەی هەراسان کردنی زلهێزەکان و، پیلانگێڕان دژی ئیسلام.

دیارە ئەو دیاردەیەی ئەم کەڵەپیاوانە دروستیان کردووە، بە حەزی بەرژەوەندی ئەوان نەبووە، یان ئاوا حاڵی بوون. هەر بۆیە کۆشش و خەفتیانی بێوچانیان داوە بۆ ناشیرین کردن و لەکەدارکردنیان بە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی نائەکادیمی و نازانستیانە. هەروا هەڵبەستنی درۆ و ناڕاستی، یان دەسکاری کردنی مێژوو، لە کاتێکدا موسڵمانان لە خەوە قوڵەکەیان نقوم ببون و، پابەندی دینی خوا نەبون، بۆیەش توانرا کاریان تێ بکەن و چین و توێژێکیان لێ دروست بکەن، کە ببن بە ئامێر بۆ چەواشەکردنی میللەتەکەیان.

ئەم زنجیرەیە جگە لەوەی، کە خوێنەری کورد بە کەسایەتیە هەرە گرنگەکانی ئیسلام دەناسێنێت، ڕاستکردنەوەشە بۆ مێژوو، هەروا پەردە لادانە لەسەر ڕاستیە شاراوەکان. پێشمان وایە بەم کارە ڕاژەیەکی گەورە پێشکەش بە گەلەکەمان دەکەین.

التفسیر

# سوڵتان عبدالحمیدی دووەم

## دوا سوڵتانە گەورەکەی عوسمانی


نوسینی: دکتۆر محمد حرب

وەرگێڕانی: دکتۆر ئیبراهیم ئەحمەد شوان



التفسیر

١٤٢٥ هەولێر ٢٠٠٤

# ئەم پیاوە

مەبەست لە سیاسەتە ئیسلامیەکەی سوڵتان (عبدالحمید) کۆکردنەوەی موسڵمانانی جیهان بوو لەژێر یەك پەرچەمدا، ئەمەش وەکو دژە هێرشێکی موسڵمانان بوو دژی هێرشی جیهانی ڕۆژئاوا کە دەیکردە سەر جیهانی موسڵمانەکان.

**( ئارنۆڵد تۆینبی )**

(عبدالحمید)ی دوەم یەکێکە لە گەورەترین ئەو کەسێتیانەی کە لە مێژوودا فتوای لەسەر دراوە.

**( ئات سز ) نوسەرێکی تورکی.**

هەڵسوکەوتی (عبدالحمید) بەرامبەر بزوتنەوەی سەهیۆنیزم، ئەوەی دەگەیاند کە ببێتە هۆی لەناوچوونی تاج و عەرشەکەی.

**( حیسام الدین ئەرتورك ) عەقید لە سوپای تورکی**

خوا ڕەحم بە (عبدالحمید) بکات، نە وەزیر نە دەست و پێوەند نە گەل لە ئاستی ئەو نەبوون. کاتێ ئەو تێپەڕی، هێندە بەتوانا و تێگەیشتوو و سیاسی و دووربین بوو، بە وریایی و هەڵس وکەوتی لەگەڵ دەوڵەتاندا، توانی سێیەکە چەرخێك دەوڵەتەکەی لە روخان دوا بخات. گەر دەست و پێوەندی بەتوانا و میللەتی تێگەیشتووی لەگەڵ دەبوو، ئەوا یەکەمین دەوڵەتی لەدوای خۆی بەجێ دەهێشت.

**( سەعیدی ئەفغانی )**

**نووسەر و مامۆستای زانکۆ**

ئەی سوڵتانی مەزن، بەبێ ئابڕوویی بوختانمان پێت کرد.

**(د. ڕەزا تۆفیق ) گەورەترین بیریار لە بزوتنەوەی ئیتحاد و تەرەقی**

ئەی جەمال، ئایا دەزانی کارەساتی ئێمە چیە؟! کودەتامان کرد و نەمان دەزانی ئامێرێکین لە دەستی سەهیۆنیزمدا. گێل بووین.

**( ئەنوەر ) لە گەورە شۆڕشگێڕانی دژی سوڵتان ( عبدالحمید )**

# پێشکەش

پێشکەش بێت بە شێخی مەزن ئەبی موسای تۆپ باش.

بەو هەمو سیفەتە مەزنانەی کە لە مەزنیی ئەودا بەدیم کرد: رووە نورانیەکەی و خاکساریە بێوێنەکەی و ویقارەکەی و، چاکی ز وهد و لەخواترسانەکەی و فەزڵ و بەخشندەیی و شەونخونیی لەسەر بەرژەوەندیی موسڵمانەکان، بەو گشت بەهرە و ئاکارە ئیسلامیانەی کە خوای مەزن بە منەتەوە پێی بەخشیبوو.

دکتور محمد حرب

مەدینەی مونەوەرە ١٤٠٩- ١٩٨٨

**سوڵتان عبدالحمید بەهۆی زیرەکیەوە، هەستی بە گرنگیی کورد کرد لە سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی بۆ زیندوکردنەوەی خەلافەتی ئیسلامی. هەروا بە هۆشمەندی و هۆشیاری و دوربینییەوە، توانی کورد بکاتە دڵڕاسترین بانگخوازی سیاسەتەکەی، هەر بۆیە وەك بەرجەستەی ئەو سیاسەتە دانایە، لەشکری حەمیدیی هاتە بون.**

**تەشکیلاتی حەمیدی شوێنەواری خۆی لەناو مسوڵمانە کوردەکان بەجێ هێشت، کەوا دڵسۆزی و دڵڕاستی و وەفاداریان بۆ خەلافەتی ئیسلامی لە دڵدا ڕواند و پتەو کرد، هەروا بۆ ماوەیەکی مێژویی کەم، بەربەستی گەشەی فیکریی نەتەوەیی بێدینی(عەلمانی) نێوان کوردی کرد.**

**ئەگەر بۆ پەند وەرگرتن ئەزمونی زایۆنیزم لە داگیرکردنی فەڵەستین و ئەوەی لە بۆسنیا ڕویدا وەربگرین، ئەوا لە رابردو و ئاییندەدا، هەست بە خەتەرناکی چاوتێبڕینی ئەرمەنیەکان دەکەین، لەبەر ئەوە ئەوەی لەشکری حەمیدیی و سوڵتان حەمید پێی هەستان-جا نیازەکان هەرچیەك بن-، بەشی گەورەی کوردستانی لە مەترسی داگیرکردن رزگارکرد-لەدەستی ئەرمەن و ئەوروپیە هاوپەیمانەکانیان-.**

**کەواتە لەسەر دەوڵەت و بزافە ئیسلامیە هاوچەرخەکانە، لە مامەڵەکردن لەگەڵ پرسی کوردیی، پرسیارە نیشتمانی و نەتەوەیی و مەزهەبیەکان تێپەڕێنن و پەند لە ئەزمونی سوڵتان عبدالحمید لەگەڵ کورد وەربگرن.**

لە کتێبی (دراسات في الحركة الكوردية المعاصرة) وەرگیراوە

لە نوسینی د.عثمان علی

لاپەرە ١٣٥

# بەناوی خوا

# پێشەکی

ئەم کتێبە داوای ئـەوە ناکـات کـە شـارەزای هـەموو لایـەن و سـەردەمی سـوڵتان (عبدالحمید) بین. بەڵام داوای ئەوە دەکات کــە چاکـترین وێنــەی شـیاوی ئـەم بابەتـەی خستۆتە بەر خوێنەر، بەپێی توانا هەموو ئەو نووسینە مێژوویی و رامیـاری و بیریـیـەی بەکار هێناوە کە لەسەر سوڵتان (عبدالحمید) و سەردەمی نوسراوە.

ئەم کتێبە گرنگیی بەو هۆکارانە داوە کە شێوازی بیرکردنەوەی سوڵتانی پێکهێناوە و لەو هۆیانەی کۆڵیوەتەوە، کە کاری لەو و لـە شـێوازی هـەڵس و کـەوتی کـردووە. ئـەم شێوازەی وایلێکردوە کە بکەوێتە بەر هێرشی بوێـژ و شـاعیرانی ئـەورووپا و ئـەمریکا و هێرشی هۆیەکانی راگەیاندنی رۆژئاوا لە رۆژئاوا و رۆژهەڵاتدا، ئەمە و جگە لە هێرشـی رامیارە رۆژئاواییەکان لەسەری.

لەو سەردەمەدا ئەورووپا ئـەوەی نەدەشـاردەوە کـە لـە مشـوری بـەزاندنی جیـهانی ئیسلامیە بە بەزاندنی (عبدالحمید) و، بە ئاشـکرا دەری دەبـڕی کـە دەیـەوێ دەوڵـەتی عوسمانی لە مێژوو داپچڕێنێ بە لـەناوبردنی عەبدولحـەمید لـە سـەرۆکایەتیی دەوڵـەتی عوسمانی. دوای بەزاندن و داپچڕان نۆرەی بە سروشتیکردن دێت، واتا: ئەو گەلانـەی کـە دەوڵەتی عوسمانییان لێ پێکهاتبوو بە شێوازێکی ئـەورووپی سروشـتی بکرێـن، ئەمـەش روویدا و هێشتا روو دەدات.

بەریتانیا -کە خۆی زلهێز بوو- لەگـەڵ ڕوسـیا ڕێککـەوت بـۆ ئـەنجامدانی کـارێکی سەربازیی هاوبەش بۆ لادانی سوڵتان عبدالحمید لەسەر عەرشەکەی، هەردوکیان پەشیمان بوونەوە. بەریتانیا لە بریی ئەوە دەستی بە پیلان گـێڕانی نـاوخۆیی کـرد، بـەڵام پـووچ بوویەوە. ئینجا ئەورووپا بە ڕێگەی سیاسەتی پشووی درێژی بۆ لەناوبردنی سوڵتان پەنای بردە بەر چەند دەستێکی ناوەخۆیی لە رۆڵەکانی دەوڵـەتی عوسمـانیی هـۆش ئـەورووپی. ئەورووپا و هێزەکـانی جولەکـە سـەرکەوتن و سـوڵتان عبدالحمیـد (پێشـڕەوی کۆمـەڵی

موسڵمانان) لە عەرش دابەزی، بەڵام لە دەروونی موسڵمانان دانەبەزی و پلەوپایـەی لـە مێژوودا هەر مایەوە.

ئەوانەی لەپێش من لەسەر بابەتی ئەم کتێبەیان نوسیوە-کەژمارەیان کەمە- خـاوەن چاکەن لەسەر ئەو شتانەی کە پێشکەشـیان کـردووە و فـەزڵیان هەیـە و (إن شـاء الله) خوای گەورە بەپێی نیازیان پاداشتیان دەداتەوە و بەخێر و چاکە تۆڵەیان بـۆ دەکاتـەوە. بەڵام لێرەدا من مۆڵەت لەوان و لە خوێنەران وەردەگـرم کـە ڕێگـام بـدەن و بڵێـم: ئـەم کتێبەی کە لەبەردەستیانە یەکـەم لێکۆڵینـەوەی پسـپۆڕانەیە لـەزمانی عـەرەبیدا کـە پسپۆڕێکی مێژووی عوسمانی دەینوسێ.

سەرکەوتن لە خواوەیە.

**د.محمد حەرب**

**مەدینەی منەوەرە**

**١٤٠٩- ١٩٨٨**

# بەشی یەکەم

# عبدالحمیدی دووەم

سەرەتاکانی سەردەمی

ماوەی فەرمانڕەوایی

پرۆگرامی بیرکردنەوەی

# پاری یەكەم

# سەرەتاكانی سەردەمی سوڵتان عبدالحمید

## ١/ عوسمانییە پاشینەكان-دوای شڵەژانی دەوڵەتەكەیان- لە هۆكارەكانی راپەڕین دەگەڕێن:

دەوڵەتی عوسمانی لە هەموو جیهان بیستراو و بینرا بوو و ئەو دەوڵەتە مەزنە بوو، كە كاریگەریی بەسەر روداوە جیهانیەكاندا هەبوو، هەموو جیهان سیاسەتی خۆیان بەرەو رووی ئەم دەوڵەتە رێكدەخست. ئەم دەوڵەتە مەزنە شاباڵی بەسەر گەلێ رەگەز و زماناندا كێشابوو و چەند سەدەیەكی دوور و درێژ وێنەی لە مێژوودا كێشرابوو بە شێوەیێ، كە هیچ دەوڵەتێ پێش ئەو ئەم بەشەی پێ نەدرابوو. ژیارەكەی[1] بێ كەم و كوڕی بوو، كاكڵەی ژیاری ئیسلامی بوو بە درێژایی سەدەكانی پێش سەردەمی خۆی، لەسەر ئەم ژیارە رۆیشت و شتی تازەی خستە سەر و پەرەی پێدا، تا گەیشتە پۆپەی شارستانیی ئیسلامی لە هەموو بوارەكانی پەرەسەندندا.

ئنجا دەوڵەتی عوسمانی لە سەردەمێكدا بە ناوی ئیسلام و بەرزوكردنەوەی پەرچەمەكەی بەناو ئەوروپادا بڵاوەی كرد و بە بولگاریا و یۆنان و رۆمانیا و چیكۆسلۆفاكیا و مەجەر و نەمسا تێپەڕی. لێشاوی عوسمانیی ئیسلامی لە پێش ڤیەننای پایتەختی نەمسا وەستا. عوسمانیەكان بۆ یەكەم جار هەستیان بەوە كرد كە ئەو شاڵاوە ئیسلامیەی، كە لە دورگەی عەرەبیەوە دەرچوو و بەرێگەی سەرووی ئەفریقیادا گەیشتە ئەوروپای رۆژئاوا و لەلای سنوری فەرەنسا وەستا-ناتوانن زیاتر بەرەو پێشوە برۆن و لە فەتحكردن بەردەوام بن.

هەركە عوسمانیەكان نەیان توانی شوورەكانی ڤیەننا فەتح بكەن و سەركەوتنە

---

١ پار: فصل ژیار: شارستانی

بەردەوامەکەیان بووە ژێرکەوتن و لافاوەکەیان بووە دەریایەکی وەستاو، سەیرێکی حاڵی خۆیان کرد و لەخۆیان ورد بوونەوە و بینیان کە دەبێ لە چەند هۆکارێکی راپەڕین بگەڕێن تا بەردەوام بن. هەروەها بینیان کە لە هەموو بوارەکانی ژیانیان پێویستیان بە چاکسازی هەیە.

سەرەتا چاکسازەکانیان لە سەردەمی سوڵتان مرادی سێیەمەوە بینیان؛ کە ئاژاوە لە هەموو رشتە[1] کارگێڕییەکانی دەوڵەتدا بڵاوەی لێکردووە و گەیشتوەتە رادەیێ، کە ئەوەی بەرپرسیاریشی نیە و هیچ دەسەڵاتێکی لە کاروباری دەوڵەتدا نیە دەست لە کاروبارەکان وەردەدا، لەسەر ئەوە لە ویلایەت و هەرێمەکانی دەوڵەت هەڵگەڕانەوە پەیدابوو، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئاژاوە و هەڵگەڕانەوە بگاتە پایتەختی دەوڵەت و مەترسی بۆ یەکێتیی رامیاریی دەوڵەت پەیدا بکات. دەوڵەت لە نیوەی یەکەمی نیوەی دووەمی سەدەی یازدەی کۆچی- سەدەی حەڤدەی عیسایی پێویستیەکی زۆری بە چاکسازی هەبوو. ئەم پێویستیە لە سەردەمی سوڵتان عوسمانی دووەم و مرادی چوارەم گەورەترین کار بوو کە دەوڵەت پێیەوە خەریکبوو.

## ٢/ هەوڵدانی عوسمانییە پاشینەکان بۆ گەڕان بەشوێن هۆکاری راپەڕینیان لە چوارچێوەی ئیسلامدا:

سەرەتا ئیلهامی بیرۆکەی چاکسازی لە ئیسلام و مێژووی ئیسلامی و رۆشنبیریی ئیسلامی وەردەگیرا. بیرە گشتیەکە دەیگوت: جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلامی و یاسای ئیسلامی لە دەزگا جۆراوجۆرەکانی دەوڵەت سەر لەنوێ هێز و توانا بۆ دەوڵەت دەگێڕێتەوە.

سوڵتانەکان داوای بیروبۆچوونی بیریارە[2] عوسمانیەکانیان کرد، ئەوانیش لەشێوەی نامە یا راپۆرت بۆچوون و ئامۆژگاریی خۆیان پێشکەش کرد، لەپێش هەمویان و بەناوبانگترینیان ئەفسەری سوڵتانی عوسمانی (قۆچی بەگ) کە راپۆرتێکی دایە سوڵتان و تێیدا دەڵێ: ((جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلامی و حوکمەکانی بە توندی و بێ

---

١ رشتە: دەزگا

٢ بیریار: مفکر

سڵەمینەوە، هۆكارێكی بنەڕەتیە بۆ وەستاندنی لێك هەڵوەشانەوەی دەوڵەت و پاراستنی هێمنی و وەستاندنی ئاشوب و یاخیبوون لە دەوڵەتدا، بەمجۆرە دەوڵەت دەتوانێ هەناسە بدا و بپەرژێتە خۆی بۆ چاكسازیكردن، ئەگەر موسڵمانەكان بە توندی وەڵامی داواكانی شەرعیان دایەوە ئەوا بەرەو سەردەمی فەتحكردن دەگەڕێنەوە)). كەس وەڵامی ئەم داوایەی نەدایەوە و كاری پێ نەكرا.

❋ ❋ ❋

دەوڵەت گەلێ ژێركەوتنی بەخۆیەوە دی و گەلێ پارچە زەویی گەورەی لەدەست چوو، پیاو ماقووڵ و خاوەن قۆناغ و دەمارگیرە ناوخۆییەكان دەستیان گرتە سەر كاروباری ویلایەتەكان، ئەمەش بووە هۆی لەرزینی دەسەڵاتی ناوەندی لە ئەستەنبول. باج وەرگرتن لە جوتیار و خاوەن داهاتی سنوردار بۆ كاروباری جەنگ خەڵكیی بێزاركرد و وای لێهات وازیان لە كشتوكاڵ هێنا و بەرەو شارەكان كۆچیان كرد. سستی كردن لە جێبەجێكردنی شەریعەت بووە هۆی تێكچوونی سوپا و دەست خستنە ناو كاروباری كۆمەڵایەتی و دەرچوونی لە چوارچێوە پسپۆرییەكەی. ئەم تێكچوونی كارگێڕییە بووە پاوانێكی بەپیت بۆ سەرباز و ئەفسەرەكان، ئەمەش بوە هۆی زیادبوونی دەسەڵاتیان و لە ئەنجامدا لە پێش هەمو جوڵانەوەیێ وەستان كە چاكسازی بۆ دەوڵەت دەوێ.[1]

## ٣/ گەڕان بەشوێن هۆكارەكانی ڕاپەڕین و ڕێكخستنی دەوڵەت بە پێی ڕێكخستنەكانی پرۆگرامی ڕۆژئاوایی:

لە ناوەڕاستی سەدەی دوازدەی كۆچی (سەرەتاكانی سەدەی حەڤدەی عیسایی) دەوڵەتی عوسمانی گەیشتبووە ئەوپەڕی تێكچوون و ئاشووبەوە، بەڵام ئەوروپا لەو كاتەدا لە هەموو بوارێكی شارستانی بەرەو پێشەوە دەچوو.

---

١ كۆزانیاری ئیسلامیی (وەرگێڕدراوە توركیەكە) لە بابەتی ڕێكخستنەكان پەرەسەندنی هەڵدانە چاكسازییەكانی دەوڵەتی عوسمانی پێشكەش دەكات بە تایبەتی كاتی ڕێكخستنەكان. نامەی قۆجی بەگ بیروبۆچونی ئەو ئەفسەرە مێژوونوسە چاكسازە بیر تیژە نیشان دەدا.

سەیری قۆجی بەگ بكە لە (قۆجی بەگ) لە كۆزانیاریی زمانی توركی و ئەدەبیاتەكانی. بەرگی ٥/ ل٣٨١-٣٨٢.

بۆیە هەندێ لە بیریارە عوسمانیەکان رایان گەیاند، کە پێویستە سوود لە پێشکەوتنی ئەورووپیی رۆژئاوا وەربگیرێ بۆ دابینکردنی یەکیتی دەولەتی عوسمانی و پاراستنی و بەردەوامبوونی. لەبەر ئەوە وڵات کەوتە بەردەم بزوتنەوەیەکی چاکسازی کە ئیلهامەکەی لە رۆژئاواوە وەرگیراوە.

یەکەم بزوتنەوەی چاکسازی بەم چەمکە لەسەردەمی سولتان ئەحمەدی سێیەم بوو. لەسەرچاوە عوسمانیەکان پیی دەگوترا (سەردەمی گوڵاڵە) یاخود (سەردەمی گوڵە میلاقە) چونکە گرنگی بەروالەت دەدرا دوور لە گەوهەری لە هەموو لایەنەکانی پایتەختی عوسمانی.

ئەم سەردەمە بە بزوتنەوە چاکسازییە شێوازە ئەورووپیەکەی، بەسەرەتای کارتێکردنی رۆشنبیریی رۆژئاوایی و ژیاری رۆژئاوایی لە دەولەتی عوسمانی دادەنرێ، دەولەتە ئەروپیەکان لە وڵاتی موسلماناندا چەند گۆڕەپانیکیان بەدەستهینا بۆ پەیوەندیە رۆشنبرییەکانیان شان بەشانی پەیوەندیە رامیاریەکانیان بە دەولەتەوە.

چینێ لە رۆشنبیران لە دەورەی سولتان و (صدر الأعظم)[1]ی کۆبوونەوە و لەسەر ئەوە ریك کەوتن کە هێمن بوونی وڵاتی موسلمانان لە ئەورووپا حەشاردراوە، بۆیە دەولەت چەند بالیۆزیکی بەرەو پاریس و ڤیەننا هەنارد بە مەبەستی شارەزابوون لە ئەورووپا. بەناوبانگترین بالیۆزی ئەم سەردەمە (محمد چلبی) کە بە نازناوی (یرمی سکز) بەناوبانگ بوو، لە ١٧٢٠ع بەرەو فەرەنسا رۆیشت.

ئەم بالیۆزە لەو راپۆرتەی کە پێشکەشی سولتانی کردبوو زۆر بە پیوەنانەوە ستایشی ژیانی کۆمەڵایەتی فەرەنسای کردبوو، هەر بەم شیوەیە باسی بوارەکانی رامیاری و رۆشنبیری و دەزگا سەربازی و شکۆمەندیی کۆشکی پاشایەتیی فەرەنسیی کردبوو، لەو کاتەدا کۆشکی سولتانە عوسمانیەکان هیشتا بە سادەیی مابونەوە.

ئەم راپۆرتە کاریگەریەکی زۆری هەبوو لە ((وشیارکردنەوەی بۆچونیکی ئیجابی نوێ

---

١ سەرۆك وەزیران

لەبارەی ئەوروپا لەدڵ و دەروونی سولتان و پیاوانی دەولەت)).[1]

* * *

ئەم سەردەمە گیانی چاولیکەریی رۆژئاوایی لە دەروونی عوسمانیەکان وشیار کردەوە و هەلس و کەوت لەگەڵ ژیانی ئەوروپی کرا. سولتانەکان دەستیان بە دروستکردنی کۆشك و تەلاری مەزن کرد و گەلی شتی تریش. تا لە دواییدا جۆرە ژیانیکی نویَ سەری هەلدا کە بەرەو رابواردنیکی لەرادەبەدەر هەنگاوی نا، جۆرە جل وبەرگیَ پەیدابوو کە هەندیَ لە میژوونووسەکان ناویان لینابوو هەلوەدابوون (ابتلاء) جۆرە جل و بەرگیکی گران بەها و بەگەوهەر و بەردی بەنرخ رازینرابویەوە، لەگەڵ بەکارهینانی هەموو ئامرازیکی جوانکاری لە تەلارەکانیاندا، ئەمەش بووە هۆی دەولەمەندبوونی زیرینگرەکان و ئەوانەی ئەمجۆرە سەودایانە دەکەن تا وای لیهات بازرگانیی زیر لە دەستی موسلمانەکانەوە چووە دەستی مەسیحیەکان و دەولەتیش نەیتوانی چاکسازییەکی بەرچاو ئەنجام بدات.

لە ئەنجامی خەریکبوونی دەولەت بەکاری خراپ و سەپاندنی باجی زۆر لەسەر خەلکی، هەست بەوە دەکرا کە جەماوەر لە سولتان و فەرمانرەواییەکەی قایل نین،

---

١ بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ئەم بالیۆز و بالیۆزخانەکەی لە فەرەنسا، سەیری بالیۆزخانەکەی بکە بەپیتی تورکیی لاتینی کە (عبدالله اوجمان) لە زنجیرەی هەزار کتیب نوسیویتی و ئەو کتیبەی کە رۆژنامەی (ترجمان التركية) لە ئەستەمبوڵ دەری دەکات بە ژمارەی (٨٢). ئەم زنجیرەیە میژووی چاپی لەسەر نیە.

هەروەها سەیری کتیبی (فائق رەشید) بکە بە ناونیشانی: بالیۆزە عوسمانیەکان و بالیۆزخانەکانیان ل٥٣-٥٨ کە لە ئەنقەرە دەرچووە سالی ١٩٦٨. ئەم بالیۆزخانانە شارەزاییان لەسەر ئەوروپا هەیە بۆ چاکسازی و رەنگدانەوەی بیروبۆچوونی موسلمانەکانە کە چوونەتە ئەوروپا بۆ ئەوەی سودی لی وەرگرن. هەروەها وینەی دلەر اوکیی موسلمانی رۆشنبیر دەکیشیَ لەنیوان شانازیکردنی بە کلتووری خۆی و نیوان چاك شارەزا نەبوونی لە ئەوروپا، کە چیان لی وەرگریَ و واز لە چی بینیَ. ئەم بالیۆزخانانە سەرەتای دزەکردنی گیانی ئەوروپایە لە ولاتی موسلمانان، لەکاتی خۆی داوام لە یەکیَ لە موسلمانەکان کرد کە نامەی دکتۆراکەی لەسەر ئەم بابەتە بەپیزە بنوسیَ لە میژووی هزر لە ولاتی موسلمانان، بەلام وازی لیهینا.

هەروەها سەیری (انور ضيا قارال)، میژووی عوسمانی، بەرگی ٥ ل٥٦ بکە.

دەستنیشانكردنی فەسادی دەوڵەت كە لەلایەن پیاوانی دەوڵەتەوە ئەنجام درابوو، لەسەر ئاستی رۆشنبیری و ئایینی و رامیاری لە بنچینەوە هەڵەبوو، ئەوەی لەو كاتەدا پێشبینی دەكرا ئەوەبوو، كە دەوڵەتی عوسمانی لە جەنگەكاندا دەبەزێنرێ؛ تاكە هۆكاری بنیاتنانەوەی دەوڵەت خۆی لە دروستكردنی سوپایەكی نوێ و بەهێز حەشار دەدا.

ئنجا سوڵتان سەلیمی سێیەم هات و ویستی چاكسازی لە دەوڵەتدا بكات و هێزی پێشووی بۆ بگێڕێتەوە، هەموو هەوڵ و توانای خستە سەر گۆڕەپانی سەربازی و پشتی بە ئەوروپا بەست.

لەگەڵ ئەوەش لە بواری زانست و تەكنیكەوە ویستی سود لە تاقیكردنەوەكانی ئەوروپی وەربگرێت، بەڵام بزوتنەوەكەی سەلیمی سێیەم چاك خۆی بۆ ئامادە نەكرابوو، خۆ ئامادەكردن پێویستی بە سەرەتا و كات هەیە. بەڵام ئەوروپییەكان سودیان لە باروزروفی ناموسڵمانەكان وەرگرت، یەكێ لە رواڵەتەكانی ئەو سود وەرگرتنە، فەرەنسا چەند قوتابخانەیەكی لە (دالماسیا) كردەوە لەسەر یاسایەكی شۆڕشگێڕی و نەتەوەیی. هەروەها ئەوروپییەكان ویستیان بەرێگەی رێكخراوە فێركردنە بیانیەكان هەستی نەتەوایەتی بڵاو بكەنەوە.[1]

سوپای عوسمانی لە ٢٥ی مایۆی ١٨٠٧ع لە سوڵتان هەڵگەڕایەوە، كە بە ناوی (مستەفا قاباقچی) ناسرابو، چونكە سوڵتان سوپایەكی نوێی لەسەر رژێمی ئەوروپی پێكهێنابوو، سوڵتان سەلیمی سێیەم لابرا و هەموو ئەو شتانەی كە پەیوەندییان بە بزووتنەوە چاكسازییەكەیەوە هەبوو رەدكرانەوە.

ئنجا بزووتنەوەی چاكسازی زیاتر دژوارییی تێكەوت، لە پەیماننامەی (بوخاریست) ساڵی ١٨٠٢ع هەر كە دەوڵەتی عوسمانی بەربژاریی(امتیازات)ی دایە سیربەكان، بەهۆی هەمان چەشنە پەیماننامەكانی نێوان عوسمانی و دەوڵەتە رۆژئاواییەكان بەرێگەیەكی یاسایی سەربەخۆیی دیانەكانی ناو دەوڵەتی عوسمانی پێكهات، وەكو (ئەفلاق و بەغدان) لە رۆمانیا و چیای رەش و مۆرە، هەروەها توندوتیژیی دووبەرەكیی ئایینی و رەگەزی لە

١ لەبارەی چاكسازیەكانی سوڵتان سەلیمی سێیەم بابەتێكی زۆر لە سەرچاوە توركییە نوێ و سەردەمەكان هەیە، بۆ نمونە بنوارە (انور ضیا قارال)، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٢.

بەلقان زیاد بوو.

لەدوای ئەم بزوتنەوە سەربەخۆییانە لە دەوڵەتی عوسمانی کێشەیەکی گەورەی دی پەیدا بوو، کە ئەمەیە: ئەو موسڵمانانەی لەو شوێنانەدا بوون-بەسوکایەتیەوە-ناچارکران لەو شوێنانەی کە لە دەوڵەتی عوسمانی جودا ببونەوە کۆچ بکەن بۆ ویلایەتەکانی تری دەوڵەت، بە تایبەتی ئەنادۆڵ. ئەم کۆچکردنانەش-سەرەڕای مەترسیەکەی- هێندە گرنگیی پێ نەدرا و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی، کە کۆچکردووەکان متمانە و بەقایان بە دەوڵەت نەمێنێ.

* * *

لەبەر ئەم پشێوی و ئاژاوانە پیاوماقوڵ و فەرمانڕەوا خۆجێییەکان بەرەبەرە بەهێزتر بوون و هەڵوێستی تایبەتی بەرامبەر یەکێتیی رامیاریی دەوڵەت ترسناکتر بوو لە سەردەمی سەلیمی سێیەم.[1]

* * *

دەوڵەتی عوسمانی بەشداریی کۆنگرەی ڤیەننای نەکرد لە ١٨١٥ع، ئەو کۆنگرەی کە سەرلەنوێ نەخشەی رامیاریی ئەوروپای دارشتەوە. گرنگیی ئەو کۆنگرەیە لە مێژووی موسڵمانان لەوەدا خۆی باردووە کە (کێشەی رۆژهەلاتی)-کە مەبەستی لەناوچوونی دەوڵەتی عوسمانی بوو لە ئەوروپا- بووە کێشەیەکی رامیاریی واقیعی، ئەمەش وای لە دەوڵەت کرد کە هەڵوێستێکی ترسناکی هەبێ لەوەی کە پەیوەندداره بە سیاسەتی دەرەوەی.

لە سەردەمی سوڵتان مەحمودی دووەم دەوڵەت ناچار بوو، کە لە بزوتنەوە چاکسازیەکەی بەردەوام بێ بۆ ئەوەی پارێزگاری لە بوون و کیانی بکات، دوای ئەوەی کەوتە ناو ماوەیەکی تەنگەتاوی لە سەردەمی هەرەسهێنانیدا.

بەڵام سەردەمی مەحموودی دووەم بە کارەساتی کۆمەڵایەتی و بەرتیل وەرگرتن لە رێکخراوە دەوڵەتیەکان بەناوبانگ بوو. یۆنانیەکان لە ١٨٢٢ع بانگهێشتی دەوڵەتی

---

١ بروانە (یوسف آق جورا)، سەردەمی هەلوەشانەوەی دەولەتی عوسمانی، ل٤٠-٥٠.

یۆنانیان کرد لە مۆرە، بزوتنەوە یاخیبوونەکان دژی دەولەت لە ناوچەی ئەوروپی سەری هەلدا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە سولتان مەحمودی دووەم هانا بەریتە بەر (محمد علی پاشا)ی والیی عوسمانی لە میسر. لە ئەنجامی سەرکەوتنی سوپای میسری لە کوژاندنەوەی ئاشوب لە مۆرە، سولتان-قەناعەتی هینا کە سوپایەکی وەکو محمد علی دابمەزرینێ و کار بۆ ئەمە کرا، واتە دامەزراندنی سوپایەکی نوێ لەسەر شیوازی ئەوروپی لەلایەنی تەقەمەنی و مەشقچی و چەکەکانی. هەرکە (ئینکشاریەکان) دژی ئەمە وەستان و دەستیان بە یاخیبوون کرد، مەحمودی دووەم بەخێرایی لە یۆنیۆی ١٨٢٦ع ئەنجومەنیکی راویژکاریی بەست و بریاری نەهیشتنی تیپی (ئینکشاری) دا و، ریکخراویکی سەربازی نوێ بنیات نرا بەناوی (سەربازە سەرکەوتووە محمدیەکان)، بەلام دەولەت لەو کاتەدا زۆر بە خیرایی هەنگاوی بەرەو روخان دەهاویشت.

سولتان مەحمودی دووەم یەکەم لێدانی لە کێشەی رۆژهەلاتیەوە بەرکەوت لەو کاتەی، کە بە کیشەی چاکسازی و یاخیبونەکانی مۆرەوە خەریکبوو. ئەم لیدانەش لە پەیماننامەی لەندەنی نیوان هیزە ئەوروپیەکانەوە (ئینگلتەرا و فەرەنسا و روسیا) لە شەشی یۆلیۆی ١٨٢٧ع دەرچوو کە دانیان نا بە پێکهێنانی دەولەتیکی یۆنانی کە بە دەولەتی عوسمانییەوە پەیوەنددار بیت.

ئینجا کارەساتی (نوارین) لە ١٨٢٧ع روویدا و هەموو کەشتییە هاوبەشەکانی دەولەتی عوسمانی ویران کران. فەرەنسا بە شیوەیەکی کاتی (مۆرە)ی گرت و روسیا جەنگی لەسەر دەولەتی عوسمانی راگەیاند، لەکاتیکدا کە دەولەت توانای هیچ جەنگیکی نەبوو. نە سوپای هەبوو، نە کەشتی، سەرەرای بەرپابوونی ئاژاوە لە هەندێ لەویلایەتەکان لە ئەنجامی نەهیشتنی تیپی ئینکشاری.

لە ئەنجامی جەنگی روسی لەسەر دەولەت کە ساڵ و نیویکی خایاندو لە ١٨٢٩ع بە پەیماننامەی (ئەدرەنە) کۆتایی هات، دەولەتی عوسمانی ناچار کرا کە واز لە هەندێ قەلا و بەندەری گرنگ بینێ لە قەوقاز بۆ روسیا. دەولەتی عوسمانی ناچار بوو کە سەربەخۆیی بداتە سیرب و ئەفلاق و بوغدان و یۆنان. بەمجۆرە گەلی خاکی گرنگ و بەپیت لەژیر دەستی دەولەتی عوسمانییەوە دەرچوو.

نارەزایی پەرەی سەند و سەرلەنوێ ئاشووب و یاخیبوونەکان لە ویلایەتەکانی دەوڵەت دەرکەوت، ئەمانە هەمو بونە هۆی پەیدابوونی هەندێ تەنگژەی ماڵی و ئابووی کە لە ئەنجامی جەنگەوە سەری هەڵدا لە کاتێکدا کە دەوڵەت ناتوانێ لەم بارە بجەنگێ، هەروەها فرت و فێڵی دەوڵەتە ئەوروپیەکان و هەڵوەشاندنەوەی تیپی ئینکشاری خێراتر دەوڵەتیان بەرەو روخان برد. ئنجا دەوڵەت خۆی لەبەردەم کێشەیەکی زل بینییەوە کە پەیوەندی (محمد علی پاشا)ی والیی میسرە بە دەوڵەتی عوسمانیەوە، (محمد علی) تەماحی لەوەدا بوو کە سوریا بخاتە سەر میسر و لە بەرەنگاربونەوەی دەوڵەت بەردەوام بوو. چەندەها جەنگی لەگەڵ کردبوو و بەسەر عوسمانیەکاندا زاڵ بووبوو و بەرەو پایتەخت دەکشا و سوپای (محمد علی) گەیشتە شاری (قونیە) کە سەر بە پایتەخت بوو و سوپاکەی چووە ناویەوە.[1]



لەنێوانی ئەم تەوژم و رووداوانەدا ئارەزوێکی تازەی عوسمانیەکان سەری هەڵدا کە داوای شوێن پێ کەوتنی ئەوروپیەکانی دەکرد لە بواری زانست و تەکنیکی ئەورووپی. بەرەبەرە ئەم ئارەزووە سەرکەوت تا پێگەی خۆی لە شوێنە گرنگ و رێکخراوەکانی دەوڵەت گرتەوە.

(مستەفا رەشید پاشا) نوێنەری ئەم نەوە نوێیە بوو، کاتی خۆی باڵیۆزی عوسمانی بوو لە فەرەنسا و لەوێوە راپۆرتی بۆ سوڵتان دەناردەوە، ئەم راپۆرتانە زۆر کاریگەرییان بەسەر سوڵتانەوە هەبوو و بە شێوازی رۆژئاوایی شاگەشکە ببوو بۆ رزگارکردنی دەوڵەت لەو گێژاوەی کە تێیدایە.

هزر و بیری (مستەفا رەشید پاشا) بریتی بوو: هۆی سەرەکی تێکچوونی دەوڵەتی عوسمانی لەوەدایە، کە دەوڵەت هێشتا لە یاسا کارگێڕییە کۆنەکەی بەردەوامە و یاسای پەرلەمانتیی ئەورووپی سودبەخشە و پێویستە دەوڵەت دەسەڵات و کارگێڕیی خۆی نوێ بکاتەوە لە سنورێکی دیاریکراو. پێویستە دەوڵەت چاکسازییەکی بەربڵاو لە وڵات بکا لە پێناو مانەوەی دەوڵەتی عوسمانی و لە پێناو دەستەبەرکردنی پەیوەندیی چاکتر بە

١ (أنور ضیاقارال)، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٠.

ئەوروپا. پاشا هەموو ئەوانەی لە راپۆرتەکانیدا رون کردبوویەوە کە دەیناردنە ئەستەنبوڵ.

(مستەفا رەشید پاشا) باوەڕێکی زۆر پتەوی بە رۆژئاوابوونی دەوڵەتی عوسمانی هەبوو، هەر لەم بارەوە لەدوایی فەرمانێکی دەرکرد کە رێکخراوەکانی دەوڵەت لەسەر شێوازی رۆژئاوایی بێ و سوڵتان رەزامەندیی لەسەر کرد و کردیە چرای دەوڵەت.

بڕیارێ دەرچوو بە دامەزراندنی (رەشید پاشا) بۆ وەزیری دەرەوەی عوسمانی، ئەویش لە ئەوروپا گەڕایەوە بۆ ئەوەی چەند لیژنەیەکی جیاواز پێك بێنێ لە وەزارەتی دەرەوە بە مەبەستی پەرەپێدانی پیشەسازی و کشتوکاڵ و بازرگانی و لابردنی یاسای ئیلتزام. بەڵام گرنگترین شت لەو کێشەیە یەکسانیی نێوان عوسمانیەکان بوو، بە واتای یەکسانیی هەموو هاونیشتمانیەکانی دەوڵەت لە موسڵمان و مەسیحی و جولەکە لە کارگێڕی و مافی گشتی و ئەرکی گشتی، لەوانەش سوپا، دوای ئەوەی کە سوپا هەر بە موسڵمانان تایبەت بوو.

(مستەفا رەشید پاشا) فەرمانی رێکخراوە چاکخوازییەکانی ئامادەکرد و خۆی لە ٢٦ی شەعبانی ١٢٥٥ك-١٨٣٩ع لە رۆژی یەکشەممەدا خوێندیەوە و لە رۆژی بڵاوکردنەوەی ئەم فەرمانە ئەمانە هەموو بەشدارییان کرد: سەرۆك وەزیران، شێخی ئیسلام، پیاوماقوڵانی کۆشك، پیاوانی دەوڵەت، زانا موسڵمانەکان، نوێنەری کۆمەڵە پیشەییەکان، بەتریکی رۆم، بەتریکی ئەرمەن و گەلێکی تر لە پیاوانی کەنیسە و سەرۆکی حاخامی جولەکەکان و باڵیۆزی دەوڵەتە بێگانەکان.

دوای ئەوە (رەشید پاشا) بوە سەرۆك وەزیران لە دەوڵەتی عوسمانیدا، چەند جارێ ئەم پایەیەی بینی، یەکەم جار لە ١٨٤٨ع بوو، رەشید پاشا بە زیرەکیی خۆی توانی کێشەی میسر چارەسەر بکا و کۆتایی بە مەسەلەی (محمد علی پاشا) بێنێ و بووە هاوپەیمانی ئینگلتەرا و فەرەنسا بۆ ئەوەی بەرامبەر تەماحکارییەکانی روسیا بوەستن لە دەوڵەتی عوسمانیدا.

(رەشید پاشا) بە رێگەی فەرمانی رێکخراوەکانەوە توانی بنەمای دەرکردنی یاساکان بێنێتە کایەوە بە پشت بەستن بە فەرمانی سوڵتانی و شان بە شانی حوکمەکانی

شەریعەتی ئیسلامی.

لەگەڵ ئەوەی کە فەرمانی ڕێکخراوەکـــان لـە زۆر دەقـدا جـەخت لەسـەر پـەیڕەویی شەرعی ئیسلامی دەکا لە حوکمەکاندا، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ لە هەندێ (لایەنی ماف و کارگێڕیی دەوڵەت بەزۆری پشت بە بیرۆکەی ئەوروپییەوە بەستراوە، هەروەها داوا دەکـا کە ئیلهام لە یاسا ڕۆژئاواییەکان وەربگیرێ ئەوەی کە پەیوەندیی بە مافە سروشتیەکان و مافە گشتیەکان و ئەرکە گشتیەکانەوە هەیە).[1]

لەبەر ئەوەی (ڕەشید پاشا) پێنج جـاران بوەتـە سـەرۆکی وەزیـران و مرۆڤێکـی بـە دەسەڵات بووە و لە ئەوروپا ناوبانگی هەبووە و بە بیری ماسۆنیی ئازاد کاریگەر بـــووە. هەندێ لە سەرچاوە مێژووییەکان بە یەکەم کەسی ماسۆنیی دادەنێن لە وڵاتی عوسمـانی، قوتابخانەیێ یا گروپێکی لە ڕۆشـــنبیرە عوسمانیـەکانی هاوبـاوەڕی پێکـهێنا کـە یەکـەم چارەسەری بۆ بەردەوامبوونی دەوڵـــەتی عوسمـانی بـە ڕۆژئـاوابوونێتی (چـاو لـە ڕۆژاوا بکاتەوە). (ڕەشید پاشا) هەوڵی دا ئەم گروپە کاروباری گرنگ لە دەوڵەت بگرنە دەسـت لە: سەرپەرشتیاری و جێبەجێکردن وەکو والیی ویلایەتـــەکان و وەزیرەکـان و نوسـەرانی کۆشکی سوڵتانی و وەزارەتی دەرەوە و وەزارەتی جەنگ و بەڕێوەبەری قوتابخانە باڵاکـــان و بەڕێوەبەری قوتابخانە سەربازیەکان و هیدی.

ئەو گروپە ڕۆشنبیرە نـاوی لێـنرا (عوسمانیـە نوێیـەکان). ئەمانـە لـەدوای سـوڵتان عبدالمجید) و وەزیرەکەی (ڕەشید پاشا) چالاکیەکی دیاریان هەبوو لە سـەردەمی سـوڵتان (عبدالعزیز)-مامی عبدالحمیدی دووەم- سوڵتان لەنێوان ئـەم عوسمانیـە نوێیانـە خـۆی بینیـەوە. ئەمانـە هـەوڵیان دا دەسـەڵاتی سـنوردار بکـەن، بـــە تایبـــەتی فـــەرمانی ڕێکخراوەکان دەسەڵاتی لە سـوڵتانەوە بـۆ سـەرۆکی وەزیـران و وەزیرەکـان گواسـتەوە. سوڵتان (عبدالعزیز) دڵی بەمانە تەنگ بوو و دژیان وەستا و کوشتیان و سوڵتان مـرادی

---

١ سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٠-٢٥٢ قارال، دەقی فـەرمانی ڕێکخراوەکـان بـە پیتـی لاتینـی تورکـی دەهێنێ. بەڵام بە زمانی عەرەبی (محمد فرید) وەرگێڕانە عەرەبیەکەی فەرمان دێنـێ. بنـوارە (محمـد فرید، مێژووی دەوڵەتی عوسمانیی مەزن، ساغکردنەوەی: ئیحسـان حـەقی، چ٢ بـەیروت ١٤٠٣ك-١٩٨٣ع، هەروەها دانەر باسی وەرگێڕانی عەرەبیی فەرمانی چاکســازیـە خێرخوازیـەکان دەکـا لـە ل٤٨٤ تا ل٤٨٩.

پێنجەمیان-براگەورەی عبدالحمید- لە شوێن دانا کە یەکێك بوو لەوانەی بە هزری ماسۆنیی نێودەوڵەتی کاریگەر بوو و قەناعەتی بە بیری ڕۆژئاوایی هەبوو، بەڵام ئەمە شێت بوو و (عبدالحمید) لە شوێنی دانرا بە ناوی سوڵتان خەلیفە عبدالحمیدی دووەم.

بە هاتنی (عبدالحمید) بزوتنەوەی چاکسازی لە جیهانی عوسمانیی ئیسلامی سەمتێکی[1] نوێی وەرگرت، سەمتێك لە هەندێ کاروباردا ڕۆژئاوا ڕەد دەکاتەوە و لە هەندێکیش وەری دەگرێ، بیری ڕۆژئاوا و ژیاری و کولتوری ڕەد دەکاتەوە و لایەنی پیشەسازی و داهێنان و وێنە شارستانیە سودبەخشەکان وەردەگرێ.

## ٤/ ڕاگەیاندنی ڕێکخراوەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەسەر پرۆگرامی ئەوروپی:

وشەی (التنظیمات) وشەیەکی عەرەبیە و چووە ناو زمانی عوسمانی بۆ گەیاندنی واتای زاراوە رامیاریەکەی: بزوتنەوەی ڕێکخستن و چاکسازی لەسەر پێڕەوی ئەوروپی ڕۆژئاوایی، تاکەکەی (تنظیم)ە و لە زاراوە مێژوویيەکەی بریتیە لە ئەو بزوتنەوە چاکسازیەی، کە لە دەوڵەتی عوسمانی پەیدابوو لە سەدەی (١٣)ی‌ك-١٩عیسایی، لەژێر تیشکی دامەزراو و ڕێکخراوە ئەوروپیەکاندا.

سەردەمی ڕێکخراوەکان بە فەرمانێکی سوڵتانی دەستی پێکرد بەناوی فەرمانی ڕێکخراوە خێرخوازیەکان لە ٢٦ی شەعبانی ١٢٥٥کۆچی-١٨٣٩ع، ئەم سەردەمە لە ساڵی ١٨٧٦ع کۆتایی پێهات، واتا لەو کاتەی کە سوڵتان عبدالحمیدی دووەم دەسەڵاتی گرتە دەست، دەوڵەتی عوسمانی لەم ساڵەدا-واتا١٨٧٦ع- مەشروتیەی یەکەمی ڕاگەیاند، واتا بۆ یەکەم جار ڕاگەیاندنی دەستوری وڵات لەسەر شێوازی ڕۆژئاوایی درا.

هەندێ کەس بەجۆرە پێناسەی ڕێکخراوە عوسمانیەکانی کردوە کە، بزوتنەوەیەکی نوێخوازی و چاکسازییە و پرۆگرامەکەی لە ڕۆژئاواوە وەرگرتووە، هەندێکی تریش بەم جۆرە پێناسەی دەکەن، کە سەردەمی گۆڕانی ڕۆشنبیریی زۆربایە لە وڵاتی عوسمانیەکان، هەندێکی تریش دەڵێن: گرنگیدانی دەوڵەتی عوسمانیە بە شێوەکارگێڕیی

---

١ سەمت: لا، ڕۆخ، طرف.

ئەوروپی. (انکلهارت) لە کتێبە بەناوبانگەکەی (تورکیا و ڕێکخراوەکـان) بـەم شـێوەیە پێناسەی دەکات: (سەرەتا و بەر لە هەموو شتێ بزوتنەوەیەکی قایلکردنی ئەوروپایە بـۆ دەستەبەرکردنی هەڵس و کەوتی نەرمی و یارمەتیی بۆ دەوڵەتی عوسمانی).

* * *

دەتوانرێ بزوتنـەوەی ڕێکخراوەکـانی عوسمـانی پێناسـە بکـرێ: کـە بزوتنەوەیـەکی رۆشنبیری و چاکسازیە لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەی عیسایی لە دەوڵەتی عوسمـانی ڕوویدا؛ ڕێگەی خۆشکرد بۆ بەرپاکردنی حوکمێکی دەستووری لەسەر شێوازی ڕۆژئـاوایی لە وڵات و بۆ نزیککردنەوەی هەدوو جیـهانی موسـڵمان و مەسـیحی. ئـەم بزوتنەوەیـە هەموو بوارێکی ژیان دەگرێتەوە بە لایەنی رۆشنبیری و ژیارییەوە لەسەر حسێبی ژیـاری ئیسلامی لە وڵاتەکانی عوسمانی. دەسەڵاتی سوڵتانەکان، بۆ سەرۆك وەزیران و وەزیرەکان گوازرایەوە و شێخایەتیی ئیسلام کشایەوە و رۆڵی کەم بوو، واتا: شێخایەتیی ئیسلام لە توانا و نرخی کەمکرایەوە و دوایی لەکارخرا.

پێش ڕێکخراوەکان (التنظيمـات) حوکمـی عوسمـانی خـۆی لەسـەر سـێ کۆڵەگـەی سەرەکی گرتبوو: سوڵتانەتی و خەلیفایەتی و شێخایەتی ئیسلام. وەزیرەکـان گوێڕایـەڵی فەرمانەکانی سوڵتان و خەلیفە دەبوون، دیوانی وەزیرەکان یارمـەتی سـوڵتان خەلیفـەی دەدا لە راپەڕاندنی کاروباری دەوڵەت و شێخایەتیی ئیسـلام-زانایـانی ئیسـلام- رۆڵـی راوێژکارییان بۆ سوڵتان خەلیفە هەبوو.

لەدوای ڕێکخراوەکان دەسەڵات کەوتە دەست سەرۆکی وەزیـران و وەزیرەکـان و رۆڵی سوڵتان خەلیفە کزبوو و شێخایەتیی ئیسلام رۆڵی راوێژکاری و نرخی گومکرد.[1]

* * *

١ لە پێناسەی-بـەزمانی عـەرەبی- کورتەیـەکی گشـتی لـە بزوتنـەوەی ریکخـراوە عوسمانییـەکان و مەبەستەکانی، بڕوانە: محمد حەرب، عوسمانیەکان لە مێژوو و ژیاردا، ل٤٨.

# پاری دووەم

## سەردەمی سوڵتان عبدالحمید

سوڵتان عبدالحمیدی دووەم سوڵتانی سی و چوارەمینی دەوڵەتی عوسمانییە، لە تەمەنی سی و چوار ساڵی چووە سەر عەرشی دەوڵەت، لە ١٦ی شەعبانی ١٢٥٨ك-١٨٤٢ع لەدایك بووە.

عبدالحمید لە تەمەنی (دە) ساڵی دایکی مرد و زڕدایکی، کە نەزۆك بوو گرنگی پێدا و چاك پەروەردەی کرد و هەوڵیدا کە سۆزی دایکی لەبیر بکات و سۆزی خۆی پێ ببەخشێ، هەروەها رایسپارد کە میراتەکەی بۆ ئەو بێت. عبدالحمید پێی کاریگەر بوو و سەری لە گرانی و دینداری و دەنگە نزم و نەرمەکەی سوڕما و ئەمانە هەموو لە کەسێتیی عبدالحمید رەنگی دایەوە بە درێژاییی تەمەنی.

عبدالحمید لە کۆشکی سوڵتانی بە رێکوپێکی خوێندی، سەرەڕای ئەوەی کە مامۆستایانی کۆشك دیارترین پیاوانی سەردەمی بوون لە رووی زانست و ئاکارەوە، زمانی عەرەبی و فارسی فێر بوو، مێژووی خوێند و هەندێ شیعری بە زمانی تورکیی عوسمانی هەیە.

گرنگیی بە چەك دەدا و زۆر بەچاکی شمشێری بەکار دەهێنا و نیشانە گرتنی بە دەمانچە راست بوو، لە وەرزشدا پشووی درێژ بوو، چەکە مێژوویییەکانی لەلای خۆی پاراستووە. هەروەها گرنگیی بە زانینی دەنگوباسی رامیاریی جیهانی و پایەی وڵاتەکەی لە جیهان دەدا.

داوای لە کەسانی دەوروبەری خۆی دەکرد، کە رۆژنامە و گۆڤارە ئەوروپییەکان کۆبکەنەوە بۆ خوێندنەوەیان و بۆی وەربگێڕن. حەزی لە خوێندنەوەی رۆمان بوو، تەنیا ژنێکی هەبوو، داوێن پاکبوو، ژنەکەی بەپێی پێوەری شەریعەتی ئیسلامی لەگەڵیدا بوو، نە مسقاڵێ زۆرتر و نەمسقاڵێ کەمتر.

عبدالحمید لە هەڵس و کەوت و خووڕەوشتی سادەبوو، بۆ نمونە چوار پایەکی ئاسنینی

سپی هەبوو وەکو چوار پای نەخۆشخانەکانی ئەمڕۆ بۆ نووستنی، لە گەنجیی تـا مردنـی نەیگۆڕی.

حەزی لە کۆکردنەوەی گیاندار و باڵدار و پەپوولەکان بوو، لە دارتاشـیدا بـەناوبانگ بوو و ئارەزووی لە کۆڵینی تەختە بوو، وەرشـەیەکی تایبـەتیی خـۆی هـەبوو و لـەکاتی بێکاریی کاری تێدەکرد و هەندێ ئامێری داریی دروست دەکرد و دەیکردنـە دیـاری بـۆ خزم و نزیکەکانی.[1]

هەر کە سوڵتان عبدالعزیز سەرۆکی شاندی عوسمانی بوو بۆ ئەوروپا، عبدالحمید لـەو شاندەدا بوو. لەم گەشتەدا شاندە عوسمانیەکە دەیویست خۆی وەکو فەرەنسیەکان نیشـان بدا، بەڵام (عبدالحمید) کە ئەمیر بوو لەم بارە بەدەر بوو، جل و بەرگی زۆر سادەی لەبەر دەکرد، هەڵس وکەوتی لەم گەشـتە ئەوروپیـەی سـادە و شـکۆدار بـوو، بۆیـە گرانـی و سەنگینیەکەی ئەوروپیەکانی بۆ لای خۆی کێشکرد.

عبدالحمیدی ئەمیر خۆی بۆ ئەو گەشتە ئامادە کردبوو، گەلێ شت سەرنجی راکێشـا، بە وردی دەینواڕیە شتەکان و حوکمی لەسەر ئەو شتانە دەدا کە لە ئەوروپا بینیبوونی و شارەزایی لێی پەیدا کردبوو. لە فەرەنسا چـەند ئەفسـەرێکی گـەنجیان بەگـەڵ هـەردوو ئەمیرە عوسمانیەکە (مراد و عبدالحمید) دابوو، هـەردووکیان بەرکەبـەری دەیـان بردنـە شوێنی رابواردن و ژیانی شەوانی پاریس، عبدالحمید هەموو ئەمانەی رەدکردەوە و هیـچ دەستی بۆ پێکی مەی نەبرد.

شاندە عوسمانیەکە چاویان بە رامیارە ناودارەکانی سەردەم کەوت: ناپلیۆنی سێیەم لە فەرەنسا، شاژن فیکتۆریا لە ئینگلتەرا، لیۆپیدی دووەم لە بەلجیکا، غەلیوومی یەکەم لە ئەڵمانیا، فرانسوا جۆزیف لە نەمسا.

هەر کە سوڵتان (عبدالعزیز) وەفاتی کرد، ئـەمیر مـراد شـوێنی گـرت لـە عەرشـی

---

[1] ئەم نوسەرانە لەوانەش (نجیـب فـاضل) کـە بوێـژ و شـاعیر و بیریـارێکی ئیسـلامیی تورکیـە، لـە کتێبەکەی سوڵتانی مەزن عبدالحمیدی دووەم (چ٤، ئیستانبوڵ ١٩٨١)، (مستەفا مفتی أوغلو) لـە کتێبەکەی، سوڵتان عبدالحمید لە هەموو سوچەکانیەوە، هەروەها (انور ضیا قارال) لـە کتێبەکـەی پێشووی، هەموو باسی سیفەتە رواڵەتی و واتاییەکانی سوڵتان عبدالحمیدیان کردوە، بۆ نمونە بڕوانە: (مستەفا مفتی أوغلو)، سوڵتان عبدالحمید، سەرچاوەی پێشوو ل٩-٢٣، ئیستانبوڵ ١٩٨٥.

عوسمانی بە ناوی سوڵتان مرادی پێنجەم، بەمجۆرە عبدالحمید بووە جێگری سوڵتان.

سێ مانگ بەسەر فەرمانڕەوایی (مراد) تێ نەپەڕیبوو، کە نیشانەی پەشۆکانی دەماریی پێوە دیاربوو لەدوای چوونە سەر عەرشی بە حەفتەیێ، ئیتر ئەم حاڵەتەی بەرەبەرە زیادی کرد و هەر کە ڕوون بوویەوە کە چاکبوونەوەی ئاسان نییە، پزیشکە پسپۆڕەکان بڕیاریان دا کە شایانی بەردەوامبوونی نییە لە فەرمانڕەواییدا و وەزیرەکان لە ١٠ی شەعبانی ١٢٩٣ك-٣١ی ئۆغستۆسی ١٨٧٦ع کۆبوونەوە و بڕیاریان دا کە پێویستە سوڵتان عبدالحمید لە شوێنی دابنرێ، لە ڕۆژی دواتر دوبارە وەزیرەکان کۆبوونەوە و بانگی شێخی ئیسلام و خەڵکی کارسازیان کرد و فتوای شەرعی دەرکرا بە لابردنی (مراد).

لە ١٨ی شەعبانی ١٢٩٣ك- ٧ی سێپتێمبەری ١٨٧٦ع سوڵتان عبدالحمید فەرمانڕەوایی گرتە دەست.

* * *

## ١/ ئەو میراتیەی کە بۆ سوڵتان عبدالحمید مایەوە:

" کە عبدالحمید هاتە سەر عەرش گیروگرفت لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی دەوڵەتی دابوو، بودجەی بەتاڵ، سەربازی بێچەك، خەڵکانێ ختوکەی خۆیان دەدا بە خەونی جوانی نەتەوایەتی، گەلێکی تامەزرۆ بۆ حوکمی پەرلەمانی. لەپاڵ ئەمانەش پیلانە نێودەوڵەتییەکان بۆ هێنانەدیی هیوای نەتەوایەتیی هەندێ ڕەگەزی عوسمانی. ئەمە و جگە لەو پیلانە رامیاریانەی کە مەبەستی دابەشکردنی میراتی پیاوە نەخۆشەکە بوو (واتا: دەوڵەتی عوسمانی لە کاتی کزبوونی).

ئیتر دەبێ عبدالحمید چی بکا دوای ئەوەی، کە دەستووری راگەیاند بە مەبەستی قایلکردنی گەلەکەی، کە تامەزرۆی حوکمی راوێژکاری بوون و وەزیرەکانی مەبەستیان بوو، کە ئەورووپا رازی بکەن، بەردەوام داوای چاکسازی لێ دەکردن؟

پێویستە چی بکا، راگەیاندنی دەستور ئەورووپا قەناعەتی پێ نەهێنا و وازی لەوە هێنا، کە بەردەوام دەستی لە کاروبارە تایبەتیەکانی دەوڵەت وەردەدا، ئەو دەستورە ڕوسیای قەدەغە نەکرد لەوەی کە هەڕەشەی جەنگی لێ بکا و دانوستان لەگەڵ

دەوڵەتەکان بکا سەبارەت بە دابەشکردنی شارەکانی؟

دوای ئەمە کوا ئەو هێزەی کە یارمەتیی بدا بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕشە ڕەگەزییەکان و بەرەنگاربوونەوەی هەڕەشە ئەورووپییەکان.؟

کوا هێزی سوڵتان دوای ئەوەی کۆشکی سوڵتان پڕی مەسیحی و جولەکە بوو، کە هەندێ ناوی ئیسلامییان لەخۆنابوو و دژی بەردەوامیی دەوڵەت بوون؟ کوا ڕەسانایەتیی پایتەختی سوڵتان و بنکەی سەرۆك وەزیر و وەزیرەکان دوای ئەوەی تووشی ئەڤینی ڕۆژئاوا بوون و هەوڵی قایلکردنیان دەدا لەسەر حسێبی دەوڵەتەکەیان؟."[1]

❊ ❊ ❊

"لە کۆنگرەی بەرلین گەورەترین بیست پزیشکی دیبلۆماسی ئەورووپی لە دەوری مێزێکی کەسك دانیشتن، سێ ڕۆژی بەردەوام باسی باری دەوڵەتی عوسمانییان کرد کە ناوی لێنرابوو پیاوی نەخۆش.

لە کۆتاییی گفتوگۆکردنەکانیان هەر بیستیان بڕیاریان دا کە "قاچی ڕاستی پیاوی نەخۆش ببڕن." ئەمەش سەرەتایەك بوو، دوای قاچی باکوریان بڕی، ئنجا دەستی ڕاستی و دواتر دەستی چەپی.

هەرکە هەرچوار نەشتەرگەرییەکە سەرکەوت، پزیشکەکان بە نەخۆشەکەیان گوت: ڕاست بەوە، نەخۆشیەکەت نەما، تۆزێ لە پێشمان بڕۆ تا کاریگەریی ئەنجامەکەی ببینین.

نەخۆشەکە جەختی لەسەر نەجوولان کرد، چونکە بارە تازەکەی یارمەتیی ئەمەی نادا. دوای ئەم نەشتەرگەریە زۆربالییە پێیان گوت: "تەنیا چارەت ئەوەیە ئەو ئەندامانەی کە ماوتە بەسەر مۆزەخانە ئەورووپییەکان دابەش بکرێن بۆ توێکردنیان و ئەنجامدانی چەند تاقیکرنەوەیەکی فیزیۆلۆجی لەسەریان."[2]

❊ ❊ ❊

---

١ لەبارەی ئەو میراتە قورسەی کە بۆ سوڵتان عبدالحمید مایەوە، بنوارە: محمد جمیل بیهم، عەرەب و تورك لە زۆرانبازیی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا، ل١٣٠.

٢ قارال، ب٨ ، ل٨٠.

دوو پەرەگرافەکەی پێشوو بە تەواوی ئاماژەن بەو میراتەی کە بۆ سوڵتان عبدالحمید بەجێما هەر کە بووە سوڵتانی عوسمانی. پەرەگرافی یەکەم هی نوسەری عەرەبیی هاوچەرخ (محمد جمیل بیهم)ە و پەرەگرافی دووەم هی باڵیۆزی ئەڵمانیایە لە ئیستەنبوڵ (ام،دو، بلوویتش) کە خۆی هاوچەرخی روداوەکان بوو.

## ٢/ ئەو کێشانەی کە بانگخوازانی چاکسازیی ڕۆژئاوایی پەیدایانکرد.

سوڵتان عبدالحمید لە کۆشکی (طوب قابو) لە ئەستەنبوڵ لە ٣١ی ئۆغستۆسی ١٨٧٦ع لەسەر عەرشی دەوڵەتی عوسمانی دانیشت. یەکسەر (رشدی پاشا)ی سەرۆك وەزیر دەستی لەکارکێشایەوە و (مدحت پاشا) شوێنی گرت، ئەمەی دوایییان تاقیکردنەوەیەکی رابردووی لە سەرۆکایەتیی وەزیرانی سەردەمی سوڵتان عبدالعزیز هەبوو.

لەو ساڵەی کە عبدالحمید چووە سەر عەرش، هەندێك یاخیبوون لە بەشە ئەوروپییەکەی دەوڵەت بەردەوام بوو کە ئەمانە بوون:

(جیل الاسود، صرب، بۆسنە، هرسك) کە ئێستا هەموویان لە چوارچێوەی دەوڵەتی یۆگسلافی یەکگرتوودانە. ئەم شۆڕشانە بە پلەی یەکەم لە ناخی ئەو میللەتانەوە هەڵنەقوڵاوە، بەڵکو ڕوسیا هانی دەدان و ئەفسەری ڕوسی شۆڕشەکانیان بەڕێوە دەبرد.

هەر کە ئەم یاخیبوونانە زیادبو و کاریگەرییەکی جیهانیی خستە ئاراوە، بڕیاری کۆبوونەوەیەکی نێودەوڵەتی درا، کە ئەم دەوڵەتانە بەشداریی تێدا بکەن: ئینگلتەرا و فەرەنسا و ئەڵمانیا نەمسا-مەجەر لە ئەستەنبوڵ لە رۆژی ٢٣ی دێسەمبەری ١٨٧٦ع بۆ باسکردنی ئەو چاکسازییانەی کە پێویستە دەوڵەتی عوسمانی لە ناوچەی بەلقانی بکات، ئەم کۆبوونەوەیە لە سەرچاوە عوسمانیەکان پێی دەگوترێ کۆنگرەی تەرسانە.

کۆنگرە لە یەکەم کۆبوونەوەیدا روبەرووی کارێکی ناکاوی دەوڵەتی عوسمانی بوو، کە راگەیاندنی پێکهێنانی حوکمی دەستوری بوو، بەشداربوانی کۆنگرە ئەم راگەیاندنەیان بە تەقەی خۆشیی ئەم بۆنەیە پێناسەکرد.

## = کێشەی تووشبوونی دەوڵەتی عوسمانی بە جەنگینی لەگەڵ ڕوسیا

(لۆرد سالسبەری) سەرۆکی شاندی ئینگلیزی لەو کۆنگرەیە لەگەڵ سوڵتان عبدالحمید کۆبوویەوە و داوای لێکرد، کە زیانەکانی ڕوسیا ببژێرێ تا لە غەدرکردنی بە دور بێت. بەمجۆرە دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان دەحەسێنەوە، هەر کە ڕوسیا دەست لە کاروباری دەوڵەتی عوسمانی وەرنەدا.

سوڵتان عبدالحمید زۆر حەزی لە ئاشتی بوو لەبەر باروزروفی دەوڵەت و بێتوانایی لە سەر جەنگ. هەروەها ئەلکساندەری دووەمی قەیسەری ڕوسیا ئارەزووی لە جەنگ نەبوو، بەڵام ئەوانەی لە دەوری بوون حەزیان لێبوو، جا بۆ ئەوەی دەمکوتیان بکات، داوای بژاردنی لە عوسمانیەکان کرد بۆ قایلکردنی شەڕخوازەکان تا بێدەنگ بن، قەیسەر دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکانی بەمە ئاگادار کردەوە. لەلایەنی عوسمانییەوە مەدحەت پاشای سەرۆك وەزیران و وەزیرەکان ئارەزوویان لەجەنگ بوو و داوایان دەکرد.

کۆنگرەی (تەرسانە) لە ئەستەنبوڵ بە بڕیاری کێشانەوەی هێزەکانی عوسمانی لە سیرب و (جبل الاسود) و پێدانی ئۆتۆنۆمی بە (بولگاریا) و (بۆسنە) و (هەرسك) کۆتاییی پێهێنرا. بەڵام مەدحەت پاشای سەرۆك وەزیران ئەمەی ڕەدکردەوە و جەختی لەسەر جەنگ کرد، سەرەڕای کەمتوانایی دەوڵەت. جارێکیتر دەوڵەتە ئەوروپیەکان لە ٢١ی مارسی ١٨٧٧ع کۆبوونەوە و بڕیاری سووککردنی بڕیارەکانی کۆنگرەی ئەستەنبوڵیان دا، واتا کۆنگرەی (تەرسانە) و بە دەوڵەتی عوسمانییان ڕاگەیاند.

مەدحەت پاشا ئەمەی ڕەد کردەوە، بۆ ئەوەی سوڵتان ناچاری جەنگ بکات. مەدحەت پاشا هانی قوتابیەکانی زانستە شەرعیەکانی دا کە لە شەقامەکان خۆنیشاندان بکەن و داوای چوونە ناو جەنگ بکەن. لە کۆتاییدا ئەلکسەندەری دووەمی قەیسەری ڕوسیا ڕایگەیاند، کە دەتوانێ جەنگ لەنێوان ڕوسیا و دەوڵەتی عوسمانی قەدەغە بکات، ئەگەر عوسمانیەکان واز لە شارۆچکەی (لکشیك) بێنن بۆ (جبل الاسود). هەر کە مەدحەت پاشا ئەم پێشنیازە کۆتاییەی ڕەد کردەوە، ڕوسیا جەنگی لەسەر دەوڵەتی عوسمانی ڕاگەیاند.

ئەم جەنگە ناوی لێنرا جەنگی عوسمانی و روسی ١٨٧٧-١٨٧٨ع بەناوی جەنگی

(٩٣)ش ناوی دەرکرد، کەساڵی ڕۆمی بوو بۆ دەستپێکردنی جەنگەکـە. ئـەنجامی ئـەم جەنگە لە بەرەی بەلقان (بەرەی دانوب) ئەوەبوو کـە سـوپای ڕوسـی چـووە نـاو خـاکی دەوڵەتی عوسمانی، سەرەتا گەیشتە (سـۆفیا) ئنجـا (قـیزانلق) و (فلبـە) و (ئەدرەنـە). سوپای ڕوسی گەیشتە کەناری ئەستەنبوڵی پایتـەختی دەوڵـەتی عوسمـانی، ئـەم ڕۆخ و کەنارە ناوی (ئایاستفانۆس) بوو، ئەمە و جگە لە سەرکەوتنەکانی ڕوسیا بەسەر سـوپای عوسمانیدا و دەست بەسەرداگرتنی ڕوسیا بەسەر چەند شـارێکی گرنـگ لـە ڕۆژهـەڵاتی ئەنادۆڵ و جگە لەو کارە دڕندانانەی کە ڕوسیا و بولگارەکان لە (بـەلقان) ئـەنجامیان دا دژی موسڵمانە عوسمانیەکان کە بووە هۆی کوشتنی هـەزارەها و کۆچکردنـی هـەزارەها بەرەو ئەنادۆڵ و شوێنی تر و ئـەم زەویانـەیان بەجێهێشـت کـە ٥٠٠ سـاڵ زیـاتر لێـی ژیابوون.

دەوڵەتی عوسمانی ناچارکرا کە پەیماننامەی (ئەیاستفانۆس) لە ٣ی ئـاداری ١٨٧٨ع مۆر بکا لەنێوان عوسمانی و ڕوسیادا. ئەم پەیماننامەیە گەلێ مەرجی خراپی بۆ دەوڵەتی عوسمانی تێدابوو.

هەروەها ئەم پەیمانە بڕیاری دا، کـە پاشـایەتیی بولگاریـا دابمـەزرێ و لـە دەوڵـەتی عوسمانی بکرێتەوە) کە لە (دەریای ڕەش)ەوە تـا (ئـەلبانیا) درێـژ دەبێتـەوە و ناوچـەی (قیرقلەر ئیلی)ش دەگرێتەوە، (سیرب) و (جبل الاسود) وەکو دوو دەوڵەت سەر بەخۆییان وەرگرت، ڕۆمانیا سەربەخۆیی وەرگرت و شـارەکانی (قـارس) و (ئـەردەخان) و (بـاتوم) درایە ڕوسیا. لەگەڵ ئەمەش دەوڵەتی عوسمـانی قەرەبوویـەکی زۆری جـەنگ دەدا، کـە بڕیی ملیارێك و چوارسەد ملیۆن ڕۆبڵە.[1]



دوای ئەو کارەساتە گەورەیەی کە تووشی دەوڵەت بوو، سوڵتان عبدالحمید ڕۆڵی ئـەو

١ کتێبەکەی (محمد اجیق کوز اوغلو) کتێبێکی قوتابخانەیی سوودبەخشـە کـە بـەچاکی و خـێراپی و سادەیی کێشەی تووشـکردنی دەوڵـەتی عوسمـانی بـۆ جـەنگێن لەگـەڵ ڕوسـیا نیشـان دەدا لەگـەڵ پەرەسەندنی ئەم جەنگەدا، سەیری کتێبەکەی بکە (نووسینی مێـژووی دەوڵـەتی ئیسـلامی- اسـلام دولتلری تاریخی)، ئەستەنبوڵ، ١٩٧٥، ل٣٦٨-٣٧٣، هەروەها سـەیری (قـارال) بکـە، سـەرچاوەی پێشوو، ل٦٦.

وەزیرانەی کەمکردەوە کە دەوڵەتیان تووشی ئەو نەهامەتیە کرد، هەروەها هەموو لێپرسینەوە سەرەکیەکانی بۆ خۆی هێشتەوە، واتا سوڵتان بەرەو حوکمی تاکەکەسی چوو و سەرپەرشتیی هەموو شتێکی گەورە و بچووکی دەکرد لە دەوڵەتدا.

سوڵتان عبدالحمید لە ١٣ی شوباتی ١٨٧٨ع ئەنجومەنی پەرلەمانیی عوسمانیی لەکارخست بۆ کاتێکی نادیار و دەستووری هەڵپەسارد و خۆی کاروباری وڵاتی بەڕێوە دەبرد.

سوڵتان بڕیاری دا کە باوەڕ بە پەیماننامەی (ئەیاستفانۆس) نەهێنێ، کە سەرۆك وەزیران و وەزیرەکان و پەرلەمان بەسەر سوڵتانیان سەپاند و ناچاریان کرد، کە بچێتە ناو جەنگەوە. سوڵتان هەندێ کاری دیپلۆماسیی لەگەڵ دەوڵەتە ئەورووپیەکان ئەنجام دا بۆ سووککردنی بنەمای ئەم پەیماننامەیە و سوڵتان توانی یارمەتیی ئەو دەوڵەتانە وەربگرێ دژی ڕوسیا. بەرامبەر ئەوەی کە ئینگلتەرا لایەنگیریی عوسمانی کردبوو لەم بارەیەوە دەوڵەتی عوسمانی دوورگەی قوبرسی بۆ بەکرێگرت کە بیکاتە بنکەی خۆی. ڕوسیا مەترسیی لەوە هەبوو نەخۆ ئینگلتەرا بچێتە پاڵ دەوڵەتی عوسمانیەوە بۆیە رووی لەوە وەرگێڕا، کە دژی عوسمانیەکان بجەنگێت. ئیتر سوڵتان عبدالحمید توانیی پەیماننامەی (ئەیاستفانۆس) لەکار بخات و هەوڵی بەستنی کۆنگرەیەکی دا لە بەرلین بۆ باسکردنی پەیوەندییەکانی عوسمانی- ڕوسی و ئەمەی لێکەوتەوە کە پەیماننامەیەك لەم ڕووەوە لە (٣)ی یۆلیۆی ١٨٧٨ مۆر بکرێ کە زیانەکانی پەیماننامەی یەکەم سووك بکاتەوە.

لەماوەی سی(٣٠) ساڵ فەرمانڕەوایی سوڵتان عبدالحمید، دوای ئەوەی ئەنجومەنی نوێنەرانی لەکار خست توانیی جەنگ لەنێوان وڵاتەکەی و ڕوسیا قەدەغە بکات. هەر کە ڕوسیا نەیتوانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ ناو جەنگ کێش بکات، ئنجا جەختی لەسەر جەنگی سارد کرد، دوای ئەمە گەلێ کێشەی تر لەبەردەم دەوڵەتی عوسمانی پەیدا بوو.

* * *

جەنگی عوسمانی و ڕوسی گەلێ ئەنجامی مایەیی و سامانی و کۆمەڵایەتیی لێکەوتەوە، کە ئەرکی سەرشانی دەوڵەتی قورسکرد لە پێشەکیی ئەم ئەنجامانەش کێشەی کۆچکەران بوو.

ئەو کۆچەرانەی کە لە ناوچەکانی جەنگەوە بەرەو ئەنادۆڵ هاتن چڕییەکی دانیشتوانیی وایان پێکهێنا، کە لە توانای ولاّت زۆرتر بوو. ڕووداوەکانی (جبل الاسود) و ولاّتی (سیرب) و (ڕۆمانیا) بوونە هۆی سەربەخۆبوونیان و ڕوسیا دەستی بەسەر (قارس) و (باتۆم) و (ئەردەخان)دا گرت و (نەمسا)ش بەسەر (بۆسنە) و (هەرسك)دا. گەلیّ لە موسڵمانەکانی ئەو ناوچانە کۆچیان بۆ ناوچەکانی تری دەوڵەت کرد و لێی نیشتەجیّ بوون.

بەچاویّ سەیری ئەو کۆچەرانە دەکرا کە کۆچەری ناوخۆیین سەرەڕای هەندیّ سوودی ئەو کۆچکردنە، قورساییەکی ئابووری و ماڵیی خستبووە سەر دەوڵەت.[1]

## = یاخیبوونی دیانەکان لە دوورگەی کریتدا:

دوورگەی کریت-کە بەشێکە لە دەوڵەت- کۆنگرەی ڕوداوەکان بوو و هەمیشە یاخیبوونی ئاینی و نەتەوەیی لیّ هەڵدەقوڵا و ڕوسیەکانیش ئاگرەکەیان خۆشدەکرد. لەکاتی جەنگی عوسمانی و ڕوسی ۱۸۷۷-۱۸۷۸ دووبارە کریتی و ئەروامەکان لە دەوڵەت یاخیبوونەوە و داوایانکرد کە دوورگەکە بە (یۆنان) بلکێنرێتەوە وەك بەشێك لە پەیدابوونەوەی دەوڵەتی بیزەنتی، جا پشێوی لە دوورگەکەدا بەردەوام بوو تا جەنگی بەلقان ساڵی ۱۹۱۲ع دوای لادانی سوڵتان عبدالحمید هەر کە دوورگەی کریت خرایە سەر یۆنان.

## = یاخیبوونی ئەرمەن لە پێناو جوێبوونەوە لە دەوڵەت:

هەر لەو کاتەوەی کە عوسمانیەکان قوستەنتینیەیان فەتح کرد پەیوەندیی ئەرمەن لەگەڵ عوسمانیەکان چاکبوو، تا ئەو کاتەی کە ڕوسیا هانی دان لەسەر شۆڕشکردن و ئەوانیش کردیان. چەتە ئەرمەنیەکان هێرشیان دەکردە سەر گوندی تورك و کوردەکان لە ڕۆژهەلاّتی ئەنادۆڵ و خەڵکەکەیان دەکوشت. هێزەکانی عوسمانی لێیان هاتنە دەست و بەتوندی ئاسایشیان بۆ ئەم ناوچەیە گێڕایەوە. لەو کاتەوە نازناوی سوڵتانی سوور بە عبدالحمیدەوە لکێنراوە، چونکە فەرمانی بەهێزەکانی کرد کە یاخیبوونەکە لەناو ببەن و

---

۱ بنوارە قارال، سەرچاوەی پێشوو.

نەهێڵن ئەرمەنەکان، موسڵمانەکان بکوژن. نووسەرێکی تورکیی هاوچەرخ دەڵێ: "ئەگەر سوڵتان عبدالحمید ئەم تەگبیرانەی نەکردبایە ئەمڕۆ هیچێکمان لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتی وڵات نەدەمایین.".

گەورەترین یاخیبوونی ئەرمەنەکان لە ساڵی ١٨٩٥ع بوو، کە ژمارەیەکی زۆریان لێکوژرا، بە رادەیێ دەوڵەتە ئەورووپییەکان لێی بەدەنگ هاتن، بەڵام سوڵتان عبدالحمید توانیی دوژمنایەتیی بخاتە نێوان بەریتانیا و فەڕەنسا، بۆیە بەریتانیا خۆی لە دەست تێوەردانی چەکداری کێشایەوە هەرچەندە هانی یاخیبووەکانی دەدا.

لە ساڵی ١٨٩٦ ئەرمەنەکان لە پایتەختی عوسمانی یاخی بوون، بەڵام سوڵتان دەستی بەسەریان داگرت و لەوە بەدواوە ئەرمەنەکان زاتی یاخیبوونیان نەکرد.

ئەرمەنەکان ویستیان بەهۆی قونبەلەیەکی کاتی سوڵتان عبدالحمید بکوژن لەوکاتەی کە لە نوێژی هەینی دێتە دەرەوە، بەڵام سوڵتان لەم پیلانە رزگاری بوو لە ساڵی ١٩٠٥.

## = گرتنی تونس لەلایەن فەڕەنساوە:

فەڕەنسا لەکاتی مۆرکردنی پەیماننامەی (بەرلین) نەخشەی داگیرکردنی تونسی دا دەنا لە ساڵی ١٨٧٨، لە ساڵی ١٨٨١ سوپایەکەی هەنارد بۆ داگیرکردنی تونس، دەوڵەتی عوسمانی بە توندی نارەزایی دەربڕی، بەڵام لەو کاتەدا لە بارودۆزروفێکی وابوو، کە نەیدەتوانی بەرگری لە تونس بکات.

## = داگیرکردنی میسر لەلایەن ئینگلتەراوە:

دەست بڵاویی خدێوی ئیسماعیل بووە هۆی تێکدانی بودجەی میسری، هەروەها وامداری[1] ئینگلتەرا بوو بە بڕیی ملیۆنێك جنێهی ئینگلیزی ئەمەش لەکاتی خۆی زۆر بوو، خدێوی ئیسماعیل لە ساڵی ١٨٧٥ پشکە تایبەتیەکانی خۆی لە کۆمپانیای کەناڵی سوێس فرۆشتە ئینگلتەرا و بەشی نەکرد. لە ساڵی ١٨٧٩ سوڵتان عبدالحمید والیەکەی خۆی لەسەر میسر (خدیوی ئیسماعیل پاشا) لادا و کوڕەکەی خۆی (محمد توفیق پاشا)ی لە شوێنی دانا. (محمد توفیق پاشا) نەیتوانی میسر لەو بارە رزگار بکا

١ وامدار: قەرزار.

کە تێی کەوتبوو، ئینگلتەرا و فەڕەنسا بە بەردەوامی دەستیان لە کاروباری وەردەدا. لە (١١)ی یۆنیـۆی ١٨٨٢ دانیشـتوانی شـاری ئەسـکەندەریە لـە میسـر شۆڕشـێکی توندوتیژیان لەسـەر ئەورووپیـەکان کـرد وماڵیـان تـاڵان کـردن و هـەندێکیان کوشـتن. ئینگلتەرا ئەمەی کردە بیانووی لێدانی ئەسکەندەریە، ئنجـا دەسـتی بەسـەر قاهـیرە و هەموو میسردا گرت، بەڵام ئینگلتەرا میسری بە بەشـێك لـە خـۆی نـەدەزانی، بـەڵکو گوتی: میسر پارچەیەکە لە دەوڵەتی عوسمانی و میسر ڕەمزی سـەر بـەعوسمانی بوونـی جێبەجێ دەکرد.

ئەم باروزروفە تا ساڵی ١٩١٤ بەردەوام بوو، هـەر کـە بـەریتانیا پارێزگـاریی خـۆی لەسەر میسر ڕاگەیاند.[١]

## = پێڕەوی بیرکردنەوە لە کارگێڕیی دەوڵەتدا:

سوڵتان عبدالحمید پەرلەمانی عوسمانیی بـەناوی ئەنجومـەنی نوێنـەران بـۆ کـاتێکی نادیار لەکارخست لەساڵی ١٨٧٨ع دوای ئەوەی هەستی بەوەکرد، کە توێژی ڕۆشنبیر لە وەزیر و لێپرسراوانی دەوروبەری بە پێچەوانەی بۆچوونی ئەو بیردەکەنـەوە. لـەم سـاڵەدا سوڵتان عبدالحمید بە تاکڕەویی فەرمانڕەوایی وڵاتی دەکرد و سی(٣٠) ساڵ لەسەر ئەمە بەردەوام بوو. دەوڵـەت جگـە لـە میسـر و تونـس خـاکێکی وا گـران بـەهای لـەکیس نەچووبوو، سەرەڕای ئەو کزییەی کە بەسەر دەوڵەتەوە دیاربوو، سوڵتان هەوڵی پاراستنی خاکی وڵاتی دەدا.

بەڵام قوتابیی ئـەو قوتابخانانـەی کـە سـوڵتان عبدالحمیـد کردبوونیـەوە بـۆ ئـەوەی ڕۆڵەکانی دەوڵەت تیایـاندا فـێری زانسـت و زانیـاری بـن و ئـەو قوتابیانـەی، کـە لـە دەرەوەیان دەخوێند هزری نەتەوەیی و فەلسەفەی ئەورووپی کاریگەریی بەسەریاندا هەبوو، ئەم قوتابیانە ڕۆڵێکی گەورەیان بینی لە ڕووخـانی دەوڵـەتدا، سـوڵتان عبدالحمیـد ئـەو ڕەمزە بوو، کە هەموو لەسەر لێدانی کۆبوونەوە.

ئەمانە ڕێکخراوێکی نهێنیان پێکهێنا بەناوی (کۆمەڵـەی یـەکێتی و پێشـکەوتن)،

---

١ بەگشـتیی لـەبارەی یـاخیبوونی کریـت بنـوارە (نـها صابـار)، کێشـە ماڵییـەکانی سـەردەمی ئیمبراتۆریەتی تورکیا، ل٢٢٤-٢٣٤، ئەستەنبوڵ ١٩٧٧.

دەستیان لەگەڵ ئەوروپیەکان تێکەڵ کرد لــەپێناو ڕووخـانی سـوڵتانەکەیان و خەلیفـەی موسڵمانان. لە پاریس ئەمانە کە دژی سولتان بوون و ئەندامی کۆمەڵەی (ترکیا الفتاة) بوون لەگەڵ سەرۆکەکانی ئەرمەنیە یاخیبووەکان یەکیان گرت دژی دەوڵــەتی عوسمـانی. ئەندامەکانی (اتحاد والترقی) توانییـان بانگەشـەیەکی فـراوان لـەناو ریزەکـانی سـوپادا بڵاوبکەنـەوە تـا ئەفسـەرە گەنجـەکانی سـوپای عوسمـانی لـە بـەلقان بوونـــە گروپـــی (اتحادی)یەکان لەساڵی ۱۹۰۸ع.

دواسەرۆکەکانی ئەم کۆمەڵەیە نوسەری پۆستە و بروسك (طلعت) بوو لــە ئەدەرنـە و بەگباشی (انور) و یوزباشی (نیازی) بـــوون، ئەمانــە لــەو بـاوەڕە بـوون ئەگـەر بتوانـن عبدالحمید لەسەر عەرش دابەزێنن، ئـەوا فشـاری ئـەوروپا لەســەر دەوڵـەت نامێنــێ و هەموو کار و بارێك لە دەوڵەت چاك دەبێت و ئەو رەگەزانەی، کە لـــە دەوڵـەتدا دەژیــن ئەوا زێتر بە کۆمەڵەکەوە پەیوەنددار دەبن، بۆیە ئـەندامانی (اتحـاد وترقـی) یارمــەتیی نوێنەرانی نەتەوە و ئاینە جیاوازیەکانیان دا بۆ ڕووخاندنی سولتان عبدالحمید.

بزوتنەوەی یەکێتی و پێشکەوتن(اتحاد والترقی) بـــە یـاخیبوونی (نیـازی)ی ئەفســەر دەستی پێکرد. کە سەرۆکی یەکەیەکی پیادەی سەربازی بوو و بەیانێکی دەرکرد و تێیدا داوای کرد کە دوبارە کار بە دیموکراتی بکرێتەوە. هــەر کــە (شمســی پاشـا)ی ســەرکردە ناردرا بــۆ کوژاندنــەوەی ئــەم بزوتنەوەیــە، شۆڕشــگێڕان لــە شـاری (مناسـتر) بــە دزی کوشتیان، لە بریتی ئەو (فوزی پاشا) هات بەڵام شۆڕشگێڕە (اتحادی)یــەکان فڕاندیـان و دوایی چەند گولله تۆپێکیان هاویشت کە نیشــانەی گەڕانــەوەی دەســتوور و کردنــەوەی ئەنجومەنی (المبعوثان) بوو، بەجۆرە سوڵتان عبدالحمید ناچارکرا، کە رەزامەندی دەربــڕێ لەسەر ئەوەی کە لەساڵی ۱۹۰۸ع داواکرابوو.

لەدوای ئەم روداوە (اتحادی)یەکان بە ئەفسەر و شارسـتانی(مدنــی)یـەوە کاروباریـان گرتە دەست و ناوی لێنرا (المشروطیة الثانیة)، پیاوانی (اتحــاد والـترقی) بــە شـێوازێکی دیکتاتۆری فەرمانڕەوایی وڵاتیان دەکرد، کار گەیشتە ئەوەی کە بەرهەڵستکارانی خۆیان دەکوشت.

(اتحادی)یەکان بەهێزی چەك لەو هەڵبژاردنەی لە وڵات کردیان ســـەرکەوتن و ئــەوەی

ویستیان بوو، ئەنجومـــەنی (المبعوثان) لـە ٢٣ی (ذي قعـدة)ی ١٣٢٦ك-١٧ی کـانونی یەکەمی ١٩٠٨ع کرایەوە و بـــەم شـێوەیە پێکـهاتبوو: ژمـارەی ئەندامـەکانی (٢٧٥) نوێنەری پەرلەمانی بوو، لەوانە (١٤٢) تورکی و (٦٠) عەرەبی و (٢٥) ئەلبانی و(٢٣) یۆنانی) و (١٢) ئەرمەنی و (٥٠) جولەکە و (٤) بولگار و یەك رۆمانی.

(اتحادی)یەکان لێبوردنێکی گشتیان دەرکـــرد بـۆ هـەزارەها لـە جـەردە بولگـاری و ئەرمەنیەکان. ئەمانە سەر لەنوێ دەستیان بە چالاکیی خۆیان کردەوە، بەڵام ئەمجارە دژی کۆمەڵەی (اتحاد والترقي)، ئەرمەنییەکان لە ناوچـەی (آضنـة) یـاخیبوونێکی گـەورەیان ئەنجام دا و ماڵی موسڵمانە عوسمانیەکانیان تاڵان کرد و زۆریان لیْ کوشتن.

لەدوای ئەمە کۆمەڵەی هاونیشتمانیەکان لەوێ و لەشـاری (طرسـوس) دژی ئەرمــەن کەوتنە جووڵە و (١٧) هەزار ئەرمەنییان کوشت و ئەم پشێویە چوار رۆژی خایاند و لـــە عوسمانیەکانیش (٢٠٠٠) دوو هەزار کوژران.

## = رووداوی ٣١ی ئادار (١٣ی نیسانی ١٩٠٩ع):

پێش یاخیبوونی ئەرمەن لە (آضنة) بەرۆژێك لە ئەستەنبول رووداوێـــك روویـدا نـاوی لێنرا رووداوی ٣١ی ئادار کە دەکاتە ١٣/٤/١٩٠٩ع.

زۆربەی مێژوونووس و پیاوانی فەرمانڕەوا دەڵێـن: ئـەم ڕووداوە نواندنێکـی رامیـاری بوو، کە کۆمەڵەی (اتحاد والترقي) ئەنجامیان دا کە خۆیان لە حوکم بـون بـۆ ڕووخـاندنی سوڵتان عبـدالحمید و بەیەکجاری ڕزگاربوون لە شێوازی حوکمەکەی. لەوانەی ئەمە دەڵێن شێخی ئیســلام (جمـال الدیــن ئەفــەندي) و هــەروەها دوای رووداوەکــە (طلعـت پاشـا)ی سەرۆکی (اتحادی)یەکان. هەندێکیش دەڵێن سەهیۆنیزم-کە زۆر کاریگەریی بەسەر پارتی اتحاد والترقي هەبوو- وای لــە حـیزب کـرد کـە ئـەم ڕووداوە ئـەنجام بـدات بـۆ لابردنـی عبدالحمید تاکو جولەکە بتوانن دەوڵەتی خۆیان لە فەلەستین دابمەزرێنن.

ڕووداوەکە بریتی بوو لەوەی کە هەندێ لە سەربازەکان چەند ئەفسەرێکی گەنجی خۆیان کوشـت بـە بیـانووی ئـەوەی، کـە ئـەم ئەفسـەرانە هـەڵس وکـەوتیان دژی ئیسـلامە، ســەربازەکان بانگـەوازی جێبـــەجێکردنی شـــەریعەتی ئیســـلامی و دوورخســـتنەوەی ئەفسەرەکانی (اتحاد والترقي)یان کرد لە حوکم.

ئەندامانی (اتحاد والترقی) لەو بـاوەڕە بـوون کـە سـوڵتان عبدالحمیـد دەسـتی لـەو ڕووداوەدا هەبووە، بۆیە هێزەکانیان لە سلانیکەوە بۆ ئەستانبول نارد و ئەم سوپایە بەناو: سـوپای بزوتنـەوە(الحرکـة) بـوو، کـە لـە هـێزی یاسـایی و میلیشـیا و پیـاوە جـەردە چەکدارەکانی بولگاریـا و سـیرب و یۆنانیـەکان پێکـهاتبوو، ئەمانـە پاڵپشـتی (اتحـاد والترقی)یان دەکرد، کە بانگەشەی نەتەوایەتی و یەکسانیی دەکرد.

سوپای (الحرکة) بە سەرکردایەتیی (محمود شوکت پاشا) لـە سـلانیکەوە دەسـتی بـە بزووتنەوە کرد و بڵاوکراوەیەکی بڵاوکردەوە و تێیدا دەڵێت: ((بۆ ئەستەنبوڵ هـاتووە تـا سوڵتان لە دەستی یاخیبووەکان رزگار بکات..)) هەروەها ئەم سـەرکردەیە لـە وەڵامـی بروسکەیەکی (شریف حسێن) شەریفی مەککەدا گوتی: ((ئێمە هاتووینەتـە ئەسـتەنبوڵ بۆ پارێزگاریکردنی سوڵتانی خەلیفەی موسڵمانان))، (محمود شوکت پاشا) دوو ئەفسەری گەنجی هەبوو کە کۆڵەگەی جەنگەکە بوون، ئەو دوانەش (عزیز المصری، مستەفا کمـال-ئەتاتۆرك) بوون.

## = لەناوبردنی سوڵتان عبدالحمید:

هەرکە سوپای (الحرکة) گەیشت، سـەرکردەکانی سـوپای یەکـەمی یاسـایی کـە لـە ئەستەنبوڵ بوون داوای مۆڵەتدانی جەنگیان لە سوڵتان کرد، سـوڵتان عبدالحمیـد لەبـەر خوێن ڕژران ئەمەی ڕەتکردەوە. لە ٢٥ی نیسان (محمود شـوکت پاشـا) لـە پایتـەخت دا خۆی دەسەڵاتدار بوو.

ئەنجومەنی (المبعوثان) کۆبوویەوە و بڕیـاری لادانـی سـوڵتانی دا، (اتحـاد والـترقی) نەیتوانی فتوایەکی شەرعی بەدەسـت بێنـێ بـۆ لادانـی سـوڵتان تـەنیا بـەزۆر نـەبێت، بڕیارەکەیان گەیاندە سوڵتان لەڕێگەی شاندێکەوە بە سەرۆکایەتی (ایمـانۆئیل قراصـو)ی جولەکەی عوسمانی، کە ئەندامی ئەنجومەنی (المبعوثان) و سەرۆکی کۆمەڵـەی ماسـۆنی بوو لە سلانیکدا.

## = کۆتایی سوڵتان عبدالحمید:

اتحادیـیەکان سوڵتان و خاووخێزان و هەندێ لە خزمەتکارەکانیان نارده سـلانیك لـەو شەوەی کە لادرا و نەیانهێشت هیچ لەگەڵ خـۆی ببـات، پیـاوە اتحادیـیـەکان و جـەردە

مەقدۆنیەکان کۆشکی سوڵتانیان تاڵان کرد.

لە سلانیك سوڵتان و ئەوانەی لەگەڵی بوون لە کۆشکی (ئالاتینی) کە کۆشکی یەکێ لە جولەکەکان بوو بەناوی خۆیەوە نرابوو، حیجز کران و خرانە ژێر چاودێرییەوە.

سوڵتان لەو کۆشکەدا رۆژانێکی زۆر دژواری بەسەر برد و لە خوێندنەوەی رۆژنامەکان قەدەغەیان کرد. هەر لەو کۆشکە مایەوە تا ئەو شەوەی کە جەنگی بەلقان دەستی پێکرد و سوڵتانیان هێنایە ئەستەنبوڵ و لە کۆشکی (بەی‌لەربەی) بەندیان کرد و هەر لەوێ لە رۆژی یەکشەممەی ٢٨ی رەبیعی کۆتایی ١٣٣٦ك بەرامبەر ١٠ی شوباتی ١٩١٨ع لە تەمەنی ٧٦ ساڵی تۆزێ کەمتر مرد. هەشت ساڵ و نۆ مانگ و سێزدە رۆژ بە گۆشەنشینی ژیا و سی و دوو ساڵ و حەفت مانگ و بیست و حەفت رۆژ فەرمانڕەوایی کرد.[1]

---

١ لەبارەی گەشەکردنێکی کورتی سادەی بزوتنەوەی (اتحاد وترقی) و هەڵوێستی لە سوڵتان عبدالحمید، بنوارە: محمد ئاجیق کوز اوغلو، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧٧-٣٨١. بەلام (قارال و أورطونە) بەدرێژی باسی ئەمە دەکەن.

# پاری سێیەم

# ئەو هۆكارانەی كە كەسێتی سوڵتان عبدالحمید و پێڕەوی بیركردنەوەی پێكهێنا

## ١/ بارودۆخی وڵاتەكەی:

### = تێكچوونی بارودۆخی ماڵی و قەرز زۆری:

هەركە سوڵتان عبدالحمید هاتە سەر عەرش بینیی، كەم و كوڕیی بودجەی دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی ١٨٧٥ گەیشتۆتە پێنج ملیۆن لیرەی عوسمانی و نرخی سوودی قەرزەكانی دەوڵەت ١٤ ملیۆنە. بەڵام قەرزەكانی دەوڵەت گەیشتۆتە (٣٠٠) ملیۆن لیرە و دەوڵەت ناچار بوو سەرلەنوێ قەرزی تر بكات بۆ دانەوەی قەرزەكانی.

بەرامبەر بەم پشێویە سوڵتان ناچار بوو، كە چەند تەگبیرێكی مالیی توندوتیژ پەیڕەو بكات، سەرەتا لەخۆی و لە كۆشكی سوڵتانییەوە دەستی پێكرد، كەسێتیی یارمەتیی جێبەجێكردنی دا، چونكە خۆی مكوڕ بوو لەسەری و دووربین بوو و دەست بڵاو نەبوو.[١]

"سوڵتان دەوڵەتێكی موفلیسی (گیرفان بەتاڵی) وەرگرت، بەڵام توانیی بە ئاشكرا قەرزەكانی كەم بكاتەوە و سنورێ بۆ دەستبڵاوی دابنێ.".

سوڵتان دەست بڵاوی نەدەزانی، ئەمەش هەستی بوو نەك تەنیا هەڵس وكەوتی، هەولیدا دەستبڵاوی لە دەوڵەت كەم كاتەوە، بۆ ئەم مەبەستە هەڵمەتێكی لە دەوڵەت و لە كۆشكی سوڵتانی دەست پێكرد، بۆ نمونە: پێش ئەوەی عبدالحمید بێتە سەر عەرش، نەریت وابوو كە رۆژی سێ جاران خواردن لە ناندینی سوڵتانەوە بۆ ماڵی هەموو پاسەوان و فەرمانبەری كۆشك و خزمەتكار و هەموو ئەوانەی لەگەڵ سوڵتان بوون بنێردرێ،

---

١ صابار، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٩.

سوڵتان فەرمانی لادانی ئەم نەریتەی دا و قەدەغەی کرد خواردن بە خۆڕایی لە نـانەدینی سوڵتانەوە دەربچێت و فەرمانی دا کە سـوڵتان بەتـەنیا نـان نـەخوات و بـەڵکو لەگـەڵ خێزانەکەی لەسەر یەك سفرە بێ و دەست بڵاوی لە جۆر و چەندێتی خواردن نەکرێت.

لەگەڵ ئەمەش هەندێ لە لێپرسراوان داوایان لە سوڵتان کرد کە پێویستە نرخـی نـان گران بکرێت، چونکە دەوڵەت توانـای دانـی ئـەو جیاوازیـەی نیـە کـە لـەنێوان نرخـی راستەقینە و نرخی فرۆشتنی نان هەیـە، سـوڵتان ئەمـەی رەدکـردەوە و لـە گەنجینـەی تایبەتیی خۆی ئەم جیاوازیەی دابین کرد.[1]

دەوڵەت توانای نەبوو ئەو کۆچکردووە موسڵمانانە نیشتەجێ بکات، کە ئەوروپیەکان لە بەلقان دەریان کردبوون، سوڵتان لە ماڵی تایبەتیی خۆی خانو و مزگەفتی بۆ دروست کـردن و خسـتنیە سـەر کـار و بـەخێرهێنانیکی گـەرمی لێکـردن و خـۆی شـوێنی نیشتەجێبوونیانی هەڵدەبژارد. سیاسەتی بەرامبەریان ئـەوەبوو کـە دەبـێ سـوودمەند و سوودبەخش بن. لەسەر داوای سوڵتان عبدالحمید بوو کـە شـاری عـەمان لـە ئـوردن بـۆ کۆچەرە چەرکەسیەکان بنیات نرا، ئەوانەی کە ڕوسیا لە شوێنی خۆیان دەریانی کردبـوو، چەرکەسیەکان سودیان لەو شوێنە وەرگـرت و لێـی نیشـتەجێ بـوون و پـەرەیان پێـدا و شوێنەکەش سوودی لێیان وەرگرت. سوڵتان لەچوار پەڕگەی وڵات چەند شوێنی حەوانەوە و چەند گوندێکی بۆ کۆچکەران بنیات نـاو بژێویـی تێـدا دابـین کـرد بـە تایبـەتی لـە (ئەستەنبوڵ) و (سیواس) تا (حەلەب). هەموو خـەرجی و سـووتەمەنی و دەرمـانی بـۆ ئەوانە دابین کردبوو کە بەهۆی جەنگی (٩٣)ی نێوان عوسمانی و ڕوسیا دەربەدەر بووبون.

سوڵتان چەند هەنگاوێکی پتەو و توندوتیـژی نـا بـۆ دانـەوەی وامـەکان، لەوانـەش پشکەکانی رەمەزان چونکە لە مانگی رەمەزان دەرچـوو بـوو بـەنیازی دانـەوەی وامـە کەڵەك کراوەکان. لە ئەنجامی هەموو ئەم هەنگاوانە وامی دەوڵەتی عوسمانی لـە (٣٠٠) ملیۆن لیرەوە بووە (٣٠) ملیۆن، واتە دەیەك.

سەیر لەوەدایە ئەو (اتحادی)یانەی کە عبدالحمیدیان لەسەر حوکم لادا و خۆیان بوونـە فەرمانڕەوا لەو ماوە کەمەی کە حوکمیان کرد و هەشت ساڵ بوو بڕیی وامی دەوڵەت بۆ

١ موفتی ئۆغلوو، ل٢٠١-٢٠٣.

٤٠٠ ملیۆن لیرە بەرز بوویەوە.[١]

## = ناخۆشیی باری رامیاری و ناڵەباری باری سەربازی:

ساڵی هاتنە سەر حوکمی سوڵتان عبدالحمید لە ١٨٧٦ع خاڵی وەرچەرخانی راستەقینە بوو لە مێژووی عوسمانیەکاندا: چەند رووداوێکی سەیر، لادانی سوڵتان عبدالعزیز و مردنی لە باروزروفێکی تەماوی و بە رێگەیەکی سەیر، لایان دا و بەندیان کرد و گوتیان خۆی کوشتوە، بەڵام دوایی لێکۆڵینەوەکان سەلماندیان کە عوسمانیە نوێیەکان کوشتوویانە. هاتنی سوڵتان مورادی پێنجەم بۆ سەر عەرش، ئەو شۆڕشگێڕانەی کە مامی مرادیان (عبدالعزیز) لەناو برد ناچار بوون فتوایێ دەربکەن کە مراد شێتە و دوای ئەوەی سێ مانگ لەسەر حوکم بوو لایان دا. ویلایەتە عوسمانیەکانی بەلقان لە پشێوی و یاخیبووندا بوون و دەستی دەرەکی لەکار وبار وەردەدرا. جەنگ دژی روسیا نزیك دەبێتەوە و هیچ هۆکارێ ناتوانێ قەدەغەی بکات، بە تایبەتی کە وەزیرە شۆڕشگێڕەکان زۆر بۆ ئەم جەنگە بە پەرۆش بوون. شوێنی ستراتیژیی دەوڵەتی عوسمانی والآیە بۆ دەست تێوەردانە دەرەکیەکان و هیچ بیرۆکەیێ لە ئارادا نیە، کە هەموو گەلانی عوسمانی لەسەر یەك شت کۆبکاتەوە. دەرچوونی دەوڵەت لە چەند جەنگێك و سەرکوتکردنی چەند یاخیبوونێك لەلایەن دەوڵەتەوە.

هەموو ئەمانە لەرووی ماڵی و سەربازییەوە هێزی دەوڵەتیان لەکار برد و هەڵوێستی رامیارییان بێبار کرد.

سوڵتان عبدالحمیدی دووەم وای زانی کە (مشروطية) بە واتای حوکمی نوێنەرایەتییە و ئەمەش لەگەڵ باروزروفی دەوڵەتی عوسمانی ناگونجێ و قەناعەتی بەم بۆچوونە هەبوو. بەڵام بینی کە ئەو شۆڕشگێڕانەی مام و برایەکەیان لادابوو سوڵتان ناچار دەکەن کە حوکمی نوێنەرایەتی رابگەیەنێ. بۆیە لە ٢٣ی کانوونی یەکەمی ١٨٧٦ بە ناچاری حوکمی نوێنەرایەتی راگەیاند و یەکەم ئەنجومەنی نوێنەرایەتیی عوسمانی کرایەوە کە ئەنجومەنی (المبعوثان)ە و فشاری خرایە سەر کە جەنگ دژی روسیا رابگەیەنێت. لەم

١ یاداشتەکانی سوڵتان عبدالحمید، ١٩٨٥، ٣٣٧، ١٩٧٨ هەروەها شایەتی وەرگرتن لە چاپی یەکەم ١٩٧٨، بە (یاداشتەکان) ئاماژەی پێ دەکرێ.

جەنگەدا دەوڵەت دۆڕاندی-وێڕای ئەوەی کە سوپا زۆر پاڵەوانێتی نواند لــە شــارۆچکەی بلاونە- و گەلێ لە شارە گرنگەکان کەوتنە دەست ڕوسیا تا گەیشتنە ئەستەنبوڵ.

بەرامبەر ئەم هەموو مەترسیە مولکیە و (مدنی) ســەربازییە ســوڵتان بینیــی، کــە شۆڕشگێڕان و ئەنجومەنی (المبعوثان) دەوڵەتیان تووشــی ئــەو کارەســاتانە کــردووە کــە دەتوانرا تووشیان نەبن. لەبەر ئەوە سوڵتان عبدالحمیدی دووەم دوای دوو ساڵ لــە هاتنــە سەر عەرشی (ارادە سنیە) و بڕیارێکی دەوڵەتیی ڕاگەیاند کە ئەنجومەنی (المبعوثان) بــۆ ماوەیەکی دیار نەکراو کاری پێ نەکرێ و لەکار بخرێ، ئەمەش لە ١٣ی شــوباتی ١٨٧٨ بوو، بەڵام دەستووری هێشتەوە.

ئنجا سوڵتان عبدالحمیدی دووەم ڕێشمەی حوکم و فەرمانڕەوایی وڵاتــی بــە هــەردوو دەستان گرت و سی ساڵ و نیو لە حوکمی تاکەکەسی بەردەوام بوو.

## ٢/ گەشتەکەی بۆ میسر و ئەوروپا:

هەر کە سوڵتان عبدالعزیز لە ساڵی ١٨٦٣ سەرۆکایەتیی شاندێکی عوســمانیی کــرد بۆ میسر ئەمیر عبدالحمیدیشی-کە دوایی بووە سوڵتان- لەگەڵ بوو، ئەمــەش دووەمــین سەردانی سوڵتانە عوسمانیەکان بوو بۆ میسر، چونکە پێش ٣٤٥ ساڵ ســوڵتان ســەلیمی یەکەم چووبووە میسر.

میسر کە لــە ڕووکەشــێکی درۆزنانــە و بریــق و بــاقێکی ئــەورووپی دابــوو ســەرنجی عبدالحمیدی ڕاکێشا، تا وایلێهات میسر لە وامکردندا بەرەو خنکان دەچوو لە ئەنجامی هەڵس وکەوتی خدێوی ئیسماعیل کە دەستی بە دەستبڵاوی کردبوو و هەوڵی دەدا میسر بکاتە پارچەیەك لە ئەوروپا، لە کاتێکدا کە میسر و وڵاتی ئیسلامی زۆر پێویستیان بــە بگری(الاقتصاد) هەبوو لە خەرجیەکاندا.

هەرکــە فەڕەنســا پێشــانگای نێودەوڵــەتیی لــە پــاریس دانــا و نــاپلیۆنی ســێیەمی ئیمــپراتۆری فەڕەنســا گــەلێ لــە دەســەڵاتدارانی دەعــوەت کردبــوو لەوانــەش ســوڵتان عبدالعزیز کە عبدالحمیدی لەگەڵ بوو، ئەم گەشتە لــە ٢١ی یۆنیــۆ تــا ٧ی ئۆگستۆســی ساڵی ١٨٦٧ خایاند. لەم گەشتەدا شاندی عوسمانی ســەردانی فەڕەنســا و ئینگلتــەرا و بەلجیکا و دەوڵەتی نەمســاوی-مەجــەڕیی کــرد. عبدالحمیــد لــەم گەشــتە ئەورووپیــەیدا

مێشکی لە زۆر شت کرایــەوە و ڕەنگدانــەوەی هــەبوو لــە مــاوەی فەرمانڕەواییەکـەی. شتەکانیش ئەمانەی خوارەوەن:

+ ژیانی ئەوروپی بە هەموو هەڵس وکەوتە سەیر وسەمەرەکانیەوە و ئاکارە جیاواز و روکارەکانیەوە.

+ پەرەسەندنی پیشەسازی و سەربازی بە تایبەتی لە هــێزی وشـکانیی فەڕەنســی و ئەڵمانی و هێزی دەریایی بەریتانی.

+ فرتوفێڵەکانی سیاسەتی جیهانی.

+ کاریگەریی هێزەکانی ئەوروپی لەسەر سیاسەتی دەوڵەتی عوسمـانی، بـە تایبــەتی کاریگەریی ناپلیۆنی سێیەم لەسەر سوڵتان عبدالعزیزی مامی و فشاری ناپلیۆن لەسەری بۆ ئەوەی پابەند بــێ بــە پشــتگیریکردنی (عــالی پاشــا)ی وەزیــر. هەرچــەندە ســوڵتان عبدالعزیز نەیدەهێشت کەس هەست بەوە بکـا کـە لـەژێر کـارتێکردنی هیــچ هــێزێکی ڕۆژئاواییدایە.[1]

لەم گەشتەدا چەند شتێ لە مێشکی عبدالحمیــد چـەقی، لەوانـە فەڕەنسـا دەوڵـەتی رابواردنە و ئینگلتەرا دەوڵەتی سامان و کشــت وکـاڵ و پیشەســازییە، بـەڵام ئـەڵمانیا دەوڵەتی یاسا و سەربازی و کارگێڕییە. زۆر بە ئەڵمانیا کاریگەر بوو، بۆیە هەر کە بووە سوڵتان مەشقکردنی سوپای عوسمــانیی بـە ئەفســەرە ئەڵمانیـەکان راسـپارد، هــەروەها عبدالحمید لای سەیر بوو کە لەو ماوەیەی لە ئەڵمانیا میوان بــوو، ئەوانــەی خزمــەتیان دەکرد لە کۆشکەکە پیاو بوون و تاکە ژنێکیان تێدا نەبوو.

کاریگەربوونی بە پێشکەوتنی زانستی و تەکنیکی ئەوروپی هانی دا بــۆ ئـەوەی لــە کاتی فەرمانڕەواییەکەی گەلێ لە داهێنانە نوێیەکان بخاتــە نێــو دەوڵــەتی عوسمانییــەوە لەلایەنــە هەمــەجۆرەکانی ژیــان: فـێرکردن و پیشەســازی و هۆکارەکـانی پــەیوەندی و سەربازی، نموونەش بۆ ئەمە زۆرە، لەوانە دوو کەشتیی ژێرئــاوی کـڕی کـە چەکـەکانیان تازە بوون، لە سامانی خۆی تەلەگرافی هێنایە وڵاتەوە و قوتابخانەی تازەی بنیــات نـا و زانستی هاوچەرخی خستە ناوی و یەکەم ئۆتۆمبێل و یەکــەم مــاتۆڕی هێنــا وڵاتــەوە و

---

١ یاداشتەکان ل٢٥.

یاسای پێوانی مەتریی بەکارهێنا، بەڵام زۆر بە توندی بەربەستی بیری ڕۆژئاوایی کرد نەخۆ بخزێتە دەوڵەتەوە.

* * *

گەشتەکەی عبدالحمید بۆ ئەوروپا وای لێکرد کە پەیڕەویی سیاسەتێکی سەربەخۆ بکا بەرامبەر ئەوروپا. نەزانراوە کە عبدالحمید لەژێر کاریگەریی هیچ فەرمانڕەوایەکی ئەوروپی بوو بێت، پلەی هاوڕێیەتیی هەرچەند بووبێ و پلەی نزیکایەتیی دەوڵەتەکە لە دەوڵەتی عوسمانی هەرچەند بوو بێت.

لەم گەشتەدا ئەو دایەلۆگە ڕێکەی کە سەرۆك وەزیرانی عوسمانی (فوئاد پاشا) ئەنجامی دەدا سەرنجی عبدالحمیدی ڕاکێشا. ئەوەی روون بوو دەوڵەتی عوسمانی لەو ساڵانەدا کزترین دەوڵەتی گەورەبوو، لەگەڵ ئەمەش:

لەم گەشتەدا لە فوئاد پاشا پرسرا: دورگەی (کریت) بە چەند دەفرۆشن؟ پاشا وەڵامی دایەوە (بەو نرخەی کە کڕیومانە)، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە عوسمانیەکان (٢٧) ساڵ جەنگیان کرد بۆ پاراستنی دورگەی کریت.

هەروەها لە فوئاد پاشا پرسرا: بەهێزترین دەوڵەت لە جیهاندا کامەیە؟ وەڵامی دایەوە: بەهێزترین دەوڵەتی ئێستا دەوڵەتی عوسمانیە، چونکە ئێوە لە دەرەوە دەیڕوخێنن و ئێمەش لە ناوەوە دەیڕوخێنین، هیچ کامێکیشمان نەمان توانیوە بیڕوخێنین.

عبدالحمید لەمە وانەی توانای دەمکوتکردنی ئەو هێزانە فێر بوو، کە دەیانویست دەوڵەتی عوسمانی لەناو ببەن و هەروەها فێری زیرەکی لە دایەلۆگی رامیاری بوو، کە لەمەودوا لێی هەڵکەوت. تەمەنی عبدالحمید لەم گەشتەدا (٢٥) ساڵ بوو.

* * *

## ٣/ تاکڕەویی وەزیرەکان و توندڕەویی سیاسەتە ڕۆژئاواییەکانیان:

کۆمەڵە نوێیەکانی عوسمانی کە بریتی بوون لە رۆشنبیرە هەڵبژێردراوەکان و وەزیرەکانیش لەوان بوون لە بنەماکانی فەرمانڕەوایی وڵاتەکەیان دەگەڕان لە شارستانیێتی ڕۆژئاوا، واتا: دەستوورێکیان بۆ وڵات دەویست لەسەر شێوازی ئەوروپی و ئەنجومەنێکیان بۆ گەل دەویست وەکو ئەنجومەنە نوێنەرایەتیەکانی ئەوروپی.

هەندێ لە ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە توانییان هاوبەشیی هەندێ چالاکی بکەن بۆ ئامادەکردنی یەکەم دەستووری عوسمانی و هەندێ چاکسازی جێبەجێ بکەن بە فەزڵی مەدحەت پاشا.[1]

ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە خۆیان لە شوێنە گرنگەکانی دەوڵەت بینیەوە و دەرگای باڵای (دەوڵەتی عوسمانی) لەژێر دەسەڵاتیان بو، بۆیە لەخۆیان بایی بوون و بەزەبر و زەنگ فەرمانڕەواییان لە وڵات دەکرد و خۆیان بە دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان دەپاراست لە سوڵتان، دوای ئەوەی پێشتر ڕەخنەیان لەو دەوڵەتانە دەگرت کە دەستیان لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتەکەیان وەردەدا، بەڕادەیەکی وا گەر تەنگاو بوونایە پەنایان دەبردە بەر باڵیۆزخانە بێگانەکان هەر وەك ئەندامە گەورەکەیان مەدحەت پاشا-کە والیی ئەزمیر بوو- پەنای بردە بەر باڵیۆزخانەی فەرەنسی لە ترسی بەندکردنی.

تاکڕەویی وەزیرەکان لە فەرمانڕەوایی گەیشتە ئەوەی کە (مەدحەت پاشا)ی سەرۆکی تاقمە عوسمانیە نوێیەکان، کە سوڵتان عبدالحمید لە ساڵی ١٨٧٧ هاتە سەر عەرش ئەمەی بۆ نووسی: "مەبەستمان لە ڕاگەیاندنی دەستوور تەنیا بنبڕکردنی تاکڕەوی و دەستنیشانکردنی ئەرکی وەزیرەکان و دابینکردنی ماف و سەربەستیی هەمو خەڵك بوو، تا وڵات دەگاتە لوتکەی پێشکەوتن، منیش گوێڕایەڵیی فەرمانەکانتان دەکەم گەر دژایەتیی نەبێ لەگەڵ بەرژەوەندیی نەتەوە..".[2]

ئەو لایەنگیریە گشتیەی کە ئەندامانی کۆمەڵەی عوسمانیی نوێ لە ناوەندی ڕۆشنبیرەکانیان وەردەگرت و لەگەڵ ڕای گشتیی خەڵك لە سەریان و ئەو خۆشەویستیەی، کە بۆ ڕۆژئاوا دەربڕدرا لە ڕۆژنامە و ڕاگەیاندنەکان، کاریگەریی هەبوو لەسەر شێواز و پێڕەوی سوڵتان عبدالحمید. سوڵتان عبدالحمید لەم بارەیەوە دەڵێت: "هەستم کرد (مەدحەت پاشا) لەخۆیەوە بووەتە فەرماندەر و ڕاوێژکارم، بینیم لە هەڵس وکەوتیدا لە دیموکراتیەت دوور بوو و لە تاکڕەوی نزیك بوو.".[3]

---

١ شەریف ماردین، ترکیا الفتاة، الفکر السیاسی، ص٣١.

٢ یوسف آصاف، تأریخ سلاطین آل عثمان، تحقیق بسام عبدالوهاب الجابي، دمشق ١٤٠٥-١٩٨٦، ص١٦.

٣ یاداشتەکان: ل٢٦

## ٤/ لەناکاو کوشتنی سوڵتان عبدالعزیزی مامی:

هەر کە مەدحەت پاشا و کۆمەڵــەی عوسمانیــە نوێیــەکان کەوتنــە نــاکۆکی لەگــەڵ سوڵتان عبدالعزیز، لایان دا و ئنجا ڕایان گەیاند کە سوڵتان خۆی کوشــتوە، بــەڵام ئــەو لیژنە پزیشکیەی کە سوڵتان عبدالحمید پێکی هێنا بۆ ئەوەی لەم کێشــەیە بکۆڵێتــەوە، جەختی لەسەر ئەوە کرد کە ئەم ڕووداوە خۆکوشتن نەبووە بەڵکو کوشــتن بــووە، چونکــە خۆکوژ ناتوانێ بەخۆی هــەردوو خوێنبــەری دەســتەکانی بــبڕێت، بەڵگــەی پزیشــکییان پێشکەش کرد کە سوڵتان عبدالعزیز خۆی نەکوشتوە و بەڵکو کوژراوە.[1]

## ٥/ تووشبوونی بە دوو هەوڵی کودەتا لەسەرەتای حوکمیدا بە پشتگیریی ئینگلتەرا:

### أ/ پیلانی عەلی سەعاوی:

عەلی سەعاوی یەکێکە لە ئەندامەکانی کۆمەڵەی عوسمانیــە نوێیــەکان و لــە چینــە بەرهەڵســتکارەکانی حوکمــی ســوڵتان عبدالحمیــدە و پێشــتریش دژی حوکمــی ســوڵتان عبدالعزیز بوو و لــە ســەردەمی ئــەمدا لــە وڵات دوور خرابوویــەوە. هــەر کــە ســوڵتان عبدالحمید هاتە سەر عەرش بڕیاری لێبوردن بۆ (عەلی ســەعاوی) دەرچــوو و لەشــوێنی دوورخستنەوەی لە ئەوروپا گەڕایەوە ئەستەنبول و چەند وەزیفەیەکی بینی و لە ســوڵتان نزیك بوویەوە و سوڵتان لەخۆی نزیــك کــردەوە، بــەڵام لــە ئــەنجامی هــەندێك هــەڵس و کەوتیەوە نرخی لای سوڵتان دابەزی و لــە ئــەنجامدا لــەکارە ڕەسمیــەکانی دوورخرایــەوە، بەجۆرە دووبارە (عەلی سەعاوی) گەڕایەوە سەر دژایەتیکردنی حوکم.

(عەلی سەعاوی) هێرشێکی چەکداریی بۆ سەر کۆشــکی (جیراغــان) ڕێکخســت کــە سوڵتانی لادراو مرادی پێنجەمی لێبوو، ئەو سوڵتانەی لەبەر شــێتی لادرابــوو، لــەدوای سەرکەوتنی هێرشەکە-وێنە گیراوە کە- (عــەلی ســەعاوی) ســوڵتان مــراد لــە کۆشــك دەربێنێ و لەجیاتی سوڵتان عبدالحمید بیکاتە سوڵتانی وڵات.

لەبەر ئەوەی (عەلی ســەعاوی) لایــەنگری ئینگلــیز بــوو و ئــەوانیش لایــەنگیرییان دەکرد، بۆیە ئەمەی خستبووە بەرچاو کە ئینگلیز گرنگی بــەم پیلانــە دەدا، بەتایبــەتی

---

١ أوزطونە، تأریخ ترکیا الکبیر، ج٧، ص١١٨-١١٩.

دایەرە ماسۆنیەکانی ئەوروپی و ناو دەوڵەتی عوسمانی گرنگییان بە دەنگوباسی سوڵتان مراد -کە ئەندامێکی کارای ماسۆنی بوو- دەدا یەك لەدوای یەك و عەلی سەعاوی سودی لەم گرنگیدانە بینی.

لە ١٨ی مایۆی ١٨٧٨ع (عەلی سەعاوی) بە یارمەتیی ٢٠٠ چەکداری کۆچکردوو هێرشی کردە سەر کۆشك و گەیشتنە شوێنی سوڵتان مراد، بەڵام لە شوێنێکی نزیك کۆشکەکە هێزێکی پاسەوان توانیان لەکاتی گونجاو بگەنە کۆشك و پیلانەکە پووچەڵ بکەنەوە و عەلی سەعاوی و نزیکەی بیست لە یاریدەرەکانی بکوژن.[1]

## ب/ پیلانی کۆمەڵەی کلانتی ماسۆنی:

دوای پوچەڵ بوونەوەی پیلانی یەکەم، کۆمەڵەی (کلانتی سکالیری)ی ماسۆنی نهێنی پیلانێکی یەکەم ئاسای نایەوە دژی سوڵتان عبدالحمید، هەندێ جار ئەم کۆمەڵەیە بە (کۆمەڵەی کلانتی و عەزیز بەگ)ی ماسۆنیی نهێنی ناودەبرێ. پیلانەکە لە یۆلیۆی ١٨٧٨ نەخشەی تەواوی بۆ کێشرابوو. واتا نزیکەی دوو مانگ لە پووچەڵبوونەوەی پیلانەکەی (عەلی سەعاوی).

لە ڕاستیدا دایەرە ماسۆنیە جیهانیەکان لە خەمی بەدواداچوونی هەواڵی سوڵتانی لادراو (مراد) بوون. ئەم دایەرانە لە کوشتنی دەترسان، یا لەوە دەترسان کە زیانێکی پێ بگات، سەرۆکی کۆمەڵەی ماسۆنی لە ئەستەنبوڵ دوانێکی بۆ ڕێکخراوە ماسۆنیەکانی ئیتاڵیا نووسی و تێیدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە سوڵتان (مراد) مەترسیی کوشتنی لەسەر نیە.

(کلانتی) ناوی مامۆستای گەورەی کۆمەڵەی (برودوس)ی ماسۆنییە لە ئەستەنبوڵ، کلانتی کاتێکی دیاریکراوی بۆ پیلانەکەی هەڵبژارد، کاتەکەش لادانی سەرۆك وەزیران (ئەدهەم پاشا) بوو لە لایەن سوڵتان عبدالحمیدەوە، ئەدهەم پاشا یەکێ بوو لە گرنگترین ئەو کەسێتیانەی، کە ماسۆنیەکان پشتیان پێ دەبەست لە کارەکانیان.

مەبەستی پیلانەکە لابردنی سوڵتان مراد بوو لە کۆشك و شاردنەوەیەکی کاتیی بوو لە کۆشکی عەزیز بەگ، ئەو عەزیز بەگەی کە ئەندامی هەمان کۆمەڵە بوو تا ئەو

---

١ أوزطونه، المرجع السابق، ص١٦٢-١٦٣.

کاتەی ئەندامانی کۆمەڵە دەتوانن (مــراد) بکەنــە ســوڵتان لــەجێی ســوڵتانی شــەرعی عبدالحمید.

کۆمەڵەی کلانتی دەستیان بە چالاکیی بانگەشە کرد دژی سوڵتان عبدالحمیــد پێــش جێبەجێکردنی کارەکەیان، یەکێ لەو بانگاشانە بەیاناتیان لەدیواری ڕۆخ شەقامەکان دا.

کۆمەڵە هەندێ کەسایەتی ئافرەتی لەناو کۆشکی جیراغان لە کارەکــەی بــەکارهێنا. هەروەها کۆمەڵە نەخشەی پیلانێکی دانا بۆ کوشتنی سوڵتان عبدالحمیــد، بــەڵام دوایــی وازی لیْ هێنا.

کەمێك پێش ئەوەی کۆمەڵەی کلانتیی ماسۆنی نهێنی پیلانەکــەی جێبــەجێ بکــا، یەکێ لە ئەندامانی کە نــاوی (حســێنی) بــوو پیلانەکــەی بــە دەســەڵاتداران راگــەیاند، ئەندامانی کۆمەڵە لە کاتی کۆبوونەوەیان دەستگیرکران، ئینگلتەرا لایــەنگیری هــەردوو پیلانەکەی دەکرد و لەدواوەیان دەوەستا.[1]

## ٦/ هەوڵدانی کوشتنی عبدالحمید لەلایەن ئەرمەنەوە بە قونبەلەیەکی کاتی:

لە پێنجی یۆلیۆی ساڵی ١٩٠٥ یاخیبووە ئەرمەنــەکان پیلانییێکیــان ڕێکخســت بــۆ کوشــتنی ســوڵتان عبدالحمیــد، ئەمــەش بــەهۆی قونبەلەیــەکی کاتیـیــەوە کەلــــەدوای دەرچوونی سوڵتان لە مزگەوت لەنوێژی هەینی بتەقێتەوە. قونبەلەکە تەقیەوە بەڵام پێش ئەوەی سوڵتان بگاتە شوێنەکەی، سوڵتان زیانی پێ نەگەیی، بەڵام ڕوداوەکە بــووە هــۆی گیان لەدەستدانی ٢٦ کەس و برینداربونی ٥٨ کەس.[2]

* * *

---

١ قارال، المرجع السابق ٥٠١-٥٠٤.

٢ حکمت طانیو، الیهود والأتراك عبر التأریخ، أستابول ١٩٧٧، الجزء الأول، ص٤٧٢.

# پاری چوارەم

# کەسێتی سوڵتان عبدالحمید و پێڕەوی بیرکردنەوەی

## ١/ سیفەتەکانی:

سوڵتان عبدالحمید لە منداڵییەوە بە گۆشەگیری بەناوبانگ بوو، هۆیەکەشی مردنی دایکی بوو لە تەمەنی سی ساڵی و عبدالحمیدیش تەمەنی نزیکەی (١٠) ساڵ بوو، دایکی لەدوای نەخۆشیەك مرد کە عبدالحمید لەو کاتەدا لەبەر دایکی تووشی دڵەڕاوکێ بووبوو. کە مرد زۆر خەمی بۆ خوارد و بۆی کەوتە گۆشەگیری بە رادەیێ باوکی ناوی لێنابوو (منداڵە گۆشەگیرەکە). بەڵام ئەم گۆشەگیرییە بەرەو وردبوونەوە و لەخۆپرسینەوەی برد و زۆر لە دەوروبەری خۆی رادەما.

هەر کە باوەژنی-کە دڵسۆز بوو- پەروەردەکردنی گرتە دەست، لەبەر هێوری و گۆشەگیرییەکەی زۆری خۆش دەویست، ئەویش باوەژنەکەی خۆش دەویست و وەکو دایکی سەیری دەکرد، باوەژنەکەی مرۆڤێکی ناسك و خێرخواز بوو، بە دەنگێکی نرم دەدوا، وا دەگوترا: کە عبدالحمید دەنگ نزمیەکەی لە باوەژنەکەی وەرگرتووە.

عبدالحمید حەزی لە فێربوونی زمانەکان بوو، هەر بە بچووکی ئەو زمانانە فێر بوو، کە لە کۆشکدا قسەیان پێ دەکرا، زمانی (چەرکەسی) و (ئەلبانی) فێر بوو، ئارەزووی لە خوێندنەوە بوو. بێدەنگ و کەم دوو بوو، چاك گوێی لە خەڵکی دەگرت.

وەرزشی لەشیی دەکرد، سواری ئەسپ دەبوو، حەزی لە رۆیشتن و شیربازی و نیشانەپێکان بوو.

هەرچەندە میراتێکی زۆری لە باوەژنەکەی بۆ بەجێما، بەڵام دەست بڵاو نەبوو و سامانی بەفیڕۆ نەدەدا. تەنیا میرێ بوو لەنێوان میرەکانی کۆشك کە وامدار نەبوو، بە پێچەوانەوە ماڵی خۆی بەرهەم دەهێنا و پەرەی پێ دەدا و خۆی کاروبارەکانی دەبردە

سەر. سامانی خۆی لە پەروەردەکردنی مەڕ و فرۆشتنی بەرهەم دەهێنا، هەر کە میر بوو و دوور بوو لە دەسەڵات و خەریکی بازرگانی بوو.

عبدالحمید کە میر بوو و کوڕی سوڵتان بوو، پێڵاوە کۆنەکانی فڕێ نەدەدا، بەڵکو پینەی دەکرد و لەپێی دەکرد. دەیزانی هەندێ گاڵتەی پێدەکەن، بەڵام گوێی پێ نەدەدا و لەو باوەڕە بوو کە ئەوەی دەیکات ڕاستە، لەو باوەڕە بوو کە دەست بڵاوی حەرامە و پێویستە گاڵتەی پێ بکرێ.

میرەکانی کۆشك زۆرجاران لە دەرەوەی کۆشکی سوڵتانی شەونخونییان دەکرد، بەڵام ئەو هەمیشە لەناو خانەوادەی خۆیبوو، بە شەو دەرنەدەچوو و لەگەڵ خێزانەکەی دەمایەوە، ئەمەش کاریگەریەکی زۆری هەبوو لەسەر بەهێزکردنی پەیوەندییەکانی خێزانی و قووڵ بوونەوەی.[1]

ئەوەندە گرنگیی بە خێزانەکەی-ژن و منداڵەکانی- دەدا کە پلانی بۆ هەموو کاروبارێکیان دادەنا، لەوانەش گەشت و ڕابواردنیان، ئەمەی نەدەدا دەست کەس لە کۆشکدا.

پەیوەندیی بە کەسی ترەوە نەبوو لە دەرەوەی چوارچێوەی خێزانەکەی، بۆیە قسە و قسەڵۆکی بەدواوە نەبوو، بەپێچەوانەی میرەکانی تر.

هەروەها لە پاراستنی تێکڕای کاری ڕۆژانەی سەرکەوتوو بوو، کە بریتی بوو لە چواردە کاتژمێری ڕۆژانە لەو ٣٣ ساڵەی کە سوڵتان بوو.

لە سیفەتەکانی سوڵتان عبدالحمید، بە بیرتیژی و زیرەکی بەناوبانگ بوو، زوو کاری لە گوێگرانی خۆی دەکرد، کاریگەریی لەسەر ئەوانە هەبوو کە هەڵس وکەوتیان لەگەڵی دەکرد و زۆر بە نەرمی لەگەڵیان دەجوڵایەوە، بەپێوە پێشوازیی پێشوازیکەرانی دەکرد و وەکو پاشا و قەیسەرەکانی سەردەمی خۆی نەبوو کە بە دانیشتنەوە پێشوازییان بکات.

سوڵتان عبدالحمید قسەی شیرین بوو، ڕێزی ئەوانەی دەگرت کە قسەیان لەگەڵی

---

١ أورخان قول أوغلو، حقيقة عبدالحميد، ص٢٦-٤٧ و ص٤٩.

دەکرد با منداڵیش بان.

لە سیفەتە واتاییەکانی سوڵتان عبدالحمیدی دووەم: دینداری و ئازایەتی، دادپەروەری و دڵسۆزی لەگەڵ دوژمنەکانی، ڕێزگرتنی بەرهەڵستکارەکانی، سەرکەوتنی لە قەناعەت پێهێنانی خەڵکی بەبیری تیژی، نەرم و نیانیی بەرامبەر بەرهەڵستکارەکانی و هەوڵدان بۆ قایلکردنیان، کێشکردنی دوژمنەکانی لەپێناو مەبەستەکانی، توندوتیژیی لەسەر باوەڕ، گوێڕایەڵیکردنی ویستی گشتی دوای تێگەیشتنی مەبەستەکانی. نەفرەتیکردنی لەخوێن ڕشتن و خۆپارێزی لە دوژمنان و ئارەزووکردن لە موناوەرەکرنیان.

مێژوونووسەکان باسی هەندێ سیفەتی تریان کردووە: وردیی لەو شتانەی بۆی باس دەکرێ، لاریی نەبوو کە لەپێناو بەرژەوەندیی کاروباری دەوڵەت لە خەوی هەڵبسێنن، لەسەر حەق گوێی لە سەرزەنشتی کەس نەبوو، بەخۆی فەرمانبەرەکانی هەڵدەبژارد و دووربین بوو.[1]

## ٢/ بۆچوونی دۆست و دوژمنەکانی: (چەند نمونەیێ):

### = بۆچوونی دوژمنەکانی:

سوڵتان عبدالحمید هەڵوێستی توندوتیژی بەرامبەر یاخیبوونەکانی ئەرمەن هەبوو کە ڕوسیا و کۆمەڵە ئەرمەنیە شۆڕشگێڕەکان پشتگیریان دەکردن. ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوایی بەگشتی و فەرەنسی بە تایبەتی نارەزاییان بەرامبەر هەڵوێستی سوڵتان عبدالحمید دەردەبڕی دژی ئەرمەنیەکان.

لەبەر ئەوە ئەرمەنیەکان نازناوی (سوڵتانی سوور)یان لێنا، واتا ئەو سوڵتانەی کە خوێن دەڕێژێ، یەکەم کەس کە ئەم نازناوەی بەکارهێنا (البرت فاندال)ی مێژوونووسی فەرەنسی بەناوبانگ و ئەندامی ئەکادیمیی فەرەنسی بوو.

ئەدیبە فەرەنسیەکان کەمتەرخەمییان نەکرد لەوەی کە بە (سوڵتانی سوور) وەسفی سوڵتان عبدالحمید بکەن، لە سەرووی هەموو ئەو ئەدیبانەش ئەدیبی فەرەنسی

١ المرجع السابق، ص٤١، وأوزطونة ص٢٣٨، والمذكرات ص٣١، وكذلك مذكرات الأميرة عائشة ص٤٠١.

بەناوبانگ (أناطول فرانس) بوو.

(گلادستون)ی سەرۆك وەزیرانی بەریتانی بەمجۆرە وەسفی سوڵتان عبدالحمیدی کردوە: "سوڵتان شەیتانە، دوژمنی دیانەکانە، بکوژی گەورەیە.". گلادستون لە رامیاریدا بە دەمارگیریی ئایینی بەناوبانگ بوو، هێندە لەرادەبەدەر بوو جارێکیان لە ئەنجومەنی گشتی بەریتانی قورئانێکی بەدەستەوە گرتبوو و چیی وای نەمابوو فڕێیداتە سەر زەوی.

* * *

هەندێ لە هاونیشتمانیەکانی سوڵتان عبدالحمید ئەوانەی لە بیروباوەڕ دژی بوون و دژایەتییات دەکرد، هەڵوێستێکی دوژمنکارییان بەرامبەری وەرگرت. ڕۆژنامەی (عوسمانلی) کە زمانحاڵی (اتحاد وترقی) بوو بە (دەمارگیر و سەفراوی) وەسفی دەکات، لەو بانگەوازەی کە کۆمەڵەی (اتحاد وترقی) ئاراستەی میللەتی کرد بەناونیشانی (یا حەق یا مردن) بەمجۆرە وەسفی سوڵتان عبدالحمیدی دووەم دەکا، کە (سەگی هار)ە و لە بەیانەکەدا هاتووە: "ئەی عوسمانیەکان! چاك بزانن کە کوشتنی سەگی هار ئەرکە و پێویستە.".

لەو کاتەی کە سەرۆکی باڵی شارستانیی کۆمەڵەی (اتحاد وترقی) ئەحمەد رەزا شانازی بەکافربوونی خۆی دەکا، دەبینین یەکێ لە کۆڵەگەکانی بەرهەڵستکاران کە داماد (محمود پاشا)یە بەم شێوەیە وەسفی سوڵتان عبدالحمیدی دووەم دەکا، کە "پیاوێکە بڕوای بە ئایین و نیشتمان نیە.".

هەروەها ئەفسەرە گەنجە (اتحادی)یەکان وەسفی سوڵتانیان دەکەن، کە "دیکتاتۆرێکی سستی ترسنۆکە و حەزی لە جەنگ نییە.".[1]

سوڵتان عبدالحمید خۆی لە یاداشتەکانیدا باسی هەندێ سیفەتی خۆی کردووە کە دوژمنەکانی لێیان ناوە، لەوانەش (زۆرداری غەدرکەر) و (دوژمنی ئەدەب و ئەدیبان).

* * *

١ نجیب فاضل، ص٢٥٩.

جوولەکەکان کە دوژمنی سروشتیی سوڵتان عبدالحمید بوون بەچەند سیفەتێکی ناشایستە باسی دەکەن، هرتزل وەسفی دەکا کە: (سوڵتانێکی زۆر پیس و بە فرت و فێڵە و باوەڕی بەکەس نییە)، هەروەها هرتزل دەڵێ: (نائومێدە لەوەی مەبەستی جوولەکەکان لە فەڵەستین بێتە دی، جوولەکەکان ناتوانن هیوا و ئاواتی خۆیان لە-أرض الموعودة- جێبەجێ بکەن، تا سوڵتان عبدالحمید لە فەرمانڕەوایی بێ و بەردەوام بێ لێی).[1]

## = بۆچوونی خۆشەویستەکانی:

بۆچوونی خۆشەویستانی عبدالحمید پێچەوانەی بۆچوونی پێشووە، گرنگترین ئەم بۆچوونەش بۆچوونی گەلی عوسمانییە، ئەم گەلە سوڵتان عبدالحمیدی بە (باوکی ڕاستەقینەی میللەت) داناوە.

(یحیی کمال)ی شاعیر لە قەصیدەیەکیدا باسی خۆشەویستی گەل دەکا بۆ دادپەروەریی حەمیدییە و ناوی لێناوە (سوڵتانی دادپەروەر).

هەرچەندە عبدالحمید لە سەردەمی میریی (اتحاد وترقی)ی دوژمنی مرد، بەڵام گەلی عوسمانی هاوبەشیی ناشتنیان کرد و تەرمەکەی "یەکێ بوو لە تەرمە هەرە مەزنەکانی مێژووی وڵات." و گەلەکەی خۆشیان ویستووە. ئەو سیاسەتەی کە سوڵتان پەیڕەویی کرد و "وای لە دەوڵەتی عوسمانی کردووە، کە ببێتە بەهەشتی نرخ هەرزانی.".

لەبارەی خۆشەویستیی میللەت بۆ سوڵتان عبدالحمید، (احمد راسم)ی شاعیر بەمجۆرە بۆچوونی دەردەبڕێ:

"نەك هەر تۆ

بەڵکو ئەگەر تەرمەکەشت حاکم بوایە لەسەرمان

شایانی ئێمە بوو

دەبا تابووتەکەت بگەڕێتەوە و لەسەر عەرشی عوسمانی دانیشێ."

---

١ نجيب فاضل، ص٢٥٩ المرجع السابق، ص٤٦٣/ والمذكرات ص٦٠ وص٢٠، وأورزطونة ص٢٤٠ ومقدمة المذكرات ص١١.

سلێمان نەزیفی شاعیر دوای مردنی سوڵتان عبدالحمید ستایشی دەکا و پلاز لە پیاوانی (اتحاد وترقی) دەدا، کە گوایە لەبەر تاکڕەوەیی لایان بردووە و دەڵێ:

"گەورەم سوڵتان: ئارەزوومان لە تاکڕەویی کۆن کرد.".

* * *

لە کتێبی (چل ساڵ لە دەریاوانیی عوسمانیدا) سێر هنری وودز دەڵێت: "عبدالحمید سوڵتانێکی مەزنە، ژیانی زۆر ئارامە و دوورە لە رووکەشی، گوێی لە دەوروبەری خۆی دەگرت هەر کە هەوڵی دەدا چارەسەریی کێشەیێ لە کێشەکان بکات، بەڵام دیلی بۆچوونی دەوروبەری نەبوو، پێش ئەوەی بێتە سەر عەرش هۆشدار و عەگید و سەنگین بوو زۆر بە نایابی کاروبارەکانی هەڵدەسوڕاند، بە چاپووکی هەوڵی یەکگرتنەوەی ولاتە لەتکراوەکەی دەدا.".

نووسەری تورکی (أتصز) گوتویەتی: "سوڵتان عبدالحمیدی دووەم یەکێکە لە گەورەترین کەسێتی مێژوویی کە لەناو خەڵکدا ستەمی لێکرابێ و زۆر بوختانیان پێی کردبێ.. بەمجۆرە ئەم سوڵتانە مەزنەیان بە ئێمە ناساندووە کە بکوژ و خوێنڕێژ و تاکڕەو و سوور و نادان و ترسنۆك بووە. لە سۆنگەی بۆچوونی دوژمنانی بە خەڵکییان ناساندووە، هەمیشە لەژێر کاریگەریی بانگەشەی نەیارانی پێشکەشی خەڵکی کراوە. مرۆڤێکی بەدبەختە."

ڕۆماننوسی تورکی (ناهد سری أوریك) کە دانەری ڕۆمانی (لەکاتی ڕووخانی عبدالحمید)ە دەڵێت: کە ئەو بەدرەنگەوە لە حەقیقەتی عبدالحمید گەیشتووە، بەڵام کە ناسیوێتی ڕێزی گرتووە و "عبدالحمید شێت نەبووە و لە سێبەری خۆی نەترساوە، خوێنڕێژ و ستەمکار نەبووە، هەروەك بۆیان هەڵبەستووە و ئێمەیان گومڕا کردووە، بەڵکو بە تەواوی بە پێچەوانەی ئەمانە بووە. مرۆڤێکی میهرەبان بووە، ماڵ و نامووسی خەڵکیی پاراستووە. لەو باوەڕەم کە لە تەنگترین کاتدا ئازا و دلێربووە.".[1]

---

١ مفتی اوغلوا: ٤١٩-٤٢٠، ٤١٧-٤١٨ واوزطونة ٢٤٠-٢٤١.

## ٣/ پێڕەوی بیرکردنەوەی:

## یەکەم: لەسەر ئاستی گشتی:

### = کۆڵەگەی فەرمانڕەوایەتی:

خۆشەویستترین لقەکانی زانیاری بەلای سوڵتان عبدالحمیدەوە (ئـەدەب و مێـژوو)ە و لەو باوەڕەدایە، کە فەرمانڕەوایەتی لە مێژوودا لەسەر بنەمای هێز نابێ، بەڵکو لەسـەر دادپەروەری دەبێ و لەم بارەیەوە دەڵێ: "دادپەروەری بنچینەی ڕەوایەتیـە و(مشـروعیە) ڕەوایەتی پاڵپشتی فەرمانڕەوایەتییـە و هـێز لایـەنگری ڕەوایەتییـە و فەرمانڕەوایـەتی ناچارە متمانە لەسەر دادپەروەری بکات، ئەگەر یەکێ بێ دادپەروەری فەرمانڕەوایـەتیی کرد و بە ناڕەوایی هێزی بەکارهێنا، مسۆگەر ئەم فەرمانڕەوایەتییە هەرەس دێنێ.".

### - حاکم و ویستەکانی گەل:

سوڵتان عبدالحمید لە فەرمانڕەوایەتی ڕای وایە، کە "نابـێ حـاکم لـەپێش ویسـت و ئارەزووەکانی گەل بوەستێ با هەڵەش بێت، مادام گـەل ئـەوەی دەوێ، چونکـە وەسـتان بەرامبەر تەوژم تـەنیا زیـانی لێ ڕەچـاو دەکـرێ.". وازهێنـان لـە میللـەت کـە خـۆی تاقیبکاتەوە کارێکی حەتمییە. لەبارەی جەختکردنی ئەم بۆچوونەی دەڵێت: "ئەم دەتوانی لەبەر تەوژمی ئەو کاتە بوەستم و گوتم مادام میللەت دەیـەوێ خـۆی لـە لێپرسـراوێتی تاقی بکاتەوە و حوکمی خۆی بکات، با چیی دەوێ بیکات."، هەرچەندە لەو قەناعەتـە بوو، کە تاقیکردنـەوەی دیموکراتیـەت لـەو سـەردەمەدا بێسـوودە بـۆ دەوڵـەت و ئـەم دیموکراتیەتە وڵات بەرەو چەند کێشەیێ رادەکێشێ، کە بێسنوور بێ، ئەمەی پێشـبینی دەکرد ڕوویدا.

لەو هەڵوێستە مێژووییانەی کە لـە بـەرژەوەندیی سـوڵتان عبدالحمیـد تۆمـارکراوە: سوڵتان دەیتوانی سوپای (اتحاد وترقی)-کـە لـە سـلانیکەوە بـۆ ڕووخـاندنی دەهـات- بوەستێنێ، لەگـەڵ ئەمـەش سـوڵتان فـەرمانی دا کـە ئـەو سـوپایەی لـە ئەسـتەنبوڵە نەجووڵێ، هەرچەندە سوپای دوژمنەکانی لە نزیک ئەستەنبوڵ بوون و سوڵتان فەرمانی دا کە لەگەڵ ئەو سوپایەدا نەجەنگن. لەم ڕووەوە دەڵێ: "ئایا سوپای ئەستەنبوڵ نەیدەتوانی

بەسەر ئەو سوپایە بێیاسایە سەرکەوێ، کە لە (سلانیەك)ەوە دەهات؟!.".

## = لەپێناو پارێزگاریکردنی حوکمدا،ڕشتنی خوێنی سەربازان حیکمەت نیە:

هۆیەکەشی لەوەدایە کە نابێ لەبەر تەوژم بوەستێ و لەم بارەیەوە دەڵێ: "حەزم نەدەکرد خوێنی سەربازەکانم بڕێژم، وام هەست دەکرد کە میللەت بەقای پێم نەماوە.".

## = هاولاتێتی و شەرەفی:

سولتان عبدالحمید لەو باوەڕە بوو کە هاولاتیی بەشەرەف ئەو کەسەیە، کە لەپێناو ولاتی کاردەکات و سەر بۆ بێگانە دانانەوێنێ-بەواتای دیان و جولەکە- بەهیچ شێوەیێ.

سولتان گلەیی لە مەدحەت پاشای وەزیری دەکات، کە لە ترسی ئەوەی نەخۆ بیدەنە دادگا "یەکسەر بەرەو باڵیۆزخانەی ئینگلیزی رۆیشت، بەلام سەیری کرد باڵیۆزخانەکە پشوویەتی، ئنجا پەنای بردە بەر باڵیۆزخانەی فەرەنسی و خۆی دەخیلی ئەوان کرد.". لەگەڵ ئەمەش ئینگلتەرا و فەرەنسا چاوەڕوانی هەلێکیان دەکرد، کە دەوڵەتی عوسمانی لەناو ببەن. لەراستیدا ئەم ڕوداوە "سەری عوسمانیی لەپێش دۆست و دوژمن نەوی کرد.".

بۆیە ئەم هەڵس و کەوتەی مەدحەت پاشا-وەکو هاولاتیەك- "چاوی لێ ناپۆشرێت.".

هەروەها وەزیری بەرگریی عوسمانی کە بە نهێنیەوە پەیوەندیی بە باڵیۆزخانەی ئینگلیزی کرد و پارەیەکی زۆری لە ئینگلتەرا-دوژمنی ولاتەکەی- وەرگرت. ئەم هەڵس و کەوتە لەڕوانگەی سولتان عبدالحمیدەوە هەڵس وکەوتێکی نامەردانە بوو و شکۆمەندیی هاوولاتێتی لەکەدار کرد، بەتایبەتی ئەم وەزیرە-حسین عونی پاشا- سەرکردەیەکی سەربازیی عوسمانی بوو ((مەسەلەی ئەوەی کە سەرکردەیەکی عوسمانی پارە لە دەوڵەتێکی بێگانە وەربگرێ کارێکی گاڵتە و هەوەنتە نییە)). هیچ شتێ هێندە ژیان و ناخی سولتان عبدالحمیدی نەهەژاند بەقەد ئەوەی، کە پیاوێك بگاتە پلەی سەرکردایەتی سوپا و بگاتە پلەی بالا، کەچی دراو لە دەوڵەتێکی بێگانە وەربگرێت.

**= دادوەریی حوکم لەسەر کەسەکانە با لە دوژمنانیش بن:**

یەکێ لە سیفەتەکانی هزری سوڵتان عبدالحمید دادپەروەریی حوکمێتی لەسەر ئەو کەسانەی، کە بە توندوتیژی لەبەرامبەری وەستاون و دژایەتیان کردووە و ئەویش دژایەتیی ئەوانی کردووە، یەکەمیان مەدحەت پاشایە کە سوڵتان عبدالعزیزی مامی کوشتوە و ئەویش بە ئاشکرا دوژمنایەتیی خۆی بەرامبەری نیشان داوە، بەڵام سوڵتان عبدالحمید لایەنی چاکیی دوژمنەکەی فەرامۆش نەکردووە و بەم شێوەیە وەسفی دەکات: "مەدحەت پاشا لەبەر چاکیی فەرمانڕەوایەتی و ئاوەدانکردنەوەی ویلایەتی-الطونة- ڕێز و پێزانینی ئێمەی وەرگرتووە." و "مەدحەت پاشا والیەکی چاك بووە." و "من لە نرخی مەدحەت پاشا کەم ناکەمەوە، ئەو والیەکی کارا و ڕاستەڕێ بووە.".

هەرکە داد-کە سەربەخۆ بوو- مەدحەت پاشای بە کوشتنی سوڵتان عبدالعزیز تاوانبار کرد، سوڵتان عبدالحمید لایەنی چاکیی وەزیرە کۆنەکەی خۆی لەبیر نەکرد و دەیگوت: "لەڕاستیدا هەمیشە لە مەدحەت پاشا دەترسام، بەڵام کاتی دەرچوونی فەرمانی دادگا، بینیم کە مرۆڤێکی ئاوا بەڕێز پێویستە فەرمانی لەسێدارەدانی جێبەجێ نەکرێت.".

سوڵتان لە رووی دادپەروەرییەوە لەم بارەیەوە دەڵێ: "بەهیچ شێوەیێ کەمترین زیانم بۆ پیاوێ لە پیاوەکانی نەبووە، فەرمانم داوە کە مووچەیێ بۆ خانەوادەکەی خەرج بکرێ. هەندێ لە پیاوەکانیم لە وەزیفە جۆراوجۆرەکان دامەزراندوە و جاری وابووە گەیشتونەتە پلەی سەرۆك وەزیران، وەکو (عبدالرحمن پاشا و خەلیل رەفعەت پاشا) کە بینیم شایانی ئەوەن، هەروەها هەندێکیانم لە شوێنە گرنگەکانی دەوڵەت دامەزراندووە، بۆ نمونە (مشیر شاکر و رائف پاشا)."، سەرەڕای ئەوەی کە ئەم پیاوانەی مەدحەت پاشا وەکو خۆی دژی حوکمی سوڵتان بوون.

لەبارەی حوسێن عەونی پاشای دوژمنی سوڵتان و وەزیری بەرگری و سەرکردەی سوپاکانەوە سوڵتان عبدالحمید دەڵێت: "حوسێن عەونی پاشا لایەنی چاکە و لایەنی خراپەی هەبوو." و "ئەوە قبوڵ دەکەم کە سەربازێکی چاکبوو، بەڵام وەکو پیاوی دەوڵەت خراپ بوو؛ چونکە وردبینی نەبوو، زۆربلێ و مەغرور بوو، بەڵام ئاگادارم تا ئەوکاتەی

ناردیانە تاراوگە(منفی) پیاوێکی بەشەرەف بوو، هۆکارەکانی پێویسـتی و ئـەو ڕازارەی کە لە تاراوگەیدا چەشتی وا لێکرد بکەوێتە خافڵەتیی گەڕان بەشوێن شـەرەفدا و ئەمـە تەوەرەی بەدبەختیەکەی بوو."، مەبەسـتی سـوڵتان لەمـە وەرگرتنـی بـەرتیل بـوو لـە ئینگلتەرا.

سـوڵتان عبدالحمیـد بەئاشـکرا سـیفەتە چاکـەکانی دوژمنـانی دەڵـێ، لـەبارەی قوستەنتینی قەیسەری بێزەنتە کە دوژمنـی (محمـد الفـاتح)ی باپیرەیـێ لـە باپیرەکـانی سوڵتان عبدالحمید بوو، دەڵێ: "قوستەنتین-کە شمشێری لەدەسـتە- لـەنێوان بورجـەکانی ئەستەنبوڵەوە بەرگری لێی کرد و گیانی خۆی پێشکەش کرد.".

## = جەنگ دەبێ خۆی بۆ ئامادەبکرێ:

باروزروفی ڕووخانی دەوڵەت و ئیفلاسبوونی بۆچوونی سوڵتان عبدالحمیـدی پێکـهێنا لەبارەی جەنگەوە، هیچ بەرژەوەندیی بەدی نەدەکرد، کە دەوڵەت بچێتە ناو جەنگەوە بێ ئەوەی خۆی بۆ ئامادە نەکا. بەجۆرە وەڵامی ئەوانـەی دەدایـەوە کـە بـەوە تاوانباریـان دەکرد گوایە سوڵتان خۆی لە جەنگ دەدزێتەوە "ئاوڕ لە هیچ گروپـێ نادەمـەوە تـا بـە تەواوی نـەزانم سـەردەکەوم."، چونکـە جـەنگ بـەپێی بۆچوونـی سـوڵتان "گـەورەترین کارەساتی میللەتانە، خـۆ سـەرکەوتوەکانیش میللەتـەکانیان لـەناو دەبـەن و بێزاریـان دەکەن."، سوڵتان لەگەڵ نەفسی خـۆی ڕاسـتگۆ بـوو، کـە گوتـی "مـن هەمیشـە دژی جەنگم.". سوڵتان لەو باوەڕە بوو کە دووربوون لە هەرا و هوریا و چوونـە جەنگـەوە بـۆ وڵات باشترە، هەروەك دەڵێ: "ئەو جەنگانەی کـە کۆتاییـان بەسـەرکەوتن دێ میللـەت کەنەفت دەکەن، هـەروەك ئـەو جەنگانـەی کۆتاییـان بـە ژێرکـەوتن دێ، سـەربەرزی و شکۆمەندی شوێنەوارە جوانەکانیان لە وڵاتی ئاوەدان بەدیار دەکەوێ، ئـەو وڵاتـەی کـە ئەمڕۆ و سبەی لە ئاسایشدایە. بەڵام ئەو برسییە ڕووتانەی ناو کاولگەکان کە بانگەوازی سـەربەرزی و شـکۆمەندی دەکـەن و بـەدوای دەکـەون، دەبـێ چ کـارێ دەبـێ لەمـە پێکەنیناویتر و بەئازارتر.".

## = سیاسەتی نەکەوتنە ناو جەنگی دەوڵەتە ئیمپریالیزمیە گەورەکان:

لەبەر ئەوەی دەوڵەتە ئیمپریالیزمیەکان هەمیشە لە پیلانگێڕان بـوون دژی دەوڵـەتی

عوسمانی، بۆیە سوڵتان عبدالحمید سیاسەتی نەکەوتنە ناو جەنگی گرتە بەر و خۆی لە دەوڵەتە ئیمپریالیزمیە گەورەکان دەپاراست بۆ ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی تووشی جەنگێ نەبێ کە خۆی بۆ ئامادە نەکردووە. هەرکە سوڵتان لەسەر عەرش لادرا، سەرکردەکانی (اتحاد وترقی) کە کاروباری دەوڵەتی عوسمانییان گرتە دەست بە هەڵپەوە چوونە ناو جەنگی جیهانیی یەکەمەوە بێئەوەی ولات هیچ ئامادەگییەکی هەبووبێ و چاوەنواری هیچ بەرژەوەندیەکیش نەدەکرا لەو جەنگە، بەمجۆرە دەوڵەت ڕووخا و لەمێژوو دەرچوو.

## =پێویستیی راوێژ بۆ دادوەر:

سوڵتان عبدالحمید بینی کە راوێژکردن زۆر گرنگە بۆ فەرمانڕەوایەتی و دادوەر، بەڵام خۆی بە تەواوی پابەند نەبوو پێی. خۆی راوێژی بە پسپۆڕ و زانایان دەکرد، بەڵام بەرژەوەندیی وڵاتی لەچی بدیبایە ئاوا هەڵس وکەوتی دەکرد.

بۆ نموونە سوڵتان راوێژی بە شێخی ئیسلام (احمد اسعد) کرد بۆ دانانی والیی سوریا، ئەمیش پێشنیازی (کامل پاشا)ی وەزیری ئەوقافی کرد، سوڵتان گوێی لێگرت، بەڵام بەگوێی نەکرد، چونکە هەستی بەوە کرد کە (سعید پاشا)ی سەرۆك وەزیران و هەندێ پیاوماقووڵانی دەوڵەت دەیانویست (کامل پاشا) لە پایتەخت و ئەنجومەنی وەزیران دووربخەنەوە، لەبەر ئەو ناکۆکیەی لەنێوان سەرۆك وەزیران و سەرۆکی ئەوقاف هەبوو.

## = رەدکردنەوەی ئاکارە هاتووەکان:

سوڵتان عبدالحمید رەخنەی لەو گەنجانە دەگرت کە چووبوونە دەرەوە بۆ خوێندن و گرنگییان بە هەندێ ئاکاری ئەوروپی دەدا، لەم ڕووەوە دەڵێ: **"هەندێ لەو گەنجانەی دەچنە ئەوروپا-پێش ئەوەی بزانێ چی لە تاقیگەکانیان ڕوودەدا- دەبینێ ئافرەت لەگەڵ پیاوان سەما دەکەن، هەندێ لەو گەنجانە شانازییان بەو ئەوروپییانە دەکرد کە مەی دەخۆنەوە. کە دەگەڕانەوە وڵاتی خۆیان راسپاردەی ئەو جۆرە کارانەیان دەکرد، لەو باوەڕەدا بوون کە لوتکەی ژیاری ئەوروپی لەو کاروبارانەدایە. دەمگوت ئەمە هەڵەیە، بەوە بیرکردنەوەمیان تاوانبار دەکرد کە جاڵجاڵۆکەییە."**

سوڵتان عبدالحمید کولتوور و رۆشنبیریی رۆژئاوایی نەدەویست، چونکە لەو باوەڕە

بوو کە ئیسلام ژیارێکی تەواوی هەیە بە ئاکارە تایبەتیەکانی، کە باڵادەستە لەسەر ژیار و ئاکاری ڕۆژئاوایی و ڕۆژئاوا تەنیا زانستە نوێیەکانی لیٚ وەردەگیریٚ.

## = پێویستیی واقیعیی ڕامیاری:

واقیعی ڕامیاری یەکیٚ بوو لە ئەدگارەکانی بیرکردنەوەی ڕامیاریی سولٚتان عبدالحمید، هەر کە دوژمنەکانی بەوە تاوانباریان کرد کە لەو کاتەی میری بولگار (دوباتنبرگ) دەستی بەسەر شاری (فیلبە)دا گرت لە ناوچەی (ڕۆمەڵ)ی ڕۆژهەڵات، سولٚتان کزی و بیٚهێزیی نواندووە، سولٚتان بەمجۆرە بەرگری لەخۆی دەکا و دەڵیٚ: "ئەگەر دژی بولگار جەنگم بکردایە، ئەوا بولگار و سیرب وازیان لەدژایەتیی یەکتری دەهێنا و دەبوونە یەك و ئەو کاتە کێشەکە تەنیا نەدەبووە کێشەی ڕۆمەڵی ڕۆژهەڵات، بەڵکو داوای حەلکردنی کێشەی مەقدۆناشیان دەکرد.".

واقیعیی ڕامیاری وای لە سولٚتان عبدالحمید کرد، کە بڕیاری ئەوە بدا جەنگ هۆکاری حەلکردنی کێشەی گرتنی تونس لەلایەن فەرەنسیەکان و میسر لەلایەن ئینگلیزەکانەوە نییە. باروزرووفی دەوڵەت ڕێگای بەرەنگار بوونەوەی هێزە بچووکەکان نادات، چ جای بەرەنگاربونەوەی هێزە گەورەکان، بۆیە سولٚتان دەڵێت: "ئەگەر بەرگریم لە تونس بکردایە دوور نەبوو سوریام لەدەست بچێت، گەر پێم لە میسر دابگرتایە بێگومان فەلەستین و عێراقم لەکیس دەچوو." و "نابیٚ فەرمانڕەوایی ڕاستەقینە بخەمە مەترسیەوە و هەلپەی پارێزگاریکردنی فەرمانڕەواتیی بێژەیی بکەم.".

## = چەمکی پێشکەوتن و نوێخوازی و پەرەسەندن:

چەمکی ئەم زاراوانەی لای سولٚتان لەوەوە هەڵدەقولیٚ، کە خۆی دادوەرێکی موسڵمانە و لەسەر ڕۆشنبیریی ئیسلامی پەروەردە بووە و خەلیفەی موسڵمانەکانە. پێشکەوتن لای ئەو هێورییە، واتا مام ناوەنجی بوون لە جێبەجیٚکردنی زانستەکانی تەکنیکی و پیشەسازییە ئەوروپییەکاندا، سولٚتان لەگەڵ پێشکەوتن بوو و دژی نەبوو، هەر پێشکەوتنێکی تەکنۆلۆجی لە ڕۆژئاوا رووی بدایە و دەوڵەتی پێویستی پێی هەبوایە سولٚتان وەری دەگرت و حەزی لە زانستە گرنگە نوێیەکان بوو. ئەو نوێیانەش بەجاریٚ نەیدەویست بەڵکو بەرەبەر، هەروەك دەڵیٚ: "ئەو قسەیە ڕاست نیە کە دەڵیٚ من دژی

هەموو نوێخوازیەکم کە لە ئەوروپاوە دێ. بەڵام پەلەکردن لـە شـەیتانەوەیە و هێـوری و مام ناوەندی بەرامبەر پەلەکردنە، پێویستە ئەوە لەبەرچاومان بگریـن کـە خـوا فـەزڵی بەسەرماندا کردووە، ئیسلام دژی پێشکەوتن نییە، بەڵام کاروباری پوختە دەبێ سروشتی بێ و لەناوەوە هەڵقوڵێ و بەپێی پێویسـت بێـت و ئەگـەر لـە دەرەوەڕا موتربـە بکرێـت سەرکەوتوو نابێت.".

## =وەستان دژی پێشکەوتنی زانستی هەڵەیە:

سوڵتان باوەڕی بە نرخی پەرەسەندنی زانستی هەبوو لـە ژیـانی گـەلاندا و دژی ئـەم پەرەسەندنە زانستیە نەبوو، بەڵکو هانی دەدا ئەگەر کاریگەریی بەسەر لایەنی رامیـاری و کۆمەڵایەتی و ئاکاریی دەوڵـەت نەبوایـە. لەسـەر حسـێبی تایبـەتیی خـۆی نوێـترین کۆلیژی پزیشکیی بنیاتنا لەدوای کۆلیژی پزیشکی لـە ڤیـەننا. نمونەیـەکی تریـش لـەم بارەیەوە هەیە:

لە سـاڵی ١٨٩٢ع نەخۆشـیی رشـانەوە لـە ئەسـتەنبوڵ بڵاوبوویـەوە، سـەرەتا ئـەم نەخۆشیە لە ئەزمیر بڵاوبوویەوە، کە لە میسرەوە هاتبوو، لە ئەزمیرەوەش بەرەو ئەنادۆڵ تەشەنەی کـرد. پزیشـکە عوسمانیـەکان سـەریان سـوڕما لـە چارەسـەرکردنی، سـوڵتان فەرمانی دا کە هەندێ ئاو بنێرنە لای کیمیاگەرەکان و شـیی بکەنـەوە، کیمیاگـەرەکان بۆچوونی جیایان هەبوو. سوڵتان بڕیاری دا کە پەیوەندی بە (پاستێر)ی زانا بکـا و داوای لێبکا کە نەخۆشیەکە دەستنیشـان بکـات، (پاسـتێر) ئەمـەی پـێ خۆشـبوو، سـوڵتان پارمەتییەکی مالیی بۆ نارد کە لە باسەکانیدا خەرجی بکات. هەرکـە (باسـتێر) داوای سـوڵتانی گەیشـتێ یاریدەرەکـەی خـۆی (شـانتایز) نـاردە ئەسـتەنبوڵ چارەسـەریی نەخۆشیەکەی کرد و چەند راسپاردەیەکی بەجێهێشت، سوڵتان فەرمانی جێبـەجێکردنی راسپاردەکانی‌دا.

سوڵتان عبدالحمید بەرێگـەی تایبـەتیی خـۆی سـوودی لـە زانسـتەکانی رۆژئـاوایی وەرگرت لە هەموو بوارەکاندا، بەتایبەتی ئەو بوارانەی، کـە پێویسـتیان بـە پسـپۆڕێتی ئەوروپا هەیە و لەم ڕوانگەیەوە گەلێ کۆلیژی زانستی دامەزراند.

## = چەمکی نوێکردنەوەی دەوڵەت و جێبەجێکردنی:

عبدالحمید وای بۆ دەچێ کە وەرنەگرتنی زانستە نوێیەکان یەکێکە لە هۆیەکانی دواکەوتنی دەوڵەتی عوسمانی. سوڵتان سوودی لەم بیرۆکەیە وەرگرت و دەوڵەتی عوسمانیی نوێکردەوە دوای ئەوەی کە زۆر دواکەوتوو بوو، نوێکردنەوەکەش لەم دوو بوارانەدا بوو:

١/ **بواری شارستانی:** کۆلیژی پزیشکی لەسەرنوێترین شێواز و کۆلیژی زانستەکان و کۆلیژی زانستە رامیاریەکان و ئەکادیمیای هونەرەجوانەکان و چەند قوتابخانەیەکی باڵا بۆ بازرگانی و کشتوکاڵ و ئاژەڵناسی و دارستان و کانزا و بازرگانیی دەریایی کردەوە. هەروەها سوودی لە ئەوروپا وەرگرت لە بواری فێرکردنی کەڕ و لاڵ و نابینایان، لەم رووەوە قوتابخانەیەکی کردەوە. هەروەها چەند نێردراوێکی زانستی بۆ ئەڵمانیا و فەڕەنسا نارد.

٢/ **نوێکردنەوەی سوپا:** لە ڕوداوە سەربازییەکان دەرکەوت کە کەشتیەوانیی عوسمانی لەگەڵ زۆرییەکەی کاریگەر نەبوو. بەگشتی دەریاوانەکانی ئینگلیز بوون. واتا کەشتیی دەوڵەت لەژێر دەستی دوژمنی بوو. سوڵتان عبدالحمید بەمجۆرە لە سوڵتانی پێشووی وەرگرتبوو. هەر کە ویستی دەریاوانە ئینگلیزەکان بگۆڕێ باڵیۆزخانەی ئینگلیزی لە ئەستەنبوڵ نارەزایی دەربڕی. بۆیە سوڵتان عبدالحمید وای دانا کە کەشتیەوانیی نیە و لە یاداشتەکانی چەند هۆکارێکی تری باسکردووە.

بەڵام لەبەرامبەر ئەمە بەخێرایی سوپای بەچەکی نوێ چەکدار کرد و هەرچی گونجاو بوو لە کەشتی و هونەرەکانی جەنگی ئامادە کرد و ئەفسەری گەورەی ئەڵمانی (فاندر غولتز)ی بانگ کردە ئەستەنبوڵ. ئەوەی شایانی گوتنە سوڵتان حەزی لە نوێکردنەوەی سوپا بوو، بەڵام چاوی لە کاتێکی گونجاو بوو، کە لە باروزروفێکی چاکتر ئەنجامی بدات.[1]

---

١ محمد حرب، العثمانيون في التاريخ والحضارة، ص٥٤ والمذكرات صفحات ٢٠، ٨٨، ٩٧، ٤٦، ٤٠، ٤١، ٢٥، ٢٨، ٣٩، ١٢٥، ٣٨، ٣٦، ٣٥.

## دووەم: لەسەر ئاستی باوەڕ لە هەردوو لایەنی ژیاری و رامیاری:

### = ئیسلام و مەسیحیەت لەتاکە ژیارێکدا کۆناکرێنەوە:

سوڵتان عبدالحمید رای وایە کە ئیسلام و مەسیحیەت بۆچوونی جیاوازن و ناتوانرێ لە ژیارێ کۆبکرێنەوە. لەبەر ئەوە بیری ئیسلامی جیاوازە لە بیری مەسیحی و کۆمەڵگای ئیسلامی لە کۆمەڵگای مەسیحی جیایە. سوڵتان لەو باوەڕەیە کە ناکرێ بیری ئەوروپی لە جیهانی ئیسلامی ئۆقرە بگرێ، کۆمەڵگەی موسڵمان جیاوازی هۆی هەیە و ئەم جیازوازییەیە، کە وای لە رۆژئاوا کردووە کە بەناوی مەسیحیەت و خاچ جەنگ بنێتەوە بۆ ئەوەی ئیسلام و مانگ سەردانەوێنن. هەر لەبەر ئەمە بوو کە ئەوروپا جەنگی خاچیی دژی دەوڵەتی عوسمانی هەڵگیرساند. کۆمەڵگای ئیسلامی دابەشی سەر چەند کۆمەڵە رەگەز و زمان بووە، بۆیە دەبی کۆمەڵگای موسڵمان ئاڵای ئیسلام بەرزکاتەوە تا رەگەزە جیاوازەکانی یەك بگرن و بتوانن بەرامبەر تەوژمە سەربازی و هزرییەکان خۆبگرن. سوڵتان عبدالحمید لەو باوەڕەدایە، کە بەرەی ئیسلامی هەر تەنیا موسڵمانەکانی دەوڵەتی عوسمانی ناگرێتەوە بەڵکو هەموو موسڵمانان دەگرێتەوە.

### = ئیسلام تاکە هێزێکە کە بەهێزمان دەکات:

سوڵتان عبدالحمید لەو باوەڕەیە کە موسڵمانانی جیهان درێژبوونەوەیەکی سروشتی موسڵمانەکانی دەوڵەتی عوسمانین. گەلێ مەترسیی ناوەوە و دەرەوە هەن، کە هەڕەشە لە ئیسلام دەکەن، بۆیە دەبێ ئیسلام بە موسڵمانەکانی بەهێز بێت. لە دیدی سوڵتانەوە "ئیسلام تاکە هێزێکە کە بەهێزمان دەکات، ئێمە میللەتێکی زیندوو و بەهێزین بەمەرجێ لەگەڵ ئایینەکەمان راستگۆ بین. بێگومان ئێمە پێویستیمان بە باوەڕێکی راست هەیە بە گەورەیی خوا.". مادام ئیسلام خاوەن ئەدگاری خۆیەتی-بۆیە بە بیروبۆچوونی سوڵتان- پێویستە بەقا(ثقة) لە یەکێتیی جیهانی ئیسلامیدا هەبێ و موسڵمانەکان لە هەموو شوێنێ پەیوەندییان بە یەکەوە پتەو بێت "رۆژێ دادێ کە موسڵمانەکان ببنە یەك و وەك تاکە کەسێ راپەڕن و هەستن و ملی گاوران ورد وخاش

بکەن." مەبەستی لە گاورەکان جیهانی ڕۆژئاوای بۆچوون جیاوازە.[1]

## = دوژمنکاریی ماسۆنیەکان:

هەرکە سوڵتان عبدالحمید هاتە سەر عەرش، ئەو ڕۆشنبیرانەی کە لە کارگێڕی و ڕاگەیاندن دەسەڵاتدار بوون ئەندامی کۆمەڵەی ماسۆنی بوون بە تایبەتی لە کۆمەڵەی (سر)، کە ئەرمەنیەکان لە ساڵی ١٨٦١ لە ئەستەنبوڵ دایانمەزراندبوو. ئەم تاخمە دەسەڵاتدارە ئەمانە بوون: سەرۆکی وەزیران (مەدحەت پاشا)، سەرۆکی یەکەم ئەنجومەنی نوێنەرایەتیی عوسمانی (مجلس المبعوثان) ئەحمەد پاشا، خیرالدین پاشای تونسی، لووتکەی ڕۆژنامەنووسانی سەردەمی خۆی (نامق کمال وضیا پاشا و ابراهیم شناسی). ئەوەی شایانی باسە گروپی (سر)ی ئەرمەنی شوێنکەوتووی گروپی ماسۆنیی گەورەی فەرەنسا بوو.

وشەی (سر) لە زمانی ئەرمەنیدا بە واتای خۆشەویستی دێت، یەکەم مامۆستای گەورەترین (سر) موحسین خانی باڵیۆزی ئێران بوو لە ئەستەنبوڵ.

ماسۆنیەکان دژایەتیی سوڵتان عبدالحمیدیان دەکرد و دەیانویست کودەتایەك لەسەر عوسمانیەکان بکەن لەو وڵاتەدا و بە تەمای یاسایەکی نوێنەرایەتی بوون کە بەلای سوڵتانەوە هێشتا کاتی نەهاتبوو. هەروەها بە تەمای دامەزراندنی یاسایەکی ئەورووپیی نوێ بوون کە شوێنی عوسمانیەکان بگرێتەوە.

کۆمەڵەی (ریزورتای مەقدۆنی) و کۆمەڵەی (فریتاس)-کە لە سلانیك بوون- ڕۆڵێکی گرنگیان لە ڕووخاندنی دەسەڵاتی عبدالحمید هەبوو.

سەرۆکە دیارەکانی (اتحاد وترقی) ئەندام بوون لە کۆمەڵە ماسۆنیەکان و هەموویان دژی سوڵتان عبدالحمید بوون: تەلعەت پاشا و مەدحەت شوکری بەلدا و کازم پاشا و منیاس زادە ڕەفیق و عەمانۆئیل قراسوو و جەمال پاشا و ئیسماعیل جانبولات. هەموو ئەوانە لە کۆمەڵەی (فریتاس)ی ماسۆنی ئەندام بوون.

* * *

١ محمد حرب، المرجع السابق: ص٦٣ ونجيب فاضل /٢٧٦ والمذكرات صفحات ٢١-١٣، ٨، ٦٦، ٦٧.

سوڵتان عبدالحمید دەڵێ: ماسۆنیی جیهانی زۆر بە توندی دژی بوون، بە تایبەتی لەوکاتەی کە سوڵتان ڕووبەڕوویان وەستا و مەدحەت پاشای سەرۆك وەزیرانی لە وڵات دوور خستەوە. سوڵتان لەو باوەڕەدایە کە "ئینگلتەرا لە ڕێگەی ماسۆنیەکانەوە هەمیشە خەریکی ئاژاوەنانەوە بووە.". لە دیدی ئەو "بیری ماسۆنی ئاڕاستەیەکی عەلمانیی هەیە و لەگەڵ پێکهاتەی دەوڵەتی ئیسلامی و بیری ئیسلامی ناشێت."، بۆ ئەمە دوو نموونە دێنێتەوە؛ "دامەزراندنی والی لە کەمینەکان لەو ویلایەتانەی کە زۆربەیان موسڵمانن."، ئەم بیرۆکەیەش لە داهێنانی ئەو وەزیرانەیەتی کە سەر بە ماسۆنین. هەروەها "وەرگرتنی قوتابیە مەسیحیەکان لە قوتابخانەی جەنگی کە کۆڵەگەی سوپایە.".[1]

## = جوولەکە، فەڵەستین، قودس:

هەر کە بارۆنی جوولەکە (هیرش) مرد، رایسپارد کە ٢٥٠ ملیۆن فرەنگ بۆ دروستکردنی نیشتمانی جوولەکە بێت. ئەو کاتە جوولەکە لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات و ڕوسیا دەربەدەر بوون. بەلای (هیرش)ەوە ئەرجەنتین شوێنی ئەو نیشتمانە بوو، چونکە لە هەموو لایەکی جیهانەوە کۆچکردووەکانی وەردەگرت. کۆمەڵەیەك بۆ راسپاردەکەی (هیرش) پێکهات، ئەم کۆمەڵەیە ئەرجەنتینی بە شوێنێکی شیاو نەزانی بە تایبەتی هەرکە (تیۆدۆر هرتزل) هاتە ناو کێشەکەوە ئەرجەنتین بە تەواوی دوور خرایەوە، بەجۆرە کێشەکە لە چوارچێوەی دروستکردنی نیشتمانێك بۆ جولەکە ڕۆژهەڵاتیەکان نەمایەوە، بەڵکو باسی نیشتمانێ دەکرا بۆ هەموو جووی جیهان. پێشنیاز کرا کە فەڵەستین ببێتە سەنتەر(مرکز)ی ئەو نیشتمانە، لەم بۆچونەوە جولەکەکان چوونە لای سوڵتان عبدالحمید- چونکە فەڵەستین بەشێك بوو لە دەوڵەتی عوسمانی- داوایان لێکرد کە ڕێگابدات نیشتمانێ بۆ جوولەکە لە (قودس) دابمەزرێت، (ڕۆتشیلد) لەپشت ئەم جوڵانەوەیە بوو.

بنچینەی داوایەکە: دەوڵەتی عوسمانی لە هەر شوێنێ دەیەوێ ڕێگا بە جوولەکەکان بدات کە چەند نیشتەجێیەك لە فەڵەستین دابمەزرێنن، ئەگەر دەوڵەتی عوسمانی بیەوێ با موسڵمانەکانیش لەو شوێنانە نیشتەجێ بن و ئەو جوولەکانەی لە وڵاتە بێگانەکانەوە دێن پەیڕەویی یاسا و دەستوورەکانی دەوڵەتی عوسمانی دەکەن. بەرامبەر ئەمەش

١ الهامی سوی صال، الماسونیه والماسونیون فی العالم وفی ترکیا، ص٢٠٩، ٦٩، ٤٤.

جوولەکەکان یارمەتیی عوسمانیەکان دەدەن لە سووك کردنی وامـەکانیان و لـەم بـوارەدا بەڵێن و دەستەبەری نووسراو پێشکەش دەکەن.[1]

جوولەکەکان بە درێژی ئەم کێشەیان بۆ سولتان عبدالحمید باسـکرد و سـولتان ڕەدی کردنەوە و ڕەدکردنەوەکەی بەمجۆرە شیکردەوە: "فەلەستین لـە بنچینـەدا گـەلێ شـوێنی پیرۆزی تێدایە و خاکی چاوتێبڕین و مەبەسـتە ڕامیاریەکانـە، هـەموو سـاڵێ دەوڵـەتی عوسمانی تووشی کۆمەڵە کێشەیەك دەبێت لە ئەنجامی جیـاوازیی بۆنـە و ئاهەنگـەکانی کەنیسە. ئەگەر کێشەی جوولەکەشم خسـتە سـەر، ئـەم دوو کێشـەیە ئـەوا ئەنجامەکـە ئاشکرایە. بۆیە سولتان داوایەکەی ڕەدکردەوە و نوێنەری جولەکەی سەهیۆنیی نەمساوی گەڕایەوە وڵاتی خۆی."، لێرەدا مەبەست (هرتزل)ە.

عەقید (حسام الدین ارتورك) دەڵـێ: "هرتـزل و گـەورەی حاخامـەکان داوای خۆیـان پێشکەشـی سـولتان دەکـەن و ئاماژەیـان بـەوەکرد، کـە جوولەکـە لـە بـیری ئـــەوەن ئیسرائیلێکی سەربەخۆ لە (قودس) دابمەزرێنن، سولتان عبدالحمیـد خـۆی پـێ نـەگیرا و هەردوکیانی دەرکرد.".[2]

لە وتارێکی (محرم فوزی طوغای) کە لە ڕۆژنامەی تورکـی (بویـوك ضوغـو) لـە ٢ی مایۆی ١٩٤٧ بڵاوبۆتەوە لەژێر ناونیشانی (فلسطین والمسألة الیهودیة) هاتووە: "سولتان عبدالحمید نەیهێشت دەوڵەتێکی جوولەکە لە فەلەستین دابمـەزرێ، ئـەم قەدەغەکردنـەش بەگران لەسەری وەستا و عەرشەکەی لەناو برد و لـە ئـەنجامدا دەوڵـەتی عوسمـانی پـێ ڕووخـا."، هەرچـەندە دەیزانـی-هـەروەك- (نظـام الدیـن تپـە دنلـی اوغلـوا) لـە لێکۆڵینەوەکەی لەبارەی ڕۆڵی جولەکە لە تێکدانی دەوڵـەتی عوسمـانی گوتویـەتی: کـە "جولەکە گەلێ هێزیان لەبەر دەستدایە کـە دەتوانـن لـە کـارە ڕێکـەکانیان سـەرکەون، سامانیان هەیە و پەیوەندییە بازرگانیە نێودەوڵەتیـەکانیان لـەژێر دەسـتدایە، هـەروەها خاوەنی ڕۆژنامەکانی ئەورووپی و کۆمەڵە ماسۆنیەکانن.".

لەگەڵ ئەمەش سولتان عبدالحمید دوو فەرمانی دەرکـرد، یەکـەم لـە ٢٧ی یۆنیـۆی

---

١ محمد الحرب/ المصدر السابق.

٢ مفتي أوغلو، ص٢٤٧ عن العقيد حسام الدين ارتورك، خفايا عهدين، استانبول ١٩٥٧.

۱۸۹۰ و ئەویتر لە ۷ی یۆلیۆی ۱۸۹۰. لە یەکەمدا "جوولەکەی لە چوارچێوەی وڵاتی خۆی وەرنەگرت."، ئەویتر "پێویستە ئەنجومەنی وەزیران لە لقەکانی کێشەکە بکۆڵێتەوە و بڕیاری بنبڕی لەسەر بدات.".

دەتوانرێ بیروبۆچوونی سوڵتان عبدالحمید لەم خاڵانەی خوارەوەدا بنووسرێت:

١/ "ناتوانم فەڵەستین بفرۆشم گەر بستێکیش بێت لێی، خاکی فەڵەستین خاکی من نییە. خاکی میللەتە. با جوولەکەکان ملیۆنەکانیان بپارێزن. ئەوانە دەتوانن بێ‌بەرامبەر دەست بەسەر فەڵەستین دا بگرن تەنیا لە حاڵەتێکدا کە دەوڵەتی عوسمانی نەمێنێ.".

٢/ "ئەو خاکەی کە جوولەکە ئارەزوویان هەیە دەوڵەتی ئیسرائیلی سەربەخۆی لەسەر دابمەزرێنن لە سنوری سنجقی قودسی عوسمانیە. لەو شوێنەش چەند کێڵگەیەکی سوڵتانی هەیە کە تایبەتی گەنجینەی تایبەتییە. یەکەمجار جوولەکەکان داوایان کردووە کە ئەم کێڵگانە بکڕن، پاشان پێشنیازیان کرد کە ۹۹ ساڵ بەکرێی بگرن!.".

٣/ "سەهیۆنیزمەکان دەیانەوێ دەوڵەتی خۆیان دامەزرێنن و نوێنەری رامیاریی خۆیان هەڵبژێرن. من چاك لە بۆچوونە تەماحخوازییەکانیان دەگەم.. هرتزل خاکێکی بۆ برا هاوئایینەکانی دەوێ، بەڵام زیرەکی بەس نییە بۆ حەلکردنی هەموو کێشەیەك.".

٤/ "بۆچی قودس؟! قودس لە هەموو کاتێ خاکمانە و هەرواش دەمێنێتەوە و یەکێکە لە شارە پیرۆزەکانمان و لە خاکی ئیسلامدایە، دەبێ قودس هەر بۆ ئێمە بێت.".

٥/ "ئەگەر کردەی نیشتەجێکردنی جوولەکە لە فەڵەستین نەوەستێ و ڕانەگیرێ، ئیمزای مردنی خۆمان دەکەین لەسەر برایانی ئایینمان." -مەبەستی فەڵەستینیەکانە-.

٦/ ئەگەر ڕێگە بدرێتە جوولەکە لە فەڵەستین نیشتەجێ بن "ئەوا لە ماوەیەکی کەمدا دەتوانن هۆکارەکانی هێز بخەنە دەستیان لەو شوێنەی کە لێی نیشتەجێ دەبن.".[1]

* * *

١ مفتي أوغلوا: ص٢٤٩.

بیرکردنەوەی سوڵتان عبدالحمید بەم شێوەیە وای لە (هرتزل) کرد، کە نائومێد بێ لەوەی کە بتوانێ مەبەستی جوولەکەکان لە فەڵەستین بێنێتە دی، ئەگەر سوڵتان عبدالحمید خاوەن دەسەڵات بێ لە دەوڵەتی عوسمانیدا.[1]

## = سۆفیگەری:

سۆفی و دەست و پێوەندەکانیان لە وڵاتی عوسمانی بەچاوی گومان و دوودڵییەوە سەیری ئەو سوڵتانە عوسمانیانەیان دەکرد، کە بەرەو سەمت(اتجاه)ی نوێخوازیی ڕۆژئاوایی چووبوون، بەتایبەتی سوڵتان مەحمودی دووەم کە سوپایەکی نوێی لەسەر شێوازی ڕۆژئاوایی بنیات نابوو و گروپی (ئینکشاری) و تەکیەی ڕێبازی (بەکتاشیی) لەناوبردبوو، هەرچەندە ڕێبازی بەکتاشیی لەنێوان گەلی عوسمانیدا زۆر بەرەو کزی چووبوو.

دوایی بانگخوازانی نوێخوازی و هزر لە دامەزراوە میرییەکاندا -ئەمانە کۆمەڵەی عوسمانیە نوێیەکانن- توانییان بەهۆی بانگەشە و دەسەڵات و پیاوەکانیان لە ناوەندە میرییەکان دەست بەسەر هەست و بۆچوونی قوتابیی قوتابخانەکان و پەیمانگە ئایینیەکاندا بگرن، بە ڕادەیەکی وا (مەدحەت پاشا) هانی دەدان کە دژی سوڵتانی دەوڵەت خۆپیشاندان ئەنجام بدەن. لە حەفتاکانی سەدەی نۆزدەی عیسایی قوتابخانە ئایینیەکان لایەنگری نوێخوازیی ڕۆژئاوایی بوون، بەڵام سۆفیەکان لەمە دوور بوون و بە مەترسیەوە سەیریان دەکرد، قوتابیی قوتابخانەکان لە کێشەیەکی هەمیشەیی نادیار بوون لەگەڵ سۆفیەکان.

لەبەر ئەوە سۆفیەکان-بێ ڕێك کەوتنی پێشتر- لەگەڵ سوڵتان عبدالحمید بوون کە زۆر خۆی لە عوسمانییە نوێیەکان دەپاراست کە دوژمنی بوون. هەروەها خۆی لە دەست و پێوەندیشیان دەپاراست. لەو سەردەمەدا ڕێبازی (قادری) لە هەموو ڕێبازەکانی تر زێتر بڵاوبوو بوویەوە، هەروەها ڕێبازی (روفاعی)ش باوبوو. هەردوو ڕێبازی (شازلی) و (نەقشبەندی) لەناو حاکمە سونیەکان باوبوو. هەروەها ڕێبازی مەدەنی هۆکارێکی

---

١ المذكرات ص١١-١٢.

رامیاریی گرنگ بوو لە لیبیا و سەرووی ئەفریقیا.

سوڵتان عبدالحمیدی دووەم ئەوەی لە حسێبی خۆی دانابوو کە ئەم ڕێبازانە چەقێکی رامیاریی گرنگن لە ڕووی بانگەشە و بڵاوبوونەوەدا، بۆیە ڕێزی زاهیدەکانی ئەم ڕێبازە سۆفیگەرییانەی دەگرت.[1]

## = کۆیلەتی:

لەو دەمەتەقێیانەی کە خاوەن بیرە ئەورووپییەکان سازیان دەدا لەبارەی کۆیلایەتییەوە، سوڵتان عبدالحمید دەڵێ: "کۆیلایەتی لە قورئان و شەریعەتی ئیسلامی دەستەبەر کراوە، شەرع داوا دەکا زۆر بە نەرمی هەڵس و کەوت لەگەڵ کۆیلەدا بکرێ، شەرعی ئیسلامی کۆیلە لە هەموو هەڵس وکەوتێکی خراپ دەپارێزێ. دەمێنێتەوە ئەوە بگوترێ کە جاریە لای ئێمە لەژیانیدا زۆر بەختەوەرترە لە خزمەتکاری ئەورووپی، زۆرجاران جاریە لای ئێمە دەبێتە ژنی پاشا و وەزیر و سەرکردە. کۆیلەی ژن لای ئێمە دەبێتە ژنی پیاوماقووڵان هەروەك چۆن کۆیلەی پیاو لای ئێمە دەبێتە گەورە و سەرکردە و دەگاتە لووتکەی کۆمەڵگا.".[2]

## سێیەم: لەسەر ئاستی عوسمانیدا:

## = تەشەنەکردنی دەسەڵاتی بێگانە لە دەوڵەتدا:

لەسەرەتای فەرمانڕەواییکردنی سوڵتان عبدالحمیددا، تەشەنەکردنی دەسەڵاتی بێگانە لە دەوڵەتی عوسمانیدا گەیشتە لووتکە، بەتایبەتی مافی دەوڵەتە رۆژئاواییەکان لە پارێزگاریکردنی دیانەکانی دەوڵەتدا و ئەمەش کرایە بیانوویێ بۆ دەست تێوەردان لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەت. سوڵتان سەلیمی سێیەمی باپیری سوڵتان عبدالحمید وای بۆ دەچوو کە "دەستی بێگانەکان لەسەر جەرگی سەیران دەکەن."، ئەمەش کینایەیە لەو دڵتەنگیەی کە تووشی بووبوو بەهۆی

---

١ مذكرات علی سعيد، ذكرياتي في القصر، حياة السلطان عبدالحميد، استانبول ١٣٣٨ ص٣٣ ونجيب فاضل ٣٤٠ ومذكرات الأميرة عائشة ص٢٥.

٢ ضيا قارال، المرجع السابق، ص٢٥٢.

دەستتێوەردانی بێگانەکان لە کاروبــاری دەوڵـەتدا. عبدالحمیـد کێشـەکە گـەورەتر دەبینێ و بەمجۆرە رای خۆی دەردەبڕێ "هەروەها منیــش هەست بـە دەستی ئـەو بێگانانە دەکەم نەك هەر لەسەر جەرگم، بەڵکو لەناو جەرگم.". چونکە ئەم دەسـت تێوەردانە لە سیاسەتی دەرەوەی رەتداوە و بـەرەو سیاسـەتی نـاوەخۆ چووە، ئـەو بێگانانە ماوەیەکی زۆرە لەپێش سەردەمی عبدالحمید و لەکاتی دەســەڵاتداریەکەی هەروەك سوڵتان خۆی دەڵێ: "سەرۆك وەزیرەکان دەکـڕن و دژی وڵاتەکـەم بـەکاریان دێنن.".

دەست تێوەردانی بێگانە لە دامەزراوەکانی دەوڵـەتی عوسمـانی ئـەو کاتـە گەیشـتە لوتکە، هەر کە دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان دەستیان خستە ناو دەستی کۆمەڵــە گروپێکـی ماسۆنیی ناو دەوڵەتی عوسمانی و توانییان ژمارەیــەکی زۆر لـە فەرمانبـەرە گـەورەکان بخەنە پاڵ خۆیان، هەروەها هەندێ ئەفسەری گـەنجیش لـە سـوپادا، بـۆ لادانـی سـوڵتان عبدالحمید لەسەر دەسەڵات.[1]

## - پەلهاویشتنی هزری نەتەوەیی لە دامەزراوە ڕەسمیەکاندا:

پەیدابوونی هزری نەتەوەیی لەگەڵ شۆڕشی فەڕەنسـی و بڵاوبونـەوەی لـە جیـهاندا، دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی لێکەوتەوە، ئەمەش لەگەڵ پێکهاتەی دەوڵەتی عوسمانی ناگونجێت کە دەوڵەتێکی ئیسلامیە و گەلیّ ڕەگەز لەژێر ئاڵاکەیدا کۆبۆتەوە.

پەلهاویشـتنی ئـەم هـزرە لـەنێو ریـزی گەنجـە رۆشـنبیرەکانی عوسمـانی لەڕێگـــەی نێردراوەکان بۆ ئەوروپا و وەرگێڕان و ڕۆژنامە و کتێبە ئەدەبیەکانەوە بوو. چونکـە ئـەم گەنجانە دوای ماوەیەك شوێنی خۆیان لە دامەزراوە گرنگەکانی دەوڵەت کردەوە.

هزری نەتەوەیی کە شوێنی خۆی لە مێشك و هزری لێپرسراوەکان گـرت تـەنگی بـە سـوڵتان هـەڵچنی و ڕوبـەرێکی زۆری لـە مێشـکی داگـرت. سـوڵتان بـە ئاشـکرا لـە ناکۆکیەکەی لەگەڵ مەدحەت پاشادا ئەمەی دەربڕی و گوتی: "مەدحەت پاشا کە والیـی عوسمانی بوو لە بەلقان هانی زمانی بولگاری دەدا لە قوتابخانە بولگاریەکان و پابـەندبوو

---

١ المذكرات ص٧٥.

پێی.".

(رضا نور) لە یاداشتەکانیدا دەڵێ: "مەدحەت پاشا لەو کاتەی والیی شام بوو هانی دامەزراندنی دەسەڵاتێکی ئەمەویی لە شام دەدا.".

سوڵتان عبدالحمید لە بڵاوبوونەوەی هزری نەتەوەیی لە دەوڵەتی عوسمانی بێزار بوو، بەشێوەیەکی وا مەدحەت پاشا لای سەیر نەبوو کە خاچ لەسەر ئاڵای عوسمانیی مانگدار دابنێ لەو شوێنە دیانانەی کە عوسمانی فەرمانڕەوایی دەکرد.

چەسپاندنی هزری نەتەوەیی لەناو دەوڵەتی عوسمانی-هەرچەند سوڵتان پێی ناخۆش بوو- وای لە شۆڕشگێڕەکان کرد، کە پێ لەسەر کێشە نەتەوەییەکان دابگرن و دژی عوسمانی بوەستن، هەروەکو ئەرمەنەکان-بەیاریدەی دەوڵەتە بێگانەکان- داوایان دەکرد کە پارچەیەك لە خاکی دەوڵەتی عوسمانی دابڕن و دەوڵەتێکی ئەرمەنیی نەتەوەیی لەسەر دابمەزرێنن.

سوڵتان عبدالحمید بەمجۆرە لەو بارەیەوە دەدوێ:

"لام سەیر و سەمەرە نەبوو کە ئەرمەنەکان لە خولیای سەربەخۆیی دابوون، چونکە دەوڵەتە گەورەکان بەردەوام هانیان دەدان، بەڵام سەرم سوڕ دەمێنێ، کە هەندێ لە ئەندامەکانی (ترکیا الفتاە) ئەوانەی هەڵاتبوونە ئەوروپا و چەند ڕۆژنامەیەکیان دژم دەرکردبوو، یارمەتیی ڕێکخراو و کۆمەڵەی ئەرمەنیەکانیان دەدا و دەیانگوت: ئەوانە دەیانەوێ دەوڵەتی عوسمانی لە لەتبوون رزگار بکەن، ئنجا یارمەتی ئەوانەیان دەدا، کە لە پارچەکردنی دەوڵەت دا بوون و پەیمانیان لەگەڵ دەبەستن."

## = بیری دەستووری و دوا ئەنجامەکەی:

سوڵتان عبدالحمید دژی دیموکراسی و فەرمانڕەوایی دەستووری بوو، کە لە زاراوەی عوسمانی بە (المشروطیة) ناسرابو، واتا مەرج دانان لەسەر دادوەر و سنوردارکردنی دەسەڵاتی، چونکە بە هزرێکی هاوردەی حسێب دەکرد. هەروەها دژی ئەوانەش بوو کە بانگەشەی فەرمانڕەوایی دەستوورییان دەکرد و سەرکردەکەیان مەدحەت پاشا بوو.

سوڵتان بەم شێوەیە ڕەخنە لە وەزیرەکەی دەگرێ "تەنیا سوودەکانی فەرمانڕەوایی

دەستووریی بینیوە لە ئەورووپا، بەڵام لـە هۆیـەکانی دەسـتوری و کاریگەریـەکانی تـری نەکۆڵیوەتەوە. حەبی (سـلفات) بـۆ هـەموو نەخۆشـی و هـەموو لەشـێ نابـێ. وابـزانم بنەماکانی دەستوری بۆ هەموو گەل و پێکهاتەیەکی نەتـەوەیی نـاگونجێت. وام دەزانـی دەستووری سوودبەخشە، بەڵام ئێستا قەناعەتم هەیە کە زیان بەخشە.".

سوڵتان لەم بارەیەوە بیانووی خۆی هەبوو، لەوانە خراپیی هـەڵس وکـەوتی ئەوانـەی داوای دەستوورییان دەکرد هەر لە یەکەم وەڵامدانەوەی سوڵتان بۆ ڕاوبۆچوونەکانیان. لەو هەڵس وکەوتانەش؛ هەرکە سوڵتان دەستووری ڕاگەیاند مـیری داوای لێکـرد کـە چـەند بڕیارێ مۆر بکات، لەوانە: دامەزراندنی چەند والییەکی دیان لەسەر ئەو ناوچانـەی کـە زۆربەیان موسڵمانن، وەرگرتنی چەند قوتابیەکی دیان لە کۆلیژی جەنگیی عوسمـانی کـە کۆڵەگەی سوپای عوسمانی بوو، سوڵتان ئەمانەی مۆر نەکرد. یەکسەر مەدحەت پاشا کە وەزیر بوو بە سوڵتانی گوت: "مەبەسـتمان لـە ڕاگـەیاندنی دەسـتوور کۆتـایی هێنـانی تاکڕەویی کۆشکە، پێویستە بەڕێزتان ئەرکەکانتان بزانن.".

لە یەکێ لەو هۆیانەی کە سوڵتان عبدالحمید هزری دەستووریی ڕەدکردۆتەوە ئەمەیـە کە دەڵێ: "دەوڵەتی عوسمانی کۆمـەڵێ گـەل و نەتـەوەی کۆکردۆتـەوە، دەسـتووری لـە دەوڵەتێکی وادا مردنە بۆ ڕەگەزی ئەسڵی لەو وڵاتە، ئایـا پەرلـەمانی ئینگلـیزی تاکـە نوێنەرێکی هیندی تێدایە؟ ئایا لە پەرلـەمانی فەڕەنسـی تاکـە نوێنـەرێکی جـەزائیری تێدایە؟.".

سـوڵتان هەڵوێسـت و بۆچوونـی بەرامبـەر فـەرمانڕەوایی دەسـتووری نـەگۆڕی لــە دەوڵەتەکەی، تا ئەو کاتەش کە لەسەر عەرش لادرا، دوای ئەو کاریان بە فـەرمانڕەوایی دەستووری دەکرد، سوڵتان زۆر جاران لە سوودەکانی فەرمانڕەوایی دەستوریی دەپرسی و دەیگوت: "کە دەستووری ڕاگەیەنرا چی ڕوویدا؟ ئایا وامـەکانی دەوڵـەت کەمبوویـەوە؟ ئایـا ڕێگـا و بـەندەر و قوتابخانـەکان زۆر بـوون؟ ئایـا یاسـاکانی ئێسـتا ژیرانـە و لۆجیکییانەترە؟ ئایا ئاسایشی کەس بەرپا بوو؟ ئایا میللـەت ئێسـتا خۆشـگوزەرانترن؟ ئایا مردن کەمبۆتـەوە و لـەدایکبوون زیـاد بـووە؟ ئایـا ڕای گشـتیی جیـهانی ئێسـتا لەپێشوو زیاتر لەگەڵمانە؟ دەرمانی چاك گەر لە دەستی پزیشـکان یـا لـە دەسـتی ئـەو

کەسانە نەبوو کە دەزانن بەکاری بهێنن دەبێتە ژەهرێکی کوشندە، مـن زۆر داخـدارم، ڕووداوەکان ڕاستیی گوتەکانمیان نیشان دا.".

بەڵام سوڵتان عبدالحمید جەخت لەسەر ئەوە دەکا کە ئەمـە هەڵوێستی هەمیشـەیی نییە بەرامبەر فەرمانبەریی دەستوری، ئەگەر ئەو باروزروفەی کە حوکمی تێدا دەکرد بگۆڕێ و جیاواز بێ، ئـەوا بۆچوونـەکانی ئـەویش بەرامبـەر فەرمانبـەریی دەستووری جیاواز دەبێ، لەم بارەیەوە دەڵێ: "نابێ وا گومان ببرێ کە هزر و قەناعەتم هەمیشە دژی ئەو حوکمەیە کە لەسەر بنەمای دەستوورییەتە.".[1]

## بزوتنەوەی کردنە دیان(تنصیر) لە دەوڵەتی ئیسلامدا:

بزووتنەوەی کردنە دیانی جیهانی مەبەستی کـارکردن بـوو لـە دەوڵـەتی عوسمـانی، دەوڵەتی عوسمانی بەدوای چالاکیەکانیاندا دەگەڕا و هـەوڵی قەدەغـەکردنیانی دەدا. لـە سەردەمی ڕێکخراوەکان چالاکیی بەدیانکردن بەرەو زێدەبوون دەڕۆیی، دەوڵـەت هـەندێ مافی نوێی دایە.. دیانەکان، نێردراوەکانی بەدیانکردن لەکار و چالاکیی خۆیان بەردەوام بوون، بەتایبەتی لەو ناوچانەی کە دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان پلانی دەست بەسـەرداگرتنیان دادەنا لە ئاییندەدا، بـۆ نمونـە (جزویـتی فەرەنسـیەکان) ئینجیلیـان لـە ئـەلبانیا-کـە پارچەیەك بوو لە دەوڵەتی عوسمانی- وەرگێڕا بەسـەر هـەموو دیالێکتـەکانی[2] زمـانی ئەلبانی و لە هەموو شوێنێك بڵاویان کـردەوە تـا گەیشـتە گوندەکـانیش. نێردراوەکـان پارەشیان دابەش دەکردە سەر خەڵکی ناوچەکان، چەند قوتابخانە و نەخۆشخانەیان کردەوە بۆ خزمەتکردنی مەبەستەکانیان. لە لیبیای عوسمانی نێردراوە ئیتاڵیەکان جـل وبـەرگی شێخەکانی سنووسییان دەپۆشی و ناوی موسڵمانەکانی لیبیایان لەخۆ دەنا بۆ ئەوەی لـە تەڕابلسی ڕۆژئـاوا و (بـەنی غـازی) چـالاکی بنوێنـن. هـەروها ئیتاڵیـەکان نـێردراوی بەدیانکردنیان ناردە ناوچەی کەنارەکانی ئەنادۆڵی باشوور.

دەسەڵاتی عوسمانی لە تەڕابلسی ڕۆژئاوا یەکێکی دەستگیرکرد بە ناوی شێخ (هاشـم العرجاوی) دوای لێکۆڵینەوە لەگەڵیدا دەرکەوت، کە نـێردراوێکی بەدیانکـەر(منصـِّر)ی

---

١ المذکرات: ٢٧، ٥٦، ٤٤، ٥٨، ٩٩.

٢ دیالێکت: شێوەزمان، لهجە.

ئیتالّییە و ناوی ڕاستەقینەی (سـنیۆربونیتر سـلفادورا) و تۆمـارێکی پێیـە و بـە هـەر شوێنێکدا ڕەتبووبێ لەرێگا و گۆماو و گرد و شـوێنێ ئـاوی لیّ بـێ تۆمـاری کـردووە و بەهێڵکاری نەخشەی کێشـاوە. هـەر کـە سـوڵتان عبدالحمیدیـان بـەم ڕووداوە ئاگـادار کردەوە، یەکسەر فەرمانی قەدەغەکردنی چالاکیی ئەو نێردراوانەی دەرکرد.[1]

## = ئـافـرەت:

لە بچووکیدا سولتان عبدالحمید دایکی مرد و باوەژنەکەی پـەروەردەی کـرد و وەکـو دایکی هەڵس وکەوتی لەگەڵ دەکرد.

هەر کە سولتان عبدالحمید هاتە سەر عەرش، باوەژنەکەی لە کۆشکی عوسمانی دا بە دایکی سولتان دانرا، لەچەمکی نوێدا بە واتای شاژن دێت، لە کۆشکی عوسمانی دایکـی سولتانە-نەك ژنی سولتان هەروەك لە دەوڵەتەکانی تـر، لەبـەر ئـەوەی دایکـی سـولتان مردبوو، باوەژنەکەی بە دایکی خۆی دانا، بۆیە ئەم هەموو ڕێزەی لێنـا و وەکـو دایکـی خۆی خۆشی دەویست.

لە دووەم ڕۆژی دانانی عبدالحمید لەسەر عـەرش، سـولتان چـووە لای باوەژنەکـەی و دەستی ماچ کرد و پێی گوت: "بە سۆز و دڵسۆزیت هەستم بە مردنی دایکم نەکرد، تـۆ لەبەر چاوم جیاوازیت لەگەڵ ئەو نیە، تۆم کردە دایکی سولتان، واتا لەم کۆشکەدا گوتـە گوتەی تۆیە، بەڵام تکات لیّدەکەم و مکورم لەسەر ئەم تکایـەم، کـە بـەهیچ شـێوەیێ دەست لە کاروباری دەوڵەت وەرمەدە، بچووك بێ یا گەورە.".

لە دیدگای سولتان عبدالحمید ڕۆڵی ئافرەت لە سنووری ماڵ و پەروەردەدا دەرناچـێ، بۆیە نەیهێشت ژنانی کۆشك دەست لە رامیـاری وەربـدەن لـە نزیـك و دوور، هـەروەها لەهیچ کاروبارێکی دەوڵەت ئافرەت ڕایان نەبوو.

سـولتان عبدالحمیـد گرنگیـی بـە فـێرکردنی ئـافرەت دا و خانـەی مامۆسـتایانی دامەزراند بۆ دابینرکردنی مامۆستایانی کچان.

هەروەها سولتان دژی تێکەڵبوونی ژن و پیا بوو-لە شوێنەکانی دەوڵەت و کۆمەڵگا-

---

١ المذكرات:٢٧، ٥٦، ٤٤، ٥٨، ٩٩.

وەکو کێشەیەکی کۆمەڵایەتی. هەروەها دژی خۆدەرخستن(سفور)ی ئافرەت بوو.

سوڵتان لەو تاوانانەی کە کۆمەڵەی (اتحاد وترقی) تاوانباریان کردووە بەرگری لەخۆی دەکا کە گوایا دژی ژیری و زانستە، لەم بارەیەوە دەڵێ: ((ئەگەر دژی ژیری و زانست بام ئایا زانکۆم دەکردەوە؟ گەر دژی زانست بام ئایا خانەی مامۆستایانم بۆ ئەو کچانە دەکردەوە کە نایانەوێ تێکەڵی پیاوان بن.[1]

لەبارەی هەڵوێستی سوڵتان عبدالحمید و شێوازی بیرکردنەوەی لە کێشەی سفوری ئافرەتان و هاتنی هەندێ ئاکاری رۆژئاوایی بۆ ناو ژنانی عوسمانی دەڵێن: لە سێی ئۆکتۆبەری ١٨٨٣ع ئاگادارکردنەوەیەکی میری لە رۆژنامەکانی ئەستەنبوڵ دەرکەوت، کە ئاراستەی گەل کرابوو و بۆچوونی سوڵتانی تێدا روون کرابوویەوە لەبارەی جل وبەرگی ژنان. ئاگاردارکردنەوەکە دەڵێ: ((هەندێ لەو ژنە عوسمانیانەی کە لە کاتە درەنگەکان دەچنە سەر شەقامەکان، جل و بەرگی دژی شەرع دەپۆشن. سوڵتان بە میریی راگەیاند کە پێویستە ئەم دیاردەیە لەناو ببرێت. هەروەها سوڵتان بە میریی راگەیاند کە پێویستە ئافرەتان بەرەو جل و بەرگی شەرعیی تەواو بگەرێنەوە و گەر چوونە سەر شەقامەکان سەرپۆشیان لەسەر بێ)). لەسەر ئەمە ئەنجومەنی وەزیران کۆبوویەوە و ئەم بریارانەی دا:

١) مۆڵەتی مانگێ دەدرێ و دوایی قەدەغەیە ئافرەتان بێ بەرگی شەرعی لەسەر شەقامەکان برۆن و پێویستە جل وبەرگەکەشی هیچ نەخش و جوانییەکی لەسەر نەبێت.

٢) سەرپۆشی لە قوماشی تەنك دروست کراو قەدەغەیە و دەبێ ئەو سەرپۆشە بەکار بێت کە ئەدگارەکانی دەم وچاوی نیشان نادات.

٣) پێویستە پۆلیس-لەدوایمانگێ لە بلاوکردنەوەی ئەم ئاگادارییە- بەتوندی ئەم بریارانە جێبەجێ بکا و هێزەکانی زەبتیش دەبێ یارمەتیی پۆلیس بدات لەم رووەوە.

٤) سوڵتان بە بریارە میرییەکانی ئەم راگەیاندنەی مۆرکرد و دانی پێدانا.

٥) ئەم راگەیاندنە لە رۆژنامەکان بلاو دەکرێتەوە و لە شەقامەکان هەڵدەواسرێت.

لە رۆژی دوای بلاوکردنەوەی ئەم راگەیاندنە، واتا لە (٤)ی ئۆکتۆبەر، رۆژنامەی

١ المذكرات ص٧٦ ومفتي أوغلوا ص٢٢٤-٢٢٥.

(وَقتْ) کە لە ئەستەنبوڵ دەردەچوو گوتی: ((کۆمەڵگای عوسمانی بەگشتی ئەم بڕیارە بەڕاست دەزانێ و بەسوودمەندی تێدەگات)).[1]

لە دیدگای سوڵتانەوە ژن لەڕووی کارسازی و سەرپەرشتیەوە لەگەڵ پیاو یەکسان نیە)) و لەم بارەیەوە دەڵێ: ((مادامەکێ ئەمە بڕیاری قورئانە، ئیتر کێشەکە بڕاوەتەوە و پێویست بە باسکردنی یەکسانیی ژن و پیاو ناکات)). سوڵتان وادەبینێ کە ((بیرۆکەی ئەم یەکسانیە لە ڕۆژئاواوە هاتووە)).

هەروەها سوڵتان عبدالحمید بەرگری لە ژن زۆر هێنان(تعدد الزوجات) دەکات، لەو کاتەی کە ڕاگەیاندنی عوسمانی دژی ئەم کێشەیە دەدوا، سوڵتان دەڵێت: "بۆچی هەندێ لە ڕۆشنبیرەکان رەخنە لەم کارە دەگرن-واتا ژن زۆر هێنان لە دەوڵەتی عوسمانیدا- بۆچی رەخنە لە شوێنەکانی تر ناگرن جگە لە دەوڵەتی عوسمانی کە ئەم بارەی تێدایە بە تایبەتی لە ئەوروپا و ئەمریکا؟" سوڵتان جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە "بنەمای ژن زۆرهێنان لە ئیسلامدا ڕێی پێدراوە، ئەم رەخنەگرتنە چیە لەسەری؟!"[2]

---

١ موسوعە أتاتورك، ج١ ص٥٩-٦٠.

٢ قارال، المرجع السابق، ص٢٥٢.

# پاری یەکەم

# سیاسەتی ناوەخۆی سوڵتان عبدالحمیدی دووەم

## (کێشەکانی ناوەخۆ و ڕێگەی چارەسەرییان)

## ١/ کزی و سستیی یاسای پەروەردەیی:

یاسای پەروەردە و فێرکردن پێش سوڵتان عبدالحمید تووشی کزی و سستی بووبوو و شان بەشانی دەستکەوتەکانی سەردەم نەدەڕۆیشت. سوڵتان بەجۆرەی بینی و ویستی چاکسازی بخاتە فێرکردنەوە و ئەوەی پێویستی بە پەرەپێدان بێ پەرەی پێ بدا و بەپێی پێویست نوێی بکاتەوە و کۆنە چاکەکەش وەکو خۆی بێڵێتەوە.

سوڵتان عبدالحمید پەرەی بە قوتابخانەی موڵکیی پاشایانی (قوتابخانەی زانستەکانی رامیاری) دا و ژمارەی قوتابیەکانی بووە دوازدە هێندەی پێشوو. پێشتر گرنگی بە زانستەکانی ئابووری و بازرگانی نەدەدرا، سوڵتان قوتابخانەی بازرگانیی حەمیدیی (ئەکادیمیای زانستەکانی ئابووری و بازرگانی) دامەزراند لە ساڵی ١٨٨٣ع بۆ مەبەستی ئامادەکردنی چەند عوسمانییەکی پسپۆڕ لە ئابوری و بازرگانی. قوتابخانەی هونەرە بەنرخە باڵاکانی (ئەکادیمی هونەرەکان) دامەزراند. هەروەها پەرەی بە قوتابخانەی جەنگی (کۆلیژی جەنگی) دا و وای لێکرد لە ناوەوەڕا بریتی بێ لە قوتابخانەی هێزەکانی زەوی و قوتابخانەی هێزەکانی دەریایی و قوتابخانەی ئەندازیاران و قوتابخانەی پزیشکی و هەموو ئەوانە قوتابخانەی باڵا بوون.

بەجۆرە ژمارەی دامەزراوەکانی خوێندنی باڵا گەیشتە (١٨) دامەزراو. هەروەها چەند قوتابخانەیەکی مالی و گومرگ و پۆلیسی کردەوە. ژمارەی قوتابخانەکانی مامۆستایان و سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی زۆر بوون و فەرمانی دا کە پرۆگرامەکانی خوێندن گۆڕانی بەسەردا بێ و لەگەڵ کاروانی پێشکەوتنی جیهانی هەنگاو باوێت. هەروەها ڕێگای دا لە هەموو کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامە و هەموو هۆکارەکانی بڵاوکردنەوە، کە پەیوەستن بە زانست و تەکنیك و هونەرەوە بێنە ناوەوە:

(مەیدانەوە).[1]

## ٢/ یاخیبوونی ئەرمەن:

ئەرمەنەکان-کە بەشێك بوون لە گەلی عوسمانی- کەوتبوونە ژێر کارتێکردنی نێردراوە بەدیانکردنەکانی کاسۆلیکی ئەوروپی و دەستە بەدیانکردنە ئەمریکیەکانی پرۆتستانی. لەو ڕوانگەیەوە هەستی ڕەگەزی و نەتەوەیی و ئایینیان بزووت. ئەرمەنەکان داوایان کرد کە نوێنەرێکی ئەرمەنی لە کۆنگرەی (بەرلین) نوێنەرایەتییان بکات و داوایان کرد کە وەکو دیانەکانی لوبنانی دان بە مافیاندا بنرێت و والییەکی گشتی دیان لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتی دەوڵەت دابمەزرێت، بەمجۆرە ماف و ئاسایشیان دابین دەکرێ دژی (قۆقازی) و کوردەکان کە لە یەك ناوچەدا لەگەڵیان دەژین هەروەك دەڵێن.

دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان لە ساڵی ١٨٨٠ع دەستیان خستە ناو کێشەی ئەرمەنەوە و سوڵتان عبدالحمید ئەمەی بە دەست تێوەردانێکی ناوەخۆیی وڵاتەکەی زانی، سوڵتان تەنیا قائمقامێکی دیانی ناردە ناوچەی ئەرمەنیەکان و داوای نێودەوڵەتیی ڕەدکردەوە کە والییەکی دیان دابمەزرێنێت.

بەهۆی ڕێکخراوە نهێنیی نەتەوەیی و تۆقێنەرەکانەوە کە ئەرمەن دایان مەزراندبوو، لە دەوڵەت یاخیبوون و هێرشیان کردە سەر شارەکانی ئەرزروم و وان.

ئەرمەنەکان لە ساڵی ١٨٨١ ڕێکخراوێکیان لە ئەرزرووم دامەزراند و ناویان لێنا (کۆمەڵەی پارێزگاریکردن لە خاکی باوکان).

لەساڵی ١٨٨٢ دەوڵەتە ئەوروپییەکان دەستیان خستە ناو تاووتوێکردنی کێشەی ئەرمەنەوە، بەڵام هەرکە (بسمارك) بەشداریی تێدا نەکرد هەوڵدانەکە بەفیڕۆ چوو.

لە هەمان ساڵدا ١٨٨٢ ئەرمەنەکان لە (جنێف) پارتێکی شۆڕشگێڕیان دامەزراند و ناوی پارتەکە (خانجاك) واتا (خاچ) بوو، مەبەستی ئەو پارتە ئەوەبوو کە لەڕێگەی شۆڕشەوە کۆمەڵگایەکی ئەرمەنیی سۆشیالیزمی دابمەزرێنرێت لەو خاکەی کە دەستی بەسەردا دەگرن.

لەساڵی ١٨٨٥ ئەرمەنەکان ڕێکخراوێکی رامیارییان دامەزراند و ناویان لێنا

---

[1] صابان ص٢٣.

(ئەلماناکان) بۆ کارکردن لە دەرەوەی سنووری دەولەتی عوسمانی، دروشمیان (سەربەستی یان مردن) بوو، توانییان ریکخراویك لە لەندەن دابمەزرینن بەناوی (کۆمەلەی ئەرمەنی یارانی ئەوروپا)، مەبەستی ئەو کۆمەلەیەش دامەزراندنی دەولەتیکی ئەرمەنی بوو کە لە خاکی دەولەتی عوسمانی دادەبرینریت بە ریگەی شۆرش.

لە سالی ۱۸۹۳ ئەرمەنیەکان تووشی سەرکەشی بوون و یاخی بوون و چەند دروشمیکیان لەسەر دیواران نووسی، کە لە نرخی موسلمانەکانی کەم دەکردەوە لە ناوەراست و رۆژئاوای ئەنەدۆل. ئەرمەنەکان لەم دوو ناوچەیە هانی موسلمانە تورکەکانیان دەدا کە دژی سولتان عبدالحمید شۆرش بکەن. هەر کە موسلمانەکان ئەمەیان رەدکردەوە، ئەرمەنەکان چەند کوشتاریکیان دژی موسلمانەکان ئەنجام دا.

* * *

سولتان عبدالحمید ناچار بوو فەرمانێ دەربکا، کە ئەو تۆقاندنەی ئەرمەنەکان جێبەجێی دەکەن بوەستینرێ و تۆقینەرەکان بدرێنە دادگا. جێبەجێکردنی ئەم فەرمانەش درایە دەست چەند هیزیك کە لە سوارەی حەمیدی و کوردەکان پیکهاتبوو، ئەم هێزانە ئاشووبی ئەرمەنییەکانیان کوژاندەوە و دوای ئەمە ئاسایش کەوتە ئەو ناوچەیەوە.

ئەوروپا نارەزایی لەسەر ئەم کارەی دەولەتی عوسمانی دەربری و (گلادیستۆن)ی سەرۆك وەزیرانی ئینگلیزی، کە بە دوژمنکاریکردنی ئیسلام بەناوبانگ بوو لەشاری (لیڤرپول)ی بەریتانی دوانیکی دا و رەخنەی لە سیاسەتی سولتان عبدالحمید گرت بەرامبەر ئەرمەنەکان و گوتی: "دەبێ دەولەتی عوسمانی رەش بکریتەوە و نەمینێ."، لە دوانەکەیدا بە (بکوژی گەورە) وەسفی سولتان عبدالحمیدی کرد. نازناوی (سولتانی سوور) دەنگی دایەوە، کە ئەورووپیەکان بەجۆرە وەسفی سولتان عبدالحمیدیان کردبوو، هەموو دەولەتە ئەورووپیەکان-جگە لە ئەلمانیا- لە ریزی ئەرمەنەکان وەستان.[1]

## ۳/ کزیی ئابوریی عوسمانی:

یاخیبوونی دیانەکانی (کریت) لەپیناو جیابوونەوەی دورگەی کریت لە دەولەتی عوسمانی و چوونە پالی یۆنانیەکان بۆ لای کریتیەکان، پیویستی بە ناردنی هێزەکانی

---

١ صابار، ٢٣٤.

عوسمانیە بۆ دورگەکە و ئەمەش وای لە دەوڵەت کرد کە لە ڕووی سامان و سەربازەوە زیانی پێ بگات.

هەروەها جەنگی عوسمانی و یۆنانی ساڵی ١٨٩٧، لەپێش ئەمەش جەنگی عوسمانی و ڕوسی زیانیان پێی گەیاند.

لەو کاتەی سوڵتان هاتە سەر عەرش باروزروفی ناوەخۆ زۆر خراپ نەبوو، بودجەی ساڵی ١٨٧٥ پێنج ملیۆن لیرەی عوسمانی و شتێکی کەمبوو. دەوڵەت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم بارە چەند دامەزراو و لیژنە و ڕێکخستنی ئەنجام دا، لەوانەش چەند پشکی مالی و تەحویلی دەکرد بە ناوی (تحویلات رمضان) و کارگێڕییەکەی دامەزراند بە ناوی (الرسوم السنیه) و چاکسازییەکی مالی بەناوی (قرار محرم)، بەلاّم گرنگترین هۆکارەکانی چاکسازی مالی (کارگێڕیی وامە گشتیەکان) بوو.[1] ئەم کارگێڕییە دامەزرا بۆ ئەوەی وامەکانی دەرەوەی دەوڵەتی عوسمانی جێبەجێ بکات، کە لە پێش سەردەمی سوڵتان عبدالحمید دەوڵەت قەرزی کردبوو و لە دوارۆژەکانی فەرمانڕەوایی سوڵتان عبدالعزیز وامداریی دەوڵەتی عوسمانی گەیشتبووە (٥،٢٩٧،٦٧٦،٥٠٠) فرەنکی زێڕین.

لەگەڵ (قرار محرم) ئەم کارگێڕییە (کارگێڕیی وامە گشتیەکان) پێکهێنرا و چەند نوێنەرێکی دەوڵەتە خاوەن وامەکانی تێدابوو، ئەرکی ئەم کارگێڕییە کۆکردنەوەی داهاتی باجە جۆراوجۆرەکان بوو بۆ ئەوەی وامەکانی لێ هەڵبگیرێتەوە.[2]

پێش ئەمە سوڵتان بڕیارێکی دەرکردبوو کە دیاردەکانی دەست بڵاوی لە دەوڵەت بەگشتی و لە کۆشکی پاشا بە تایبەت قەدەغە کردبوو. هەروەها سوڵتان لە سامانی تایبەتیی خۆی هەندێکی تەرخان کردبوو بۆ جێبەجێکردنی هەندێ لایەنی مالی نەخۆ ببێتە بارگرانی لەسەر بودجەی گشتیی دەوڵەت.

١ صابار، ص٢٥٢.

٢ لە کۆزانیاریی تورکیی ئاسان ئەم بابەتە بە ئاسانی و سووکی باس کراوە، ئەستەنبوڵ ١٩٦٨ ص١/٣٣٠.

## ٤/ بڵاوبوونەوەی هزری نەتەوەیی لەناو گەورەلێپرسراو و ئەدیب و ڕۆژنامەوانەکاندا:

شۆڕشی فەڕەنسا کاریگەریی بەسەر ئەورووپادا هەبوو، لەڕێگەی نێردراو و وەرگێڕانەوە کاری کردە سەر دەوڵەتی عوسمانی کە دەوڵەتێکی ئیسلامیە دژی بیرۆکەی نەتەوەییە. چەند ڕێکخراوێکی نهێنی چەند خانەیێ لە قوتابخانە باڵاکانی مەدەنی و سەربازی ئەم بیرۆکەیان بڵاودەکردەوە، بۆ گشتگیری ئەم بیرۆکەیە لە دەرەوەی دەوڵەتی عوسمانی چەند ڕۆژنامەیەکی دژی عوسمانی دەردەچوو، لە ئەنجامی ئەم چالاکیەدا کۆمەڵەی عوسمانییە نوێیەکان) و کۆمەڵەی (اتحاد وترقی) دامەزران.

لەگەڵ پەیدابوونی یەکەم کۆمەڵەی بەرهەڵستکاران (عوسمانییە نوێیەکان) سولتان عبدالحمید سەری بۆ دانەواندن و دەستووری ڕاگەیاند و ئەنجومەنی نوێنەرایەتیی کردەوە. دوایی بینی کە سیاسەت وا دەخوازێ ئەم کۆمەڵەیە تێك بشکێنێ، بۆیە سەرۆکی کۆمەڵەکەی بۆ تاراوگە دوورخستەوە و هەندێکی بۆ لای خۆی کێشکرد بە پێدانی دەسەڵات و لە هەندێکی تریش خۆش بوو، بەمجۆرە تاروماری کردن. لە ئەنجامدا ناچار بوو کە دەست لە هەموو کاروبارێکی دەوڵەت بە گەورە و بچووکیەوە وەربدات، چونکە ئەو پیاوە دڵسۆزانەی بەدەست نەکەوت کە متمانەیان لەسەر بکات. دژایەتیکردنی سولتان زۆر بوو بەرهەڵستکاران لە چالاکی دابوون و کۆمەڵەی (اتحاد وترقی) پێکهات، هەر کە ئەم کۆمەڵەیە لە دامەزراوەکانی دەوڵەت تەشەنەی کرد و بڵاوبوویەوە، سولتان عبدالحمید چاودێریی جووڵانەوەیانی کرد و ڕاوەدووی ئەندامەکانی نا و چاودێریی خستە سەر ڕۆژنامەکان، تا ئەم بیرۆکەیە-بە بۆچوونی سولتان- نەبێتە هۆی ڕووخانی دەوڵەت. بۆیە دەبینین زۆر بە توندی لەبەردەم بزووتنەوە نەتەوەییەکان دەوەستێ: بزوتنەوەی نەتەوەیی ئەرمەن، بزووتنەوەی نەتەوەیی عەرەب و بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد، هەرچەندە سولتان هەندێ لە ئەرمەنەکانی دەکردە وەزیر و راوێژکار و پزیشك و مامۆستا و بالیۆزی خۆی. هەروەها هانی بەکارهێنانی زمانی عەرەبیی دەدا و هەندێ لە عەرەبەکانی دەکردە یاریدەدەری خۆی دژی بەرهەڵستکاران. گرنگترین کەسێتیەکانی سەردەمی حەمیدی ئەمانە بوون: (ابو الهدى الصيادي، نجيب ملحمة، عابد پاشا). پاسەوانە تایبەتیەکانی سولتان کورد بوون، سولتان عبدالحمید بەقای بە کوردەکان دەکرد

لەبەر دڵسۆزی و دەستپاکی و خۆگرییان. لەم روانگەیەوە سوڵتان عبدالحمید نەیدەویست بزوتنەوەی (احمد عرابی پاشا) لە میسر بەرەو لایەنی نەتەوەیی ڕەگەزپەرستی بڕوات.

* * *

سەیر ئەوەیە ئەوانەی سەرکردایەتیی بەرهەڵستکارانیان دەکرد و حوکمی حەمیدییان ڕووخاند، باسی چەند هۆکارێکیان دەکرد گرنگترینیان: کپکردنـــی هەسـتی نەتـەوەیی و تاکڕەویی بوو، ئایا دوای سوڵتان چیان کرد؟

(کارل بروکلمان)ی ڕۆژهەڵاتناس دەڵێ: "هەر کە پیاوانی -ترکیـا الفتـاە- دەسـتیان بەسەر فەرمانڕەواییدا گرت، ئەوانە دەیانویسـت هاونیشـتمانە بڵاوەکـان لـە چوارپـەڕی ئیمبراتۆریەتی عوسمانی کۆکەنەوە لەسەر نموونەیەکی بەرزی دەستوورێکی نوێ بە ڕێگەی لەناوبردنی ڕەگەزپەرستێتی، ئنجا بەتوندی دژی ڕۆشنبیریی عەرەبی جەنگان-عەرەبەکان زۆر حەزیان لە سەربەخۆیی و ئازادی بوو. ئەمەش شـتێکی سروشـتیە کـە عەرەبـەکان ناچـار بـن چـەند کۆمەڵەیـەکی نـهێنی وەکـو (ترکیـا الفتـاة)ی تورکـەکان بـۆ خۆیـان دابمەزرێنن.".[1]

---

١ کارل بروکلمان، تأريخ التأريخ الشعوب الإسلامية، نقله الى العربية: نبيه أمين فارس ومنير البعلبكي، ط٨ بيروت ١٩٧٩، ص٧٥٧.

# پاری دووەم

# سیاسەتی دەرەوەی سوڵتان عبدالحمیدی دووەم

## (سوڵتان عبدالحمید و چاوتێبڕینەکانی بەریتانیا)

### ١/ گرتنی قوبرس لەلایەن بەریتانیاوە:

سیاسەتی بەریتانی زۆر بە ڕێکوپێکی دەڕۆیشت بۆ دەستەبەرکردنی ڕێگای بەرەو هیند کە پێشتر بەریتانیا گرتبووی. گرنگترین خاڵی ستراتیژیی ئەم ڕێگەیە دوورگەی (قوبرس) بوو کە (دزرائیلی)ی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا بە (کلیلی ئاسیای ڕۆژهەڵات) وەسفی کردبوو، بەریتانیا دەیویست بە هەر نرخێ بێ دوورگەی قوبرس بگرێت. بەریتانیا بینی کە گونجاوترین کات بۆ گرتنی قوبرس پێش مۆرکردنی پەیمانی (بەرلین)ی ساڵی ١٨٧٥ی عیسایییە= واتا لە ناخۆشترین و تەنگاوترین بارودۆخی نێو دەوڵەتی کە دەوڵەتی عوسمانی پێیدا ڕەت دەبێت.

بەریتانیا زۆر بە ڕێکی کاتەکەی هەڵبژارد، چونکە دەوڵەتی عوسمانی زۆر پێویستی بە دەوڵەتێکی گەورە بوو کە لە کۆنگرەی (بەرلین) پشتی بگرێت، بەریتانیا چاکترین دەوڵەت بوو کە عوسمانیەکان پێویستیان پێی هەبوو، خۆ لایەنگیریی ئینگلیزیش بێ بەرامبەر نەبوو، بەریتانیا قوبرسی دەویست، گەر وانەبێ لە ڕیزی عوسمانی ناوەستێ، بەڵکو بەرەو هەڵوێستی خراپتری دەبات، بەریتانیا بە ئاشکرا ئەم هەڕەشەیەی دەکرد.

(سالسبۆری)ی وەزیری دەرەوەی بەریتانی لە برووسکەکەی بۆ (لایارد)ی باڵیۆزی بەریتانی لە ئەستەنبول گوتی: "بە هەموو توانایەکت گوشار بخە سەر عوسمانیەکان تا ناوەرۆکی بروسکەکەمان قبووڵ بکەن، لەو بروسکەیە پارێزگاریکردنی ئاسیای عوسمانیی تێدایە کە سوڵتان سەرباز کۆ دەکاتەوە بۆ پاراستنی. گەر سوڵتان دەیەوێ پارێزگاریی نیازچاکیی ئینگلتەرا بکا بەرامبەر وڵاتەکەی، پێویستە یەکسەر پێشنیازەکەمان وەرگرێ، هەوڵ بدە وا بکات. گەر ئەم هەلەمان لەدەست بچێت، هەلی تری وامان

بەدەست ناکەوێتەوە. ئێمە وا لەسەر دەم و ساتی گرێدانی رێککەوتنێکی بە سوودین بۆ دەوڵەتی عوسمانی کە سوورە لەسەر دوورخستنەوەی سوپای روسی لە ئەستەنبوڵی پایتەخت و دانەمەزراندنی میرنشینێکی بولگاریی سەربەخۆ کە سنوورەکەی لە باکووری چیای بەلقان پێکهاتووە. گەر سوڵتان پێشنیازەکەمان قەبووڵ نەکات لە ئەنجامدا ئەستەنبۆڵ بە دەستی روسیەکان دەرووخێت و دەوڵەتی عوسمانی بە تەواوی دەرمێت و هیچ شتێ لەم کارەساتەی رزگار ناکات و هاورێیەتیی ئینگلتەرا نەبێت.".

* * *

هەر کە بروسکە کە درایە دەست (لایارد)، چاوی بە سوڵتان عبدالحمید کەوت و پێی راگەیاند "کە هەڵوێستی وڵاتەکەی لەکاتی بەستنی پەیمانەکە لە بەرلین بریتی بوو لە دان پێدانەنانی بە پەیماننامەی -ئەیاستفانوس- و وەك بڵێی هەر نەبووە، بەرامبەر ئەمە بەریتانیەکان قوبرسیان گەرەکە.". لەم رووەوە دەقی پەیماننامەکەی پێشکەش سوڵتان کرد. سوڵتان ئەمەی رەدکردەوە، بەڵام مکوڕبوونی بەریتانیەکان لە هەڵوێستیان وای لە سوڵتان کرد رای بگەیەنێ کە ئامادەیە دان بە پەیماننامەکەدا بنێ بەو مەرجەی عوسمانیەکان مافی دەسەڵاتیان بەسەر دوورگەکەوە هەبێ و دەوڵەتی عوسمانی قەباڵە(سند)ێکی نووسراو لە (لایارد) وەربگرێ بە ناوی دەوڵەتی بەریتانی، کە تێیدا بەریتانیا لایەنگیری عوسمانی بکات لە پەیماننامەی (بەرلین) پێش دان پێدانانی و تەسدیق کردنی. باڵیۆزی بەریتانیا ئەمەی کرد. لەژێر فشاری ئاشکرای بەریتانی دەوڵەتی عوسمانی لە (٤)ی یۆنیۆی ساڵی ١٨٧٨ پەیمانێکی لەگەڵ بەریتانیا بەست. هەڵوێست لە قوبرس بەجۆرە مایەوە: دوورگەی قوبرس لە لایەنی شەرعیەوە سەر بە دەوڵەتی عوسمانیە و لەلایەنی کردەوەییەوە دوورگەکە بەکرێ درایە بەریتانیا.[1]

گرنگترین بنەماکانی ئەم پەیمان نامەیە مادەی یەکەمێتی کە دەڵێ: "ئەگەر روسیا دەستی بەسەر (باتوم) یا (ئەردەهان) یا (قارس)دا گرت، دوایی ویستی دەست بەسەر هەندێ خاکی عوسمانیدا بگرێ لە ئاسیا، ئینگلتەرا بەڵێن دەدا کە: لەگەڵ دەوڵەتی

١ سلیمان قواجه باش، ترکیا و انکلترا، استانبول ١٩٨٥، ص٩٢ وأوزطونة المرجع السابق ١٦٤-١٦٥.

عوسمانی ببێتە یەك بۆ پاراستنی ئەو خاکانە بە هێزی چەك."[1]

بەریتانیا مەترسیی لە ڕوسیا هەبوو، کە لە ڕێگەی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵاتەوە لە قەوقازەوە بێت و مەترسی بخاتە سەر ڕێگای بەریتانیا بەرەو هیند و هێزەکانی بێنێتە ئەسکەندەرۆنە و ناوی دوورگەی عەرەبی و ڕێگەی هیند لە بەریتانیا بگرێت. ئەمە هۆی جووڵانەوەی بەریتانیا بوو بۆ دەستەبەرکردنی خاکی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵاتی.[2]

## ٢/ گرتنی میسر لەلایەن بەریتانیاوە:

هەرکە فەڕەنسا لە ١٧٩٨ میسری گرت بە سەرکردایەتیی ناپلیۆن، بۆ یەکەم جار بەریتانیا سەرنجی بۆ لای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ڕاکێشا. ئەدەبی ئینگلیزی ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە هاندانی سیاسییەکانی بەریتانی بۆ داگیرکردنی میسر، لە ڕۆمانی (کەنج لاك Eothen) کە لە ساڵی ١٨٣٤ دایانابوو، باسی داگیرکردنی کەنارەکانی نیلی کردبوو لەلایەن ئینگلیزەوە، لە ڕۆمانی (بنیامین دزرائیلی) کە ناونیشانەکەی بەناوی (Tancred) بوو لە ١٨٤٧ نووسیبووی باسی دەست بەسەراگرتنی بەریتانیا کرابوو لەسەر قوبرس و میسر.

ئینگلتەرا کە گرنگیی بە میسر دەدا، چونکە خاڵێکی ستراتیژیی گرنگە لەسەر ڕێگەی هیند، سیاسەتی ئینگلیزی لەوەدا بوو، کە ئەو ڕێگەیە ئاسایشی پێوە دیار بێت، بۆیە دژی بوونی فەڕەنسا وەستا لە میسر و لەگەڵ عوسمانیەکان بەهاوبەشی دەریان کرد.

هەروەها بەریتانیا دژی (محمد علی پاشا) وەستا لە میسر، کە دەیویست دەوڵەتێکی سەربەخۆی تێدا دابمەزرێنێ و دژی پڕۆژەی کەناڵی سوێسی فەرەنسی وەستا، بەڵام دوایی لایەنگیریی پڕۆژەکەی کرد و هەندێ وامی پێشکەش میسر کرد، کە لەژێر باری ئەو وامەدا دەیناڵاند. بەمجۆرە میسر کەوتە ژێر فشاری ماڵیی بەریتانیا و فەڕەنسا.

لەساڵی ١٨٧٥ خدێوی ئیسماعیل پاشا پشکی خۆی لە کۆمپانیای کەناڵی سوێس بە ١٠٠ ملیۆن دۆلار فرۆشتە ئینگلتەرا. میسر لەکاتی وامدانەوەکەی لە ساڵی ١٨٧٦

١ محمد فريد/ المرجع السابق، ص٦٧٢.

٢ سليمان قواجه باش، المرجع السابق، ص٩٤

نەیتوانی وامەکەی بداتەوە، هەروەها وامدانەوەکەی ساڵی ١٨٧٧ی دواخست بۆ ماوەی سێ مانگ. دوای ئەمە (سندوقی ئیفلاس) پێك هێنرا بۆ ئەوەی دەوڵەتە خاوەن وامەکان سوود لە سووی وامەکانی میسر ببینن. ئنجا دەوڵەتە خاوەن وامەکان پێشنیازی چاکسازیی ماڵیی میسریان کرد بۆ پاکۆکردنی وامەکان. خدێوی ئیسماعیل بە هەموو ئەمانە قایل بوو. (نۆبار)ی ئەرمەنی بووە سەرۆك وەزیرانی میسر و (بلینی)ی فەرەنسی بووە وەزیری کاروبارەکان و (ویستون)ی ئینگلیزی بووە وەزیری دارایی. ئنجا هێزە چەکدارەکانی میسریان کەمکردەوە و ئەمە بووە هۆی دەرکردنی ٢٥٠٠ ئەفسەری میسری. لەبەر ئەمە خۆپیشاندانەکان دەستی پێکرد و خۆپیشاندەران عارەبانەی (نۆبار پاشا)یان دایە بەر بەرد و (نۆبار) دەستی لەکار کێشایەوە و (شەریف پاشا) هاتە جێگەی و میرییەکی نیشتمانی پێکهێنا، بەڵام ئینگلیز و فەرەنسیەکان پێی قایل نەبوون، سوڵتان عبدالحمید ناچار بوو کە ئیسماعیل پاشا لابەرێ و (تۆفیق)ی کوڕی بێتە جێگای، بەڵام تۆفیق هیچی پێ نەکرا و بووە دیلی سیاسییەکانی ئینگلیز.[1]

ئەفسەرە دەرکراوەکان لە دەوروبەری ئەفسەری نیشتمانی (احمد عرابی) کۆبوونەوە، عورابی پاشا دروشمی (میسر بۆ میسریەکان)ی بەرز کردەوە. جێبەجێکردنی ئەم دروشمە بووە هۆی دوورخستنەوەی فەرمانبەرە ئەوروپییەکان و دەرکردنی ئەفسەرە نامیسرییەکان لە سوپا و لادانیان لە مایۆی ١٨٨٢ع.

ئینگلتەرا و فەرەنسا دەستیان لەم هەڵوێستە وەردا و کەشتیەکانیان ناردە ئەسکەندەریە. عورابی پاشا لە ترسی ڕودانی هەر دەستدرێژییەکی بێگانە، ئۆردوگاکانی ئەسکەندەریەی قایم کرد. لە (٢٥)ی مایۆی ١٨٨٢ هەردوو دەوڵەتەکان یاداشتێکیان پێشکەش کرد و داوایان کرد، کە میریی (بارودی) دەست لەکار بکێشێتەوە و عورابی پاشا لابرێ. میرییەکە دەستی لەکار کێشایەوە، ئەمەش بووە هۆی شڵەژانێکی گەلیی گەورە لە ٢٦ی مایۆ، ئینگلتەرا لە دەوڵەتی عوسمانیی ویست کە عورابی بە یاخیبوو لە قەڵەم بدرێ و هێزێکی سەربازیی عوسمانی بۆ میسر بنێردرێت. بەڵام دەوڵەتی عوسمانی وەڵامی دایەوە بەتوندی "کە ئەم کێشەیە پێویستە بە گفتوگۆ چارەسەر بکرێت.".

١ قارال، المرجع السابق: ص٨٧-١٠١ وقوجه باش ١٠٠-١٠٢.

بەریتانیا وەك رەوشتی خۆی کاتێکی ناسکی هەڵبژارد بۆ هەڵس وکەوت و جووڵانەوەکانی لە میسر. فەرەنسا لە تونس گیرسایەوە و ئیتاڵیا لە هەوڵی ئەوەدایە، کە دەست بەسەر لیبیادا بگرێت و لەوەش گرنگتر ئەو بوچوونەی کە ناتوانرێ دەستی روسیا بگرێ لە دەست درێژییەکانی بۆ سەر تەنگەبەرەکان(المضایق)، ئەم هەموو هۆکارانە کۆبوونەوە بۆ ئەوەی دەستنیشانی کاتی دەست بەسەراگرتنی میسر لەلایەن بەریتانیاوە بکرێت.

دەوڵەتی عوسمانی دەروێش پاشای نارده میسر و کەشتیی ئینگلیزی لە دەوروبەری ئەسکەندەرییە لەنگەریان گرتبوو، لەناو میسرییەکان بانگاشەی ئەوەدەکرا کە (ئەوروپییەکان خۆیان بۆ هێرش کردنە سەر میسر ئامادە کردوە و چەك بۆ باڵیۆزخانەی بەریتانی دێ، فەرمانبەرە ئینگلیزەکان لە هەموو شوێنێ دەگەران بۆ هاندانی میسرییەکان بەنهێنی بە مەبەستی شۆڕش کردن). دوای یەکێ لە رووداوە ئاساییەکانی پۆلیس لەنێوان ئەوروپییەك و (مەککار)ی میسری، ئەوروپییەکان لە ئەسکەندەرییە رووداوەکەیان گەورە کرد و چوونەوە ماڵەکانیان و لەوێوە تەقەیان لە میسریەکان کرد.

هەر کە ئەم رووداوە بە عورابی پاشا راگەیەنرا چەند سەربازێکی هەنارده ئەوێ و فەرمانی دەرکرد کە رووداوی تر روونەدا.

دەوڵەتی عوسمانی داوای لە نوێنەری دەوڵەتان کرد لە رووداوەکە بکۆڵنەوە و چارەسەریی پێویستی بۆ دابین بکەن. ئینگلتەرا و فەرەنسا ئەم پێشنیازەیان رەدکردەوە. خدێوی تۆفیق و دەروێش پاشای نێردراوی عوسمانی بەرەو ئەسکەندەرییە چوون، تا داوای هێوربوونەوە لە گەل بکەن، بەڵام قونسولی ئینگلیزی تەنگی پێ هەڵچنین.

لەو کاتەدا کەشتیی بەریتانی بەرەبەرە لە کەناری ئەسکەندەرییە نزیك دەبوویەوە و میسرییەکان سەنگەرەکانی خۆیان قایم دەکرد، میرییەکی تازەی میسری پێکهات و عورابی وەزیری جەنگ بوو لەو میرییەدا، ئەمە بەس بوو بۆ ئەوەی قونسولی ئینگلتەرا و فەرەنسا میسر بەجێ بێڵن. عورابی وەڵامێکی ئیجابی ئینگلیزی دایەوە کە داوایان کردبوو سەنگەر لێدان بوەستێنن، لەگەڵ ئەمەش ئینگلیزەکان گوتیان: هێشتا ئەوان دڵنیا نین، چونکە نیازی خۆیان لەسەر داگیرکردنی میسر بوو. لە کۆتاییدا لە ١١ی

یۆلیۆی ١٨٨٢ ئەسکەندەریەیان بۆمباباران کـرد و لـە زەوییـەوە بـۆ شـارەکە هـاتن و سوپای میسرییان لەناوبرد-لە ئەنجامی فرت وفێڵ- لـە گـردی گـەورە(التـل الکبـیر) و عورابییـان بـۆ دورگـەی سـیلان دوورخسـتەوە و بـەجۆرە میسـر کەوتـە ژێـر دەسـتی داگیرکردنی ئینگلیزی.

*　*　*

داگـیرکردنی میسـر لەلایـەن بـەریتانیاوە گۆڕانێکـــی بنـەڕەتیی پـەیداکرد لـە پەیوەندیـەکانی عوسمـانی-ئینگلـیزی. دوای ئـــەوە بـــەریتانیا وازی لـــە سیاســـەتە ڕۆژهەڵاتیەکەی هێنا کە لەسـەر بنـەمای یـەکێتیی خـاکی عوسمـانی بـەند بـوو. دوای داگیرکردنی میسر بـەریتانیا چـاوی لـە نیوەدورگـەی عـەرەبی بڕیبـوو، بـەریتانیا بـێ بەکارهێنانی چـەند بزووتنەوەیـەك کـە زیـان بـە بەرژەوەندیـەکانی دەوڵـەتی عوسمـانی دەگەیەنن نەیدەتوانی سیاسەتی خۆی لە ناوچەکەدا بچەسپێنێ، بۆیـە لەلایـەك کێشـەی نەتەوەی عـەرەبیی قوت کردەوە و لەلایەکی تریش لە دەرگای ئاشـتیی ئـەو دەوڵەتانـەی دەدا کە دەیانویست دەوڵەتی عوسمانی دابەش بکەن.

## ٣/ کارتێکردنی داگیرکردنی میسر لەلایەن ئینگلیزەوە لە ناکۆکیی نێوان سوڵتان عبدالحمید و ئینگلیزدا:

داگیرکردنی میسر لەلایەن بەریتانیاوە کارتێکردنیکی خراپی لەسەر دەروونی سوڵتان عبدالحمید هەبوو، وای لێکردبوو هەمیشە هەسـتی بـە خـەمباری دەکـرد، سـوڵتان لـە نوسینێکی بۆ (ارمینیوس فامـبری)ی ڕۆژهـەڵاتناس هەسـتی بـەم شـێوەیە دەردەبـڕێ: "..داگیرکردنی میسـر لەلایـەن بـەریتانیاوە شـکۆمەندیی ورد و خـاش کـرد لـە هـەر چوارپەڕی جیـهانی ئیسـلامیەوە هەسـتمی برینـدار کـرد، لـەپێش گەلەکـەم و نـاتوانم سەرشۆڕی قەبووڵ بکـەم و قـەبووڵی ناکـەم. مەرجـەکانی ئینگلـیز ترسـناك بـوون لـە ئاییندەی وڵاتەکەم. تا ئەوپەڕی بـوونم دەگـەچرێنێ کـە بـەناو خەلیفـەی موسـڵمانان و سـوڵتانی عوسمانیـەکانم. ڕۆژێ لـە ڕۆژان بـەم مەرجانـە قـایل نـەبووم.. دەزانم کـە بەرژەوەندییە ئیمپریالیزمیەکانی بەریتانی وا دەخوازێ، کە هات و چۆ لە کەناڵی سوێس ئازاد بێ.. ناهێڵم پارچەیەك لە خاکی دەوڵەت لەژێر دەسـتی دەوڵـەتێکی بێگانـە بێـت

گەر بە شێوەیەکی کاتیش بێت.".[1]

هەرچەندە دەوڵەتی عوسمانی چەندەها یاداشتی یاسایی نێودەوڵەتیی پێشکەش بەریتانیا کرد و داوای لێکرد کە لە میسر بکشێتەوە، بەڵام ئینگلیز هەر لە داگیرکردنی میسر بەردەوام بوو.

سوڵتان عبدالحمید نەیویست ئینگلیزەکان لە میسر بحەوێنەوە و لە نیعمەت دابن "سامانێکی زۆری خەرجکرد بۆ ئەوەی لە میسر و سودان بانگاشەی دژی ئینگلیز بکرێت و چالاکییان قەدەغە بکرێت. خاڵەکانی سەرسنوری نیوەدوورگەی (سینا) و دوورگەی عەرەبیی بەهێز کرد. هەر شتێکی پێ کرابایە دژی بەریتانیای گەورە بەکاری هێنا.".[2]

"سوڵتان بۆ دژایەتیی ئینگلیز بە تایبەتی زیاتر پابەندی سیاسەتی خەلیفایەتی بوو، وەکو ڕەگەزێکی بێزارکەر دژی بەریتانیا بەکاری هێنا لە ڕۆژهەڵات دا" (واتا سامان و وڵاتە ژێردەستەکانی لەنیوە کیشوەری هیندی).

## ٤/ چاوتێبڕینی بەریتانیا لە عەقەبە (گێڕانەوەی عەقەبە و مانەوەی تابا بە بەشێك لە میسر):

هێڵی ئاسنینی حیجاز بووە هۆی دەرکەوتنی (کێشەی عەقەبە)، عەقەبە شارۆچکەیەك و بەندەرێکی گرنگە لەوپەڕی دوورگەی عەقەبەی باکوور لە دەریای سووردا. دەوڵەتی عوسمانی ڕێگای دایە میسر کە بە شێوەیەکی کاتی هەندێ سەربازی لە عەقەبە هەبێت بۆ ئاسانکردنی گەشتی حاجیەکان بۆ حەج لەگەڵ ئەوەی کە عەقەبە ناکەوێتە ناو سنوری میسرەوە.

بە دامەزراندنی هێڵی ئاسنینی حیجاز پێویستی بە مانەوەی سەربازی میسر نەما لە عەقەبە و لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە ئەمە بە میسر ڕاگەیەنرا. بەریتانیا-ئەو دەوڵەتەی کە میسری گرتووە- ناڕەزایی لەسەر ئەمە دەربڕی و کەشتیگەلی (دیانا)ی

---

١ میم کمال اوکة، عبدالحمید الثاني والصهاینة والمسألة الفلسطینیة، ص٣٨ استانبول ١٩٨١.

٢ قوجه باش، المرجع السابق، ص١٠٧.

ناردە عەقەبە بۆ ترساندنی دەوڵەتی عوسمانی. سولتان یەکسەر نارەزایی لەسەر ئەم کارەی ئینگلیز دەربڕی و بە ئینگلیزی ڕاگەیاند، کە کێشەی عەقەبە کێشەیەکە لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و میسرەوە، کە ئینگلیز مافی دەست تێوەردانی نییە. سولتان بە سەرکردایەتیی (رشدی بگ پاشا)-دانەری کتێبی کێشەی عەقەبە- دوو تابوور هێزی عوسمانیی نارد بۆ گرتنی (عەقەبە و تابا) پێکەوە، روشدی بەگ ئەمەی جێبەجێکرد.

(تابا) شارۆچکەیەکی بچووکە و چوار میل لە باکووری ڕۆژئاوای عەقەبەیە، سولتان عبدالحمید فەرمانی دایە هێزی (رشدی بەگ) کە ئەو دوو شوێنە بگرن بۆ مەبەستی ئاڵ وگۆڕکردن و دان پێدانان بە عوسمانی بوونی عەقەبە. ئینگلتەرا ئینزارێکی دایە دەوڵەتی عوسمانی، کە لە ماوەی (دە) ڕۆژدا هێزەکانی لە نیوەدورگەی (سینا) بکشێنێتەوە.

لە ئەنجامدا ڕێککەوتن نامەیەك لەنێوان هەردوو لا مۆرکرا و عەقەبە وەکو پارچەیەك لە خاکی عوسمانی مایەوە و (تابا)ش درایەوە میسر و هێزی عوسمانیی لێ کشایەوە.

بەجۆرە سولتان عبدالحمید سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە کێشەی نێوان عوسمانی و بەریتانی لە عەقەبە. سەرکەوتنەکەش لەوەدابوو کە هەر لە سەرەتاوە عەقەبە بە مافی دەوڵەتی عوسمانی دەزانرا. هەروەهایخۆپیشاندانەکانی موسڵمانەکانی هیند دژی ئینگلیز وای لە ئینگلیز کرد کە پەلە بکەن بۆ گەیشتنە ئەو ڕێککەوتن نامەیە.[1]

## ٥/ چاوتێبڕینەکانی بەریتانی لە یەمەن و دوورگەی عەرەبی و هەڵوێستی سولتان لەو چاوتێبڕینە:

= **لە یەمەن:** دەتوانین بڵێین کە سولتان عبدالحمید لە ململانێی دژی بەریتانیا لە یەمەن سەرکەوتوو بوو. فرقەیەکی سەربازیی لە یەمەن دامەزراند کە ٨٠٠٠ سەرباز دەبوو بۆ ئەوەی جارێکی تر یەمەن بگێڕێتەوە ژێر فەرمانڕەوایی عوسمانی. هێندە گرنگیی بە یەمەن دا کە سەرکردە بەناوبانگەکانی بنێری بۆ سەرکردایەتیی ئەو سوپایە، وەکو (احمد مختار پاشا، احمد فوزی پاشا، حسین حلمی پاشا، تۆفیق پاشا، موشیر عوسمان

١ أوزطونه، المرجع السابق ٢٠٥-٢٠٨ و قوجة باس ١١٤-١١٥.

پاشا، اسماعیل حقی پاشا).

هەر کە کێشەی عەقەبە دەرکەوت ئینگلیز هەوڵی دا کە ئاگری یاخیبوون لە یەمەن دژی دەوڵەتی عوسمانی هەڵ بکا، بەڵام ئەو سیاسەتەی کە سوڵتان عبدالحمید لە یەمەن پەیڕەویی کرد سەرکەوتنی بۆ مسۆگەر کرد لە یەمەن.[1]

= **لە دورگەی عەرەبی:** یەکێ لە نووسەرە تورکەکان سیاسەتی سوڵتان عبدالحمید لەناوچەی دورگەی عەرەبی-دورگەی بەسرەیە لە زاراوەی تورکی- بەمجۆرە وەسف دەکات **"هەرچەندە سوڵتان عبدالحمید لە ململانێیی عوسمانی و ئینگلیزی لە یەمەن و عەقەبە سەرکەوتوو بوو، بەڵام لە ململانێیەکەی دژی ئینگلیز لە ناوچەی دوورگەی عەرەبی دۆڕاندی."**.

ئینگلیزەکان هەوڵیان دەدا کە دەسەڵاتیان لەسەر دوورگەی عەرەبیدا هەبێ لەبەر گرنگیی ستراتیژیی شوێنەکە بۆ دەستەبەرکردنی ڕێگەی بەریتانیا بەرەو هیند. هەر کە بیرۆکەی هێڵی ئاسنینی بەغدا هاتە ئاراوە مەترسی گەیشتە ئینگلیز، لەبەر ڕێگەیان بەرەو هیند، بەتایبەتی هەر کە هێڵەکە بەرەو کوێت یا بەسرە درێژ دەبێتەوە و ئینگلتەرا دەسەڵاتی خۆی بەسەر کوێتدا سەپاند، تا بەریەککەوتنێ لەگەڵ ئەڵمانیا ڕوویدات.

لەبەر ئەمە لۆرد (کیرزۆن)ی حاکمی گشتیی هیند لە ۲۳ی یەنایری **۱۸۹۹** ڕێککەوتننامەیەکی لەگەڵ شێخ (مبارك الصباح) **گرێدا و بەپێی ئەمە نابێ شێخ هیچ** شارێ، یان پارچە زەوییەك بەکرێ بداتە **دەوڵەتە بێگانەکان بێ ئاگاداریی ئینگلتەرا و** نابێ فەرمانبەری بێگانەش لە کوێت قەبووڵ بکات. **دەوڵەتی عوسمانی نارەزایی خۆی** لەسەر ئەم ڕێکەوتننامەیە نیشان دا.

کارەکە بە مۆرکردنی ڕێکەوتننامەیێ کۆتایی پێهات و بەپێی ئەمە دەبێ پارێزگاریی لە باروزروفی دورگەکە بکرێت، کوێت بەپێی واقیعی باروزروفەکە کەوتە ژێر فەرمانڕەوایی ئینگلیزی، بۆیە شێخ نەیهێشت کە فەرمانبەرە سیاسییەکانی ئەڵمان و عوسمانی بچنە ناو کوێتەوە.

---

۱ احسان ثریا، ثورات الیمن، ص٦٦ و ١٣١ ، استانبول ١٩٨٠، وقوجة باش ص١١٥.

ئینگلتەرا لە چەند کاتێکی جیاوازدا چەند ڕێککەوتننامەیەکی وەکو ئەمەی کوێتی لەگەڵ شێخەکانی ناوچەکە مۆر کرد، بۆ نمونە: حەزرەمووت و بەحرەین و مەسقەت، هێشتا ساڵی ١٩٠٠ نەهاتبوو، کە ئینگلتەرا ڕێکەوتننامەی لەگەڵ هەموو میرنشینەکانی ناوچەی دوورگە بەست، بەم شێوەیە دەسەلاتی عوسمانی لە ناوچەکەدا کۆتایی پێ هات.[1]

## ٦/ یارمەتیدانی ئەرمەن لەلایەن بەریتانیاوە دژی دەوڵەتی عوسمانی:

بەریتانیا لە جووڵانەوە نەتەوەییە ڕەگەزییەکانی ئەوروپیی عوسمانی دورەپەرێز نەبوو، هەروەها لە بزوتنەوە جوداخوازیەکانی ئەرمەنیش کە دەیویست بەشێك لە دەوڵەتی عوسمانی دابڕێ و دەوڵەتێکی ئەرمەنیی لەسەر دابمەزرێنێت. بەریتانیا لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی دەوەستا دژی ئەو بزوتنەوە نەتەوەییە جوداخوازییانە لە ترسی کاریگەریی ڕوسیا لەسەر دەوڵەتی عوسمانی.

دوای ئەوە بەریتانیا سیاسەتی خۆی گۆڕی و ئەو بزوتنەوە نەتەوەییانەی لە ئامێز گرت بۆ ئەوەی بیکاتە شوورەیەك دژی بڵاوبوونەوەی دەسەلاتی ڕوسی لە ئاوی گەرم لەلایەك و بۆ دەستەبەرکردنی ئاسایشی ڕێگەی هیند لەلایەکی ترەوە.

لە پەیماننامەی (بەرلین)دا بەریتانیا هەوڵیدا هەندێ بەندی تێ بخا بۆ ئەوەی کۆمەڵێ چاکسازی بکرێ لەو ناوچانەی کە ئەرمەنی تێدا دەژی و چاودێری ئەم کارە بە بەریتانیا سپێردرا لە بریتی ئەوەی کە ئەم مافە بدرێتە ڕوسیا.

هەر کە سوڵتان عبدالحمید سستیی کرد لە جێبەجێکردنی ئەم چاکسازییانە، بەریتانیا هەڕەشەی لێکرد، کە هێرشێکی سەربازیی دەریایی دەکاتە سەری.

لە ساڵی ١٨٨٠ هەرکە (گلادستۆن) لە هەڵبژاردنەکانی بەریتانی سەرکەوت و بووە سەرۆك وەزیران، بەریتانیا بوە سەنتەری سەرکردایەتیی بزووتنەوەی نەتەوەیی ئەرمەن.

بەریتانیا لایەنگیری بزوتنەوەی جوداخوازیی ئەرمەنی بوو، دژی سوڵتان عبدالحمید و دژی بەرژەوەندییەکانی عوسمانی، چونکە پێێ وابوو کە بەم لایەنگیریکردنە ناهێڵێ ڕوسیا

---

١ قوجة باش، المرجع السابق نفس الصفحة و١٥٢ و١٥٨. وكذلك ١٣٩ و ١٥٩.

لە قۆقازەوە بەرەو ئاوی گەرم بێت بەتایبەتی لەکاتی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ ئەرمەن لە وڵاتی عوسمانیدا و ئەم دەوڵەتە دەبێتە چەکێك دژی چاوتێبڕینەکانی ڕوسی لە ڕێگەی هیندەوە. ڕوسیا لایەنگریی دامەزراندنی ئەم دەوڵەتەی بۆ ئەرمەن نەدەکرد و لە دواییدا ناچار بوو کە لایەنگری و یارمەتیەکانی خۆی لە بزووتنەوەی نەتەوەیی ئەرمەنی بکێشێتەوە و ئەم ماوەیە درایە ئینگلتەرا، ئینگلیزیش ئەمەی دەویست، لە کۆتاییدا بەریتانیا بووە لایەنگری کێشەی ئەرمەنی.

لەساڵی ۱۸۹۰ هاندانی بەریتانی بۆ ئەرمەن دژی دەوڵەتی عوسمانی گەیشتە لووتکەی، هەر کە ئینگلیزەکان هانی ئەرمەنیان دا، کە یاخیبوونێکی خوێناوی لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ دژی دانیشتوانی موسڵمانە تورك و کوردەکان ئەنجام بدەن.

هەروەها دوژمنکاریی سوڵتان عبدالحمید بۆ ئینگلیز گەیشتە لووتکەی هەرکە میسریان گرت، دوژمنکاریی ئینگلتەراش دژی سوڵتان عبدالحمید گەیشتە لووتکەی هەر کە ئەرمەنیەکان یاخیبوونە خوێناویەکەیان لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ ئەنجام دا و دوژمنکاریەکە گەیشتە ئەو ڕاددەیەی، کە ئینگلتەرا پێشنیازی جەنگێکی سەربازیی ئەورووپی کرد دژی دەوڵەتی عوسمانی لە دەریای سوور و دەردەنیلەوە.

لۆرد (سالسبۆری)ی سەرۆك وەزیرانی بەریتانی پێشنیازێکی خستە بەردەم نیقۆلای دەووەمی قەیسەری ڕوسی، کە یارمەتیەکی سەربازی تەواوی بدات دژی ئەستەنبوڵ بۆ لابردنی سوڵتان عبدالحمید لە سەر عەرش دا.

ئینگلیزەکان زانییان ئەگەر سوڵتان عبدالحمید لەسەر عەرش بمێنێ ئەوا بیرۆکەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەرمەنی لەسەر خاکی دەوڵەتی عوسمانی بێ ئەنجام دەبێ، بەتایبەتی ئەو کاتەی کە سوڵتان زۆر بە توندی بەرامبەر هەڵس و کەوتەکانی ئەرمەن وەستا.

پێداگرتنی سوڵتان هۆیەك بوو بۆ ئەوەی ئینگلیزەکان لە لایەنگریکردنی ئەرمەن پەشیمان ببنەوە، دوای ئەوەی ئینگلیز هەموو ڕێگەیەکی لەگەڵ سوڵتان تاقیکردەوە.[1]

---

۱ قوجة باش، المرجع السابق نفس الصفحة و۱۵۲ و۱۵۸. وکذلك ۱۳۹ و ۱۵۹.

## ٧) هاندانی بەریتانیا بۆ عەرەب دژی دەوڵەتی عوسمانی و هەڵوێستی سوڵتان عبدالحميد:

دەوڵەتە ئەورووپیەکان بنەمای (تێکدان لەناوەوە)یان پەیڕەو کرد بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی عوسمانی، ئەو دەوڵەتانە توانییان چەند ناوچەیەك لە بەلقان دابڕن. دوایی دەوڵەتە ئەورووپیەکان ویستیان ئەم سیاسەتەیان بگەیەننە هەموو موسڵمانەکان لە دەوڵەتی عوسمانی، دەوڵەتی خەلیفایەتی کە موسڵمانەکان بە خەلیفەکەیان پەیوەندارن وخەلیفەش لە پایتەختی ئەم دەوڵەتەیە و ئیسلامیش فەرمان بە یارمەتی دەکات لەنێوان موسڵمانەکان و دان بە نەتەوەیی ڕەگەزی دانانێ.

هەرچەندە مەبەستی ئەورووپیەکان کزکردن و ڕووخاندنی دەوڵەتی عوسمانی بوو، بەڵام چاویشیان بڕیبوە هەندێ بەشی ئەو دەوڵەتە، بۆیە دەیانویست دوژمنایەتی بخەنە ناو ڕەگەزە موسڵمانەکان لەلایەك و لەلایەکی تریش گیانی نەتەوەیی لەنێوان موسڵمانانی ئەو دەوڵەتە زیندوو بکەنەوە، لەو ڕەگەزە نەتەوەییانەش : عەرەب.

قوتابخانە بێگانەکان و نێردراوە بەدیانکردنەکان هۆکاری ئەو دەوڵەتانە بوون بۆ وروژاندنی هەستی نەتەوەیی عەرەب دژی دەوڵەتی عوسمانی.

چالاکیی بەدیانکردنی فەرەنسی لە سوریا و لوبنان و قودس کۆنە، چالاکیی ئینگلیزەکان لەم بارەیەوە لە ١٨٤٢ەوە دەستی پێکرد، هەر کە کەنیسەیەکی پرۆتستانی لە قودس دامەزرا. قوتابخانەی نێردراوە بەدیانکردەکان یەکەم کانگای بزوتنەوەی جوداخوازیی نەتەوەیی عەرەبی بوو لە دەوڵەتی عوسمانیدا. هەر کە (محمد علی پاشا)ی والیی میسر دەستی بەسەر سوریادا گرت چالاکیی ئەو قوتابخانەیە فراوان بوو.

نووسەری بابەتی سوریا(لامانس) لە کۆزانیاریی ئیسلامیدا دەڵێ: ڕێکخراوی نێردراوە بێگانەکان لە دەوڵەتی عوسمانی بە ئاشکرا هەوڵی جوداخوازییان دەدا لەناو دەوڵەتی عوسمانی و نێردراوە ئەمریکییەکان بە تایبەتی نێردراوی کۆمەڵەی (عیسا) هەوڵی وروژاندنی نەتەوەیی عەرەبییان دەدا بە تایبەتی وروژاندنی عەرەبە دیانەکان دژی دەوڵەتی عوسمانی. بەو مەبەستەش لە ساڵی ١٨٧٥ قەشە (الجزويت) زانکۆی (سان

جۆزیف)ی لە بێروت دامەزراند.[١]

بەهۆی پشتگرتنی ئایینی نێـوان ئـەوروپی و دیانـەکانی شـام، تـەوژمی نەتـەوەیی عەرەبی بە مەبەستی جودابوونەوە لە دەوڵەتی عوسمانی دەستی پێکـرد و لەوانـەوە ئـەم نەتەوەییە گەیشتە عەرەبـە موسـڵمانەکان. ئـەوروپا بـە رێگـا نهێنیەکانیـەوە هـەوڵی لاسدانی[٢] عەرەبە موسڵمانەکانی دەدا کە دژی عوسمانیەکان شۆڕش بکەن، بۆیـە چـەند کۆمەڵەیەکیان دامەزراند وەکو کۆمەڵەی (بێروتی عەرەبی)ی نهێنی، کـە پێـش هاتنـە سەر عەرشی سوڵتان عبدالحمیدی دووەم بە ساڵێ دامەزرا و دەرچووە دیانەکانی کۆلیـژی پرۆتسـتانتیی سـوری دایانمـەزراند لـە بـێروت لـە دواییـدا بـووە زانکـۆی ئـەمریکی. مەبەستیشی دامەزراندنی دەوڵەتێکی عەرەبیی سـەربەخۆ و کۆتـایی پێـهێنانی حوکمـی عوسمانی بوو.

چالاکیی ئەوروپیەکان لە وروژاندنی جیاخوازیی عەرەبی لە دەوڵەتی عوسمـانی تـەنیا لەسەر قوتابخانە بێگانەکان و نێردراوە بەدیانکردنەکان و قوتابخانەکانیان نەوەستا، بەڵکو گروپە ماسۆنیەکانیش رۆڵێکی گرنگیان بینیـوە و عەرەبـە دیانـەکان کـە ویسـتیان لـە کارکردندا لەگەڵ عەرەبە موسڵمانەکان یەك بگرن، هەوڵیان دا ئەو عەرەبـە موسـڵمانانە بە گەلێ شێواز بخەنە ناو گروپە ماسۆنیەکان و رێکیان بخەن)).[٣]

بەپێی ئەم سیاسەتە ئینگلتەرا بەوپەڕی چالاکی و وردبینیەوە هەوڵیدا، کە حیجاز و دوورگەی عەرەبی لـە خانـەوادەی دەوڵـەتی عوسمـانی دەربکـات، هـەروەها سیاسـەتی بەریتانی وای راچاند، کـە خـۆی سـەرپەرشـتیاری ئـەم ناوچەیـە بکـات کـە پێشـتر بـە جێنشینی ئیسلامیەوە پەیوەنددار بوون و ناوچەی کەنداو بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیـەوە و (عەدەن) بگرێت.

چالاکیی ئینگلیزەکان لە بڵاوکردنەوەی دەسـەڵاتی بـەریتانی بـە رێگـەی قوتابخانـە

---

١ سەیری بابەتی سوریا بکە، دانانی (لامانس)، مامۆستا فکرەت الشبل طان) تەواوی کرد و خستیە سەری لە کۆزانیاریی ئیسلامیی- وەرگێڕانە تورکیەکە، ب١١، ل٥١-٦٦.

٢ لاسدان: قایل کردن، رازی کردن، إقناع.

٣ میم کمال، المرجع السابق ص٩٩.

بێگانەکانەوە گەیشتە ئەوپەڕی و لە فەرەنسای تێپەڕاند، کە زۆر پێشتر چالاکیی هەبووە، ئینگلیزەکان گەلێ قوتابخانەیان کردەوە بە تایبەتی لە گوندە دوورەکانی ناو دروزەکان.

چالاکیی نەتەوەیی عەرەبی و دژایەتیکردنی دەوڵەتی عوسمانی لە میسر و دەوڵەتەکانی تری عەرەبی بڵاو بوویەوە، واتا لە چواردەوری وڵاتی شام دەرچوو و هەموو ناوچە عەرەبییەکانی گرتەوە.

* * *

لەبەر ئەمە سوڵتان عبدالحمید چالاکیی گروپە ماسۆنیەکانی سنوردار کرد و چاودێریی خستە سەر جوڵانەوەیان، هەرچەندە نەیتوانی چالاکیی قوتابخانە بێگانەکان بەم رادەیە سنوردار بکات. سوڵتان هەوڵی دا سوود لە بانگەوازی کۆمەڵی ئیسلامی وەربگرێ و بانگاشەیەکی زۆری کرد لە پێناو یەکێتیی موسڵمانەکان و یارمەتیدانی یەکتری دژی دەوڵەتی عوسمانی، لەو چالاکیانەش دامەزراندنی هێڵی ئاسنینی حیجاز و بزوتنەوەی ئاوەدانکردنەوەی گشتی لە وڵات و گرنگیدانی بە مزگەفتەکان و هات و چۆکردن و سەردانی زانا موسڵمانەکان بۆ یەکتری و گەلێ کەسێتی عەرەبی گرنگی لەخۆی نزیك کردەوە.

لە ڕاپۆرتی باڵیۆزی ئینگلیزی (روسبری) لە ئەستەنبوڵ لە ساڵی ١٨٨٩ بۆ وڵاتەکەی ڕوونی دەکاتەوە، کە سوڵتان عبدالحمید ئابووریی وڵاتانی عەرەبیی بووژاندۆتەوە و ئاوەدانی کردۆتەوە.

* * *

سوڵتان عبدالحمید هەوڵیدا چالاکیی سەهیۆنی لە فەلەستین قەدەغە بکات و بە هەموو شێوازێکی لەگێن هەوڵی پارێزگاریی دا و ئەوەی لەبیر نەکرد، کە زۆر بە توندی تەگبیری ئەوە بکات، کە عەرەبەکان نەکەونە ژێر دەستی وڵاتە ڕۆژئاواییەکان هەروەك لە (یەمەن) کردی.

"سوڵتان عبدالحمید-بەپێی هەوڵ و تەگبیرە زۆرەکانی- توانیی بیرۆکەی نەتەوەیی عەرەبی بخنکێنێ کە هێشتا لە زگی دایکیدا بوو، عەرەبەکان بە درێژایی حوکمی

سوڵتان بە ڕاستگۆیی و دڵسۆزییەوە پەیوەستدار بوون پێیەوە.".

## ٨) هاندانی کوردەکان لەلایەن بەریتانیاوە دژی دەوڵەتی عوسمانی و هەڵوێستی سوڵتان عبدالحمید:

ئینگلتەرا لە چواریەکی یەکەمی سەدەی نۆزدەمەوە سیاسەتی هاندانی کوردەکانی دژی دەوڵەتی عوسمانی پەیڕەو کردووە، بۆ ئەوەی لەلایێ کورد و عوسمانی بکاتە دوژمن و لەلایەکی دیش دەوڵەتێکی کوردی لە دەوڵەتی عوسمانی جودا بکاتەوە.

بە دامەزراندنی کۆمپانیای هیندیی بەریتاتی، ئینگلیز زیاتر گرنگی بە عێراق دا، عێراقیش بەشێك بوو لە وڵاتی عوسمانی، بەریتانیا چەند کەسێکی هەنارد بە مەبەستی (پەیداکردنی بزوتنەوە لەنێو کوردەکان)، هەر کە ئەو کەسانە گەیشتنە بەغدا دەستیان بە گەڕان کرد لەنێوان هۆزە کوردەکان، هەروەها (کولهون)ی ئینگلیزی زۆر هەوڵی دا بۆ لاسدانی (اقناع) کوردەکان، کە یارمەتیی ئینگلیز بدەن بۆ سەربەخۆبوونیان.

هەروەها سەردانی بەکرێگیراوەکانی ئینگلیز بۆ ناوچە کوردیەکان زۆر بوو، بۆ ئەوەی هەوڵ بدرێ کە هۆزە کوردییەکان یەك بخرێن دژی دەوڵەتی عوسمانی.

بێگومان ئینگلیز بەرژەوەندیی ستراتیژیی لە ناوچەی (موسڵ) هەبوو، لەبەر ئەوە پەیوەندییان بە کوردەکان کرد، دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیش لە بەرژەوەندیی بەریتانیا بوو، چونکە پێکهێنانی ئەم دەوڵەتە و جودابوونەوەی لە دەوڵەتی عوسمانی دەبێتە ناوچەیەکی جیاکەرەوە و، ڕوسیا قەدەغە دەکات لەوەی کە بگاتە کەنداوی عەرەبی و ئاوی گەرم.



بەرامبەر هاندانی کوردەکان لەلایەن ئینگلیزەوە، سوڵتان عبدالحمید چەند هەنگاوێکی نا بۆ قەدەغەکردنی ئەمە، لەوانە: هەڵوێستە توندوتیژەکەی دژی دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەرمەنی لەسەر خاکی عوسمانی، بەمە ئەو کوردانەی لەو ناوچەیە دەژیان هەستیان بە ئاسایشکرد، هەروەها کوردەکانی لە هێرشە خوێناوییەکانی ئەرمەن پاراست، هەندێ زانای موسڵمانی نارده ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ-کە کوردەکان لەوێ

نیشتەجێبوون- بۆ ئامۆژگاریکردنی خەڵك و پشتگرتنی ئـاینی ئیسـلامی. ئـەم زانـا نێردراوانە ڕۆڵـی خۆیـان بینـی لـە وشـیارکردنەوەی کوردەکـان بەرامبـەر چاوتێـبڕینی ڕۆژئاوایی. هەروەها سوڵتان عبدالحمیـد چـەند هـەنگاوێکی نـا و پابـەند بوونـی مـیرە کوردەکانی بەخۆی و بە دەوڵەتەوە مسۆگەر کرد و چەند یەکەیەکی سەربازیی حـەمیدیی لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ لە کوردەکان پێکهێنا بۆ ئەوەی دژی دەستدرێژییەکانی ئەرمـەنی بوەستن.[١]

١ قوجەباش، سفحات ١٧٢و ١١٢ و ١٧٦ و ٢١٠ و ٢٠٩.

# پاری سێیەم

# سیاسەتی دەرەوەی سوڵتان عبدالحمیدی دووەم

## (چاوتێبڕینی دەوڵەتە ئەوروپییەکانی دی لە دەوڵەتی عوسمانی)

### ١) چاوتێبڕینەکانی نەمساوی: سیاسەتی (لە ڤیەننا تا سلانیك):

دوو دەوڵەت ڕۆڵیکی گەورەیان بینی لە ململانێی هەمیشەیی دژی دەوڵەتی عوسمانی لەکاتی بەرەو لوتکە چوونی و وەستانی، یەکێکیان ڕۆژهەڵاتیە کە ئێرانە و، ئەویتر ئەوروپییە کە نەمسایە.

نەمسا پەیڕەویی سیاسەتی دوورخستنەوەی (مەجەر) و خەڵکی (دانوب)ی (الطونة) کرد لە فەتح کردنی عوسمانیەکان لە ئەوروپا. بەڵام ئەم سیاسەتە خۆی لەبەر توندوتیژیی عوسمانیەکان نەگرت. بۆیە نەمسا بە ناچاری تا ساڵی ١٦٨٣ بەو باروزروفە قایل بوو، لەو ساڵەدا عوسمانیەکان لە بەرامبەر شوورەکانی (ڤیەننا) شکستیان هێنا. بەمجۆرە نەمساویەکان ئاواتی دوورخستنەوەی عوسمانیەکان بۆ خوارووی (دانوب)یان بۆ گەڕایەوە.

سیاسەتی نەمسا لە سەدەی هەژدە بە ئاشکرا گەیشتنە (سلانیك) بوو-شارێکی یۆنانی بوو و لەو کاتەدا کەوتبوە ناو سنوری عوسمانی- بۆ ئەم مەبەستە نەمسا سیاسەتی پابەندبوونی دیانەکانی دەوڵەتی عوسمانیی بەخۆیەوە بەستا و بۆ جێبەجێکردنی مەبەستەکانی بەکاری هێنان.

بە تەواوی لەو کاتەدا ڕوسیا بەربەرەکانێی نەمسای دەکرد، تەنگاوبوونی نەمسا لەو کاتە زێتر بوو هەر کە ڕوسیا هەردوو ناوچەی (ئەفلاق) و (بوغدان)ی عوسمانیی داگیرکرد (لە ڕۆمانیای ئێستا)، بەمجۆرە (دانوب) بەرامبەر ڕوسیا هیچ کۆسپێکی لەبەر نەبوو، لەبەر ئەوە نەمسا-سەرەڕای چاوتێبڕینەکانی لە وڵاتی موسڵمانان- یەکسەر وەڵامی دەوڵەتی عوسمانیی دایەوە، کە بە هەردووکیان پێشڕەویی ڕوسیا لە خاکی عوسمانی ڕاگرن. بەم پێیە نەمسا لە (٦)ی یۆلیۆی ١٧٧١ع پەیماننامەیەکی مۆرکرد کە ئەمە دەقەکەیەتی: "پێویستە نەمسا بە هۆکارە دیبلۆماسیەکان یارمەتیی دەوڵەتی عوسمانی

بدات، یا بە جەنگێن دژی ڕوسیا بـۆ گێڕانـەوەی ئـەو زەویانـەی کـە هێزەکـانی ڕوسـی داگیریان کردووە.".

هێنـدەی پێنـەچوو نەمسـا لەگـەڵ ڕوسـیا پێکـهات دژی دەوڵـەتی عوسمـانی، دوا هەوڵدانی بنەڕەتییان بۆ دابەشکردنی ئەورووپای عوسمانی لەنێوان خۆیان، پرۆژەی (گریـك Grek) بوو لە ساڵی ١٧٨٦ع، ئەم پرۆژەیە جێبەجێ نەکرا، بۆیە نەمسا وای دەربـڕی کە سیاسەتەکەی پارێزگاریکردنی یەکێتی خاکی عوسمانیە، (مترنیخ)ی سەرۆك وەزیرانی نەمساوی خاوەنی ئەم سیاسەتە بوو.

ڕوسیا دوژمنکـاریی خـۆی بەرامبـەر نەمسـا و عوسمـانی نیشـان دا. لـەو کاتـەدا ئیمپراتۆریـەتی نەمسـا لـە گـەلێ ڕەگـەزی جیـاواز پێکـهاتبوو: جـەرمان و سـلاف و مەجەریەکان، دەسەڵات لە دەست ڕەگەزی جەرمانی بوو. هەروەها دەوڵەتی عوسمـانیش لەگەلێ ڕەگەزی جیاواز پێکهاتبوو. تورك و عــەرەب و رۆم و (یۆنانیـەکان)ئـەرناتوت و (ئەلبانیەکان) سلاف و کورد و چەرکەس و هیدی، دەسەڵات لەدەست تورك بوو. ڕەگەزی سلافی لە هەردو دەوڵەتەکەدا هەبوو، ئەم ڕەگەزە پشـت و پـەنای ڕوس بـوو، ڕوسـیاش دژی هەردوو دەوڵەتەکە بەکاری دەهێنا بۆ جێبەجێکردنی چاوتێبڕینـەکانی لـە هـەردوو دەوڵەتەکەدا.

لە ئەنجامی سیاسەتی کاتیی نەمسا، یەکە سەربازیەکانی نەمسـا لەگـەڵ هێزەکـانی عوسمانی بەشدارییان کرد لە چوونە ناو میرنشـینەکانی (دانـوب) لـە ٢٢ی ئۆکتۆبـەری ١٨٥٤ دژی هێزەکانی ڕوسیا، لە ئەنجامی دۆڕاندنی ڕوسیا پەیماننامەی پاریسـی ١٨٥٦ مۆرکرا.

نەمسا چاری نیە دەبێ بگەڕێتەوە سەر بنەچـەی مەبەسـتی خـۆی، کـە بریتیـە لـە جێبەجێکردنی چاوتێبڕینەکانی لە خاکی دەوڵەتی عوسمـانی. نەمسـا دوای پەیماننامـەی پاریس بە توندی لایەنگریی یەکێتی خاکی عوسمانیی نەدەکرد، هۆیەکی تریش هەیە بـۆ ئەمە، نەمسا لەوە دەترسا ڕوسیا ڕەگەزە سلافیەکانی ناو نەمسا بورووژێنـێ، لەوکاتـەدا نەتەوەی سلافی لەباری وروژاندندا بوو.

لە سەرەتای دوا چواریەکی سەدەی نۆزدەی عیسایی نەمسا هـەموو گرنگیـی خـۆی دایە ئەورووپای باشور و ناوچەی بەلقانی عوسمانی، بۆیە لایەنگریی ڕەگـەزە سـلافیەکانی

دەکرد و هانی دان بۆ یاخیبوون دژی دەوڵەتی عوسمانی. لەم لایەنگریەش سێ مەبەستی هەبو: یەکەم خۆی وا دەرخست بۆ ڕوسیا کە دەیەوێ قایلی بکا، نەخۆ کێشەی ناوەخۆی بۆ دروست بکات، دووەم لەپێش سلافیەکانی ناو ئیمبراتۆریەتی نەمساوی خۆی وا دەربخات کە هاوسۆزی سلافەکانی ناو دەوڵەوتی عوسمانیە، سێیەم جێبەجێکردنی خەونە سەرەکیەکەی لە ڕووخاندنی دەوڵەتی عوسمانی تاکو نەمسا دەسەڵاتی بەسەر (ڤیەننا)ی پایتەخت تا (سلانیك) هەبێت.[1]

ڕوسیا و نەمسا یارمەتیی یاخیبووەکانی بۆسنە و هەرسکیان دا دژی دەوڵەتی عوسمانی، بەکرێگیراوەکانی ڕوس و جەردەکانی سلافی کە لەناو نەمسا مەشقیان پێ دەکرێ، هەموو یارمەتیەکی پێویستیان پێشکەش یاخیبووەکان کرد دژی عوسمانیەکان، ئەم یارمەتیدانانەش بوونە هۆی بەهێزبوونی یاخیبووەکان و ئەمەش بووە هۆی سەرەتای پەیدابوونی دژایەتی دژی عوسمانیەکان لە (سیرب) و چیای ڕەش(جبل الاسود).[2]

لەساڵی ١٨٧٥ نەمسا بە ئاشکرا لایەنگریی یاخیبووەکانی دەکرد دژی دەوڵەتی عوسمانی لە بۆسنە و هەرسك (لە یۆگسلافیای ئێستا). چونکە نەمسا بەهیوای ئەوەبوو دەست بەسەر ئەو خاکانەدابگرێ و بیخاتە سەر ئیمبراتۆریەتەکەی. ئەم مەبەستە نەمساوییە وایکرد کە بۆسنە و هەرسك ببنە بابەتی سەرەکی لەنێوان ڕوسیا و نەمسادا و بەپێی پەیماننامەی بەرلینی ساڵی ١٨٧٦ نەمسا بەشێوەیەکی کاتی (بۆسنە) و (هەرسك)ی گرت و لەو پەیماننامەیەدا هاتووە کە (سنجقی یینی بازاڕ لە دەست عوسمانیەکان بمێنێ) نەمسا گەر بەپێویستی زانی مافی خۆیەتی کە ئەم سنجقە بگرێ. سنجقی (یینی بازار) سنووری نێوان بۆسنە-هەرسك و مەقدۆنیایە- وایلێهات بەرەو سلانیك کراوەبوو، ئەمەش هیوای نەمسا بوو لە خاکی عوسمانیدا.

دوای ئەمە نەمسا-تا شۆڕشی (الاتحاد والترقی) ساڵی ١٩٠٨ع- پەیڕەویی سیاسەتی کزکردنی دەوڵەتی عوسمانیی گرتە بەر لە چوارچێوەی پارێزگاریکردنی باروزروف لە وڵاتی بەلقان و مانەوەی وڵاتی بەلقان لەژێر کارگێڕییەکی کزی دەوڵەتی عوسمانیدا. بەمجۆرە بۆ نەمسا ئاسان دەبێ کە ئەو ناوچە عوسمانیەی خەونی پێوە دەبینی لرفی بکات.

---

١ سلێمان قوجەباس، الجامعة السلافیة (الصقلیة) في البلقان، ص١٩١-١٩٧، اتانبول ١٩٨٦.

٢ قارال، التاریخ العثمانی، ج٧، ص٧٩.

شۆڕشی (الاتحاد والترقی) ساڵی ١٩٠٨ ئاواتەکانی نەمسـای بـەهێز کـرد لەدەسـت بەسەراگرتنی خـاکی بۆسـنە و هەرسـکی عوسمـانی. هـەر کـە بولگاریـەکان لـە (٥)ی ئۆکتۆبەری ١٩٠٨ سەربەخۆییان لە دەوڵەتی عوسمانی ڕاگـەیاند، نەمسـا خـەریکبوونی دەوڵەتی عوسمانیی بەهەل زانی و ئەویش بە ڕەسمی بۆسنە و هەرسـکی بەئیمپراتۆریـەتی نەمساوی لکاند و ئەمەی لـە (٦)ی ئۆکتۆبـەری ١٩٠٨ ڕاگـەیاند، واتـا ڕۆژێـك دوای شۆڕشی بولگاری.

نەمسا پەیڕەویی سیاسەتی (لە ڤیەننا تا سلانیك)ی کرد و لە ساڵی ١٩١٤ جـەنگی لەسەر سیربی دراوسێی ڕاگەیاند. بەڵام بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانی جوگرافیـای جیهانی لە رەگو ریشەوە گۆڕی.[1]

## ٢) چاوتێبڕینەکانی ئیتالی:

ئیتاڵیـا دوای یەکبوونەکـەی خـۆی خسـتە نـاو گێژەنـی (ململانێـی دەسـت بەسەراگرتن)ەوە، نزیکترین شـوێن بـۆ جێبـەجێکردنی سیاسـەتەکەی زەویـەکانی نزیـك خۆیەتی، کە خاکی عوسمانین و بریتین لە تونس و ئەلبانیا و تەڕابلسی ڕۆژئاوا.

تەڕابلسی ڕۆژئاوا (لیبیا) بەشێك بوو لە خەونەکانی (ماتزینی)ی سـەرۆك وەزیرانـی ئیتاڵیا کە گوتی: "باکوری ئیفریقیا میراتی ئیتالییە."، بەڵام فەڕەنسا تونسـی گـرت و ئینگلتەرا میسری گرت و تەنیا تەڕابلسی ڕۆژئاوا لەبەردەم ئیتاڵیا مایەوە.

ئیتاڵیا وێنەی سیاسەتی خۆی لە تەڕابلسی ڕۆژئـاوا بـە سـێ قۆنـاغ گـرت، یەکـەم چارەسـەرییە ئاشـتیەکان ئەمـەش بـە دامـەزراندنی قوتابخانـە و بـانك و گـەلێ لـە دامەزراوەکانی تر. دووەم هەوڵدانی ئیتاڵیا بە ڕێگەی دیبلۆماسی تا دەوڵەتەکان دان بـە ئاواتەکانی ئیتاڵیا بنێن لە داگیرکردنی تەڕابلسی ڕۆژئاوادا. سێیەم ڕاگـەیاندنی جـەنگ لەسەر دەوڵەتی عوسمانی و داگیرکردنی کارەکی(فعلی).

سیاسەتی ئیتاڵیا وا وەسف دەکرێ کە سیاسەتێکە سەرنجی بەرامبەر ڕاناکێشـێ بـۆ جووڵانەوەکانی، بەپێچەوانەی سیاسەتی بەریتانی یا فەڕەنسی لـەو کاتـەدا. ئیتاڵیـەکان زۆر (بەهێوری) و (دانایی) دەجووڵانەوە بێ ئەوەی هەستی عوسمانیەکان بوروژێنن.

١ قوجەباش، المرجع السابق، صفحات: ٢٠٢، ٢٠٤، ٢٠٦، ٢٢٣.

بەڵام سوڵتان عبدالحمید (ئەم پارەوە چەورەی قووت نەدا) لەسەوداکردن دا، بەڵکو زۆر ئاگادار بوو و لەگەڵ سەرچاوەی جیاواز زانیاری لەسەر چالاکیی ئیتاڵیەکان و مەبەستەکانیان بۆ دەهات، لەو زانیاریانەش کە دەڵێ "ئیتاڵیەکان قوتابخانە و بانك و دامەزراوە خێرخوازەکانیان، کە لە ویلایەتەکانی عوسمانی جا لە لیبیا یا لە ئەلبانیا بێ، کە دایان مەزراندووە مەبەستێکی تریان هەیە کە بریتیە لە جێبەجێکرنی چاوتێبڕینەکانی ئیتاڵیا لە دەست بەسەراگرتنی ١) تەرابلسی ڕۆژئاوا، ٢) ئەلبانیا، ٣) ناوچەکانی ئەنادۆڵ کە دەکەونە سەر دەریای سپی ناوەڕاست (ئەزمیر، ئەسکەندەرۆنە، ئەنتالیا)یە."

سوڵتان عبدالحمید گەلێ هەڵس و کەوتی توندی نواند بەرامبەر چاوتێبڕینەکانی ئیتاڵیا و هەر کە هەستی کرد کە لیبیا دەستدرێژییەکی چەکداری دەکرێتە سەر، ١٥٠٠٠ سەربازی هەنارده لیبیا بۆ یارمەتیدانی هێزەکانی عوسمانی، ئیتاڵیا هەرکە هەستی بە خۆئامادەکردنی عوسمانی کرد بیرۆکەی داگیرکردنی لیبیای دواخست. سوڵتان عبدالحمید زۆر بە وشیارییەوە سەیری جوڵانەوەکانی ئیتاڵی دەکرد و زۆر بە وردی و تاکەکەسی خەریکی بەدواداچوونی بوو و ئاگاداری هەموو نوسراوە دیبلۆماسیەکانی نێوان (یلدیز) و باڵیۆزی دەوڵەتی عوسمانی) لە ڕۆما و والیی تەرابلسی ڕۆژئاوا بوو.

یەکگرتووەکان ڕاپەڕین و سوڵتان عبدالحمیدیان لادا و هیچێکیان لەتوانای رامیاریی سوڵتان و وریایی و هەستیاریی نەبوو بەرامبەر جوڵانەوەو چاوتێبڕینەکانی ئیتاڵی لە لیبیادا.

میریی (اتحاد والترقی) چەکی لە لیبیا نەهێشت و (محمود شوکت پاشا)ی سەرکردەی کودەتای (اتحادی) فەرمانی دا، کە بەشێکی گرنگی هێزەکانی عوسمانی لە لیبیا بە چەك و تفاقە سەربازیەکانیەوە بگوازرێنەوە یەمەن. ئەمەش کارێکی سەربازی زۆر هەڵە بوو بە زمانی (محمود مختار پاشا). هەروەها میریی کودەتای (اتحاد وترقی) هەنگاوێکی سەیری نا و (ابراهیم پاشا)ی والیی تەرابلسی لادا و داوایکرد بێتە ئەستەنبۆل بێئەوەی یەکێکی لەجێگا دابنێ. ئەم والییە بە وریایی بەناوبانگ بوو و هەمیشە لە مەترسیەکانی ئیتاڵیا ئەستەنبولی ئاگادار دەکردەوە. ئیتاڵیەکان بە رادەیەکی وا رقیان لێی بوو کە وەزارەتی دەرەوەی ئیتاڵی بروسکەیەکی سوپاسنامەی بۆ وەزارەتی دەرەوەی

عوسمانی و هەموو میریی (اتحاد وترقی) هەنارد دوای لادانی (ابراهیم پاشا) لە لیبیا.

لیبیا بەبێ والی مایەوە تا ئیتاڵیا داگیری کـرد، ئیتاڵیـا ٣٠٠٠٠ هـەزار سـەربازی ئامادەکراو بە نوێترین چەکی دابەزاندە سەر کەنارەکانی لیبیا و تەنها ١٧٠٠ سـەربازی کەم چەکیان کەوتە بەرامبەر لە لیبیا.

جەنگی ئیتاڵیا لە لیبیا بە پەیماننامەی (اوش) کۆتایی پێهات لە (١٨)ی ئۆکتۆبەری ١٩١٢، بەپێی ئەم پەیماننامەیە هێزی عوسمانی لە لیبیا کشایەوە.[١]

## ٣) چاوتێبڕینەکانی ڕوسیا:

ڕوسیای قەیسەری-بـەپێی بـاروزروفی ئـایینی و جوگرافـی و ئـابووری- پـەیڕەویی سیایەتی (گەیشتنە ئاوی گەرم)ی کرد.

(بوترسی گەورە ١٦٢٧-١٧٢٥) لە وەسیەتەکەی بۆ ڕوس (لەبڕگـەی نـۆ و یـازدە و سێزدە)دا دەڵـێ: پێویسـتە ململانێـی ژیـاری دژی عوسمانیـەکان بکـرێ، تـا دەوڵـەتی عوسمانی لەناو دەبرێ.

(بوترسی گەورە) لە بڕگەی نۆی وەسیەتەکەی دەڵێ: "بەپێی توانا لە قوسـتەنتینیە و هیند نزیك دەبینەوە، ئەوەی قوستەنتینیەی هەبێ جیهانی هەیە، لەبەر ئەمـە پێویسـتە بەبەردەوامی لەگەڵ عوسمانیەکان بجەنگین.".

لە بڕگەی یازدەدا دەڵێ: "هاوبەشیی نەمساویەکان دەکەین لە دەرکردنی عوسمانیەکان لە ئەوروپا.".

لە بڕگەی سێزدەدا دەڵێ: "دوای ئەوەی دەسـت بەسـەر وڵاتـی عوسمـانی دادەگریـن، سوپاکانمان کۆدەکەینەوە و کەشتیەکانمان دەچنە ناو دەریای بەلتیك و دەریای ڕەش، ئنجا وتووێژ لەگەڵ فەڕەنسا و نەمسا دەکەین لەسەر دابەشکردنی جیهان.".[٢]

لەبەر ئەوە ڕوسیا دەستیکرد بە وروژاندنی گەلێ جەنگ دژی دەوڵـەتی عوسـمانی و چەند پارچەیێ لە خاکەکەی داگیر کرد پارچـە دوای پارچـە، بـەڵام لـەو شـوێنانەی کـە نەیتوانی دەستی بەسەردا بگرێ، هەوڵی دا کە چەند دەوڵەتێکی دیانی لێ پـەیدا بکـا،

١ قوجەباش، المرجع السابق، صفحات: ٢٠٢، ٢٠٤، ٢٠٦، ٢٢٣.

٢ ابراهیم حلمی بگ، التحفة الحلیمیة في تأریخ الدولة العلیة، ص٢١٤، القاهرە ١٩٠٥ع-١٣٢٣ك.

وەکو: رۆمانیا و بولگاریا و سیرب و یۆنان.

بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتی ڕوسی، ڕوسیا بەردەوام هەوڵی دەدا کە هێرش بکرێتە سەر دەوڵەتی عوسمانی بۆ کزکردنی و ماندوکردنی، کە هەر خۆشی کزبوو تا بیڕووخێنێ و لە ئەنجامدا ڕوسیا -بەپێی خەونە چاو تێبڕینەکانی- دەست بەسەر هەردوو تەنگەبەر(مضیق)ی (دەردەنیل) و (بسفۆڕ)دا بگرێ و لەوانەوە بەرەو دەریای ناوەڕاست بڕوات، بۆ ئەمەش ڕوسیا دژی سوڵتان عبدالحمید هەستا و لە ساڵانی ۱۸۷۷-۱۸۷۸ع جەنگی دژی دەوڵەتی عوسمانی ڕاگەیاند، واتا: جەنگی عوسمانی ڕوسی یاخود جەنگی (۹۳) کە لە هەندێ سەرچاوە باس دەکرێت، جەنگەکەش لە دوو بەرە بوو:

یەکەم: بەرەی دانوب (ڕووباری تونە):

ڕوسیا (۲۵۰,۰۰۰) سەرباز و چەك و تفاقێکی زۆری هەبوو، بە یارمەتی ڕۆمانیا کە (۵۰,۰۰۰) سەربازی هەبوو، ئەمانە دژی هێزەکانی عوسمانی لە دانوب وەستان کە ژمارەیان (۲۰۰,۰۰۰) سەرباز بوو، هێزەکانی ڕوسی توانییان لە ڕووباری (تونە) بپەڕنەوە و بەرەو پێش چوون، عوسمانیەکان لەم جەنگەدا سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەستهێنا و قوربانییەکی زۆریان دا. ڕوسەکان هێرشیان کردە سەر شارۆچکەی (بلاونة).

تەنیا هێزەکانی ڕوسیا هێرشی نەدەکردە سەر (بلاونة) بەڵکو هێزەکانی ڕۆمانیشی لەگەڵ بوو، ئەم دوو هێزە شارەکەیان بۆمباباران کرد، کە هێزەکانی عوسمانیشی تێدا بوو، ژمارەی تۆپەکانی عوسمانی (۵۸) بوو بەرامبەر (۸۳۲) تۆپی ڕوسی و ڕۆمانی. عوسمانیەکان دوای ئەوەی (۱۱٤) هێزی ڕوسی و ڕۆمانییان لەناوبرد، لەم جەنگەدا سەرکەوتن.

سوڵتان عبدالحمید ئەمەی بە سەرکەوتنێکی مەزن لە قەڵەم دا، سەرکردەی سوپایەکەی (عثمان پاشا) شایانی نازناوی (غازی)یە، ئەمە نازناوێکی خۆشەویستە لە مێژووی سەربازیی عوسمانیدا.

ڕوس و ڕۆمانەکان توانییان ڕێگەی (سۆفیا-بلاونە) دابخەن و بەجۆرە (بلاونە) لە هەر چوار لاوە گەمارۆ درا، هێزەکانی عوسمان پاشا چەك و فیشەکیان کەمبوو، مەترسی هەڕەشەی لە هێزە گەمارۆدراوەکەی کرد، بۆیە بەناچاری ڕووی لە هێڵەکانی دوژمن

کرد.

لە (١٠)ی دێسەمبەری ١٨٧٧ عوسمان پاشا بە هێزەکەیەوە هێرشێکی توند و تیژیان کردە سەر هێڵەکانی ڕوسی و ڕۆمانی، یەکەم هێڵی دوژمنیان بڕی، بەڵام گوللەیەك بە ئەژنۆی کەوت و بەناچاری خۆی دایە دەست لە ترسی لەناوچوونی سەربازەکانی.

ڕوسەکان سەریان سوڕما لە ئازایەتیی عوسمان پاشای دوژمنیان، سەرکردەی گشتیی هێزەکانی ڕوسی (الگراندوق نیقولا) پیرۆزبایی لە عوسمان پاشا کرد لەبەر بەرگرییە بێ وێنەکەی و شمشێرەکەی دایەوە دەستی لەبەر ئارام و توانای جەنگینی، لەمانگی دێسەمبەری هەمان ساڵ ١٨٧٧ عوسمان پاشا نێردرایە ڕوسیا، قەیسەر زۆر بەڕێزەوە پێشوازیی کرد و وەکو دیلێ هەڵس و کەوتی لەگەڵ نەکرا.

* * *

دوای ئەمە هێزەکانی ڕوسی و ڕۆمانی بەرەو پێش چوون و دەستیان بەسەر هەندێ شاری گرنگ و ستراتیژی دا گرت، لەوانە (سۆفیا و قیزانیق و فیلبە و ئەدرەنە)، ئەم هێزانە گەیشتنە دەوروبەری (آیاستفانوس) لە نزیك ئەستەنبۆڵ.

لە بەرەی قۆقاز هێزەکانی عوسمانی لە ژمارە و چەك و تفاق هاوشانی هێزەکانی ڕوسیای تاوانکار نەبوون، ئەم هێزانە بەرەو پێش چوون و دەستیان بەسەر زۆر شوێنی گرنگ دا گرت وەکو (بایەزیدی ڕۆژهەڵات و ئەردەهان). بەڵام عوسمانیەکان لە هەردوو جەنگی (زیوین و حایلاز) سەرکەوتن و ئینجا لە جەنگی (کدیك لار) و ئەحمەد موختار پاشا بەرگرییەکی پاڵەوانانەی کرد و لەبەر ئەوە ئەویش نازناوی (غازی)ی پێدرا، ئەحمەد پاشا بە ناچاری کشایەوە ئەرزەڕووم. ڕوسیەکان دەستیان بەسەر (قارس) دا گرت، بەڵام نەیانتوانی ئەرزەرووم بگرن.

ئەم جەنگە بە پەیماننامەی (ایاستفانوس) لە ١٨٧٨ کۆتایی هات دوای ئەوەی ڤیکتۆریای شای بەریتانیا خۆی خستە ناو کێشەکەوە بۆ قایل کردنی ڕوسیا.

پەیماننامەکە لە (٣)ی ئازاری ساڵی ١٨٧٨ بەسترا، سەفوەت پاشا لە لایەن عوسمانیەکانەوە بەگریانەوە مۆری کرد، چونکە ئەم پەیماننامەیە زۆر مەرجی نالەباری خستە سەر عوسمانیەکانەوە.

سوڵتان عبدالحمید هەر لە سەرەتاوە بەم جەنگە قایل نەبوو، بۆیە دانی بە پەیماننامەکە نەنا و زۆر هەوڵی سیاسی و دیپلۆماسی دا تاتوانی بەریتانیا لاس بدا و بیکاتە لای خۆی.

بەم شێوەیە سوڵتان دوو شتی دەستەبەر کرد، یەکەم: بەستانی کۆنگرەی بەرلین بۆ سووک کردنی شوێنەوارەکانی پەیماننامەی (ئەیاستفانۆس)، دووەم: ترساندنی ڕوسیا بەهۆی بەریتانیاوە تا واز لە جەنگ بهێنێ.

پەیماننامەی بەرلین لە (١٣)ی یۆلیۆی ١٨٧٨ بەسترا هەروەك لەمەوبەر ئاماژەی پێکرا.[1]

* * *

بەجۆرە سوڵتان عبدالحمید دەستەبەریی دەست تێوەرنەدانی ڕوسیای کرد دژی دەوڵەتی عوسمانی وەك چۆن لە وەسیەتەکەی بوتروسی گەورە هاتووە. هەروەها چەند دەسکەوتێکی بۆ دەوڵەت مسۆگەر کرد و زیانەکانی پەیماننامەی یەکەمی کەمکردەوە.

ڕووداوەکانی هەردوو پەیماننامەکان بلیمەتیی سوڵتان عبدالحمیدی نیشان دا لە رووی سیاسیەوە و، توانی گرژی پەیدا بکات لە نێوان ڕوسیا و ئەڵمانیا.

ئیمپراتۆری ئەڵمانی (غەلیومی دووەم) لە یاداشتەکانیدا دەڵێت: "گفتوگۆم لەگەڵ یەکێ لەو گەورە سەرکردانە کرد کە لە خزمەتی دەربارەی قەیسەری بوو لەسەردەمی ئەلکسەندەری دووەمی قەیسەری ڕوسیا لە بارەی پەیوەندی نێوان هەردوو وڵات، بەم سەرکردەیەم گوت: من هەست بە گۆڕانێکی دیار دەکەم لەو پەیوەندییانە. پێی گوتم: سووچەکە هەمووی لەسەر کۆنگرەی بەرلینە! ئەوە هەڵەیەکی گەورە بوو کە (بسمارك) کردی و برادەراتیە کۆنەکەی نێوانمانی لەناو برد و دەربارەی ڕوسی و میریی ڕوسی بە قایان بە ئەڵمانیا نەما و سوپا وا هەست دەکات کە تاوانێکی گەورەی لەسەر کراوە، دوای ئەو جەنگە خوێناویەی کە لە ساڵی ١٨٧٧ ئەنجامی دا".[2]

---

١ لە بارەی جەنگی عوسمانی و ڕوسی و ئەنجامەکانی بنواڕە نوورتونە، ل١٤٤-١٥٩.

٢ مذكرات غليوم الثاني، ص١٨-١٩، محب الدين الخطيب و أسعد داغر وەریان گێڕاوەتەوە عەرەبی، قاهيرە ١٣٤١ك.

دوای ئەوەی ڕوسیا بە تەواوی تێگەیشت کە سوڵتان عبدالحمید رای گشتی ئـەوروپی و دەوڵەتـە ئەوروپیـەکانی لێکردۆتـە دژ و هیـچ هـەلێکی لـە دەسـت نـەماوە کـە چاوتێبڕینەکانی جێبەجێ بکا و جەنگ لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی بکات، سیاسەتی ڕوسی بەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی شێوەی جەنگی سـاردی گـرت و هاونیشـتمانیە دیانـەکانی دەوڵەتی عوسمانی هان دەدا و دەیوروژاندن بۆ یاخیبوونیان دژی دەوڵەت، هـەروەك چـۆن لە دوورگەی (کریت) ڕوویدا و هانی بولگارییـەکانی دەدا بـۆ یـاخیبوون دژی دەوڵـەتی عوسمانی و هێزەکانی کزکرد.

## ٤)چاوتێبڕینەکانی فەڕەنسیەکان:

فەڕەنسا هەر لە بەرپابوونی شۆڕشی فەڕەنسیەوە چاوی لە پێکهاتنی ئیمپراتۆریـەتی فەڕەنسی بوو، ناپلیۆن پۆناپارت بە داگیرکردنی میسر دەستی پێکرد، بـەڵام پرۆژەکـەی سەری نەگرت و گەڕایەوە وڵاتەکەی.

لەساڵی ١٨٣٠ فەڕەنسا جەزائیری گرت و بووە دراوسێی تونس.

لەسەردەمی سوڵتان عبدالحمید لەکاتی بەستانی کۆنگرەی بـەرلین ١٨٧٨، فەڕەنسـا ئەمـەی بەهـەل زانـی و پلانـی گرتنـی تونسـی دارشـت و بـیروبۆچوونی دەوڵەتـە ئەوروپیەکانیشی سازدا بۆ قبووڵ کردنی ئـەم پلانـە. مـیریی فەڕەنسـی رایگـەیاند کـە هۆزێکی تونسی دەستدرێژی کردۆتە سەر جەزائیر، لەبەر ئەمە لە (٤)ی نیسـانی ١٨٨١ هێزێکی (٢٠,٠٠٠ سەرباز) بۆ تونـس هـەنارد بـەبیانووی دەسـتەبەرکردنی ئاسایشـی سنوور، بەڵام ئەم هێزە چووە ناو تونسەوە و والیی تونسـی عوسمـانیی (محمـد الصـادق) ناچار کرد کە لە (١٢)ی مایۆی ساڵی ١٨٨١ پەیماننامەی (باردۆ) مۆر بکات و دانی نا بەدەست بەسەراگرتنی فەڕەنسی لەسەر وڵاتەکەی.

میریی عوسمانی زۆر بەتوندی ناڕەزایی لەسەر ئەم داگیرکردنە دەربڕی، بەڵام نەیتوانی سوپایەك بنێرێ بۆ جەنگین لەگەڵ فەڕەنسا. دەوڵەتی عوسمانی لەو سەردەمەدا کـەوتبووە ناو گەرمەی چاوتێبڕینـەکانی ئەوروپیـەکان، بۆیـە بـەهیچ شـێوەیێ نـەیتوانی بـەرگری بکات.[١]

١ قارال، ج٨، المرجع السابق، ص٨٦ و أجيق كوز أوغلو ٣٧٦-٣٧٧.

## ٥) چاوتێبڕینەکانی ئەڵمانی: (سیاسەتی فراوانبوونی ئەڵمانی بەڕێگەی ئاشتیەوە):

ئەو شوێنە داگیرکراوانەی کە ئەڵمانیا لە کاتی (بسمارك) داگیری کردبوو بە کەڵکی نیشتەجێبوون نەدەهاتن، دانیشتوانی ئەڵمانیا بەرەو زیادبوون دەچوو، بۆیە ئەڵمانیەکان بیریان لەوە کردەوە کە بەرەو ئەنادۆڵی عوسمانی بچن بۆ چارەسەرکردنی کێشە ئابووریەکانی ئەڵمانیا، بەتایبەتی کە هێزی بەرهەمهێنانی پیشەسازی ئەڵمانی لەبرەو دابوو و بازرگانیەکەی لە فراوانبوون بوو. تا وایلێهات کە "دوا ڕۆژی ئابووریی ئەڵمانیا بە تواناکانی ئەستەنبۆڵەوە پەیوەست بوو.". هەروەها دیدگای ئابووریی ئەڵمانیا بەرەو ئاسیای بچووك و چاڵاوی دیجلە و فورات و سوریا چوو. ئەمەش درێژە پێدانی ئەنادۆڵە.

لەبەر ئەمە ئەڵمانیا رووی لە هاوڕێیەتیکردنی جیهانی ئیسلامی کرد و ئیمپراتۆر (غەلیۆمی دووەم) بە تاسەوە بۆ ئەمە دەچوو، ئەڵمانیا بیری لە کردنەوەی هێڵی ئاسنینی نێوان بەرلین و ئەنادۆڵ کردەوە، هەروەها ئەو هێڵە ئەنادۆڵ بە سوریا و عێراق دەبەستێتەوە.

تاسە و ئارەزووی ئەڵمانیا لەگەڵ ویستی سوڵتان عبدالحمید یەکی گرتەوە، کە دەیویست لە دەست ڕۆژئاواییەکان رزگار بێت و جۆرە پێشبڕکێیەکی نێودەوڵەتی پەیدا بکات و چاو تێبڕینەکانی ڕۆژئاوایی لە دەوڵەتی عوسمانی دوور بخاتەوە، "چونکە سوڵتان بەقای (ثقة) بە ئەڵمانیەکان هەبوو بەقەد دوورکەوتنەوەی لە ڕوسیا و ڕقی لە فەرەنسا دەبوویەوە و لە ئینگلتەرا دەترسا."، لەم بارەیەوە سوڵتان دەڵێ: "گوتم و دەیڵێمەوە: هەر کارەساتێ تووشمان ببێت هەردەبێ ئینگلتەرا سەرچاوەکەی بێت، فەرەنسیەکان بەهیچ شێوەیێ چاکەیان خۆش ناوێ، کارەساتی تایبەتی خۆم لەسەر دەستی ئینگلیز بوو، کوژرانی مامم عبدالعزیز دەستی ئینگلیزی تێدا بوو.. کارەساتەکە لەسەر دەستی مەدحەت پاشا و پیاوەکانی روویدا".

نزیکبوونەوەی عوسمانی و ئەڵمانی لەساڵی ١٨٨٠ لە بواری ڕۆشنبیریەوە دەستی پێکرد، دەوڵەتی عوسمانی ئەفسەرەکانی دەنارده ئەڵمانیا بۆ خوێندن و مەشقی سەربازی و جەنگی، ئینجا بازرگانی کەل و پەلی جەنگیی ئەڵمانی دەستی پێکرد و فرۆشرایە عوسمانیەکان.

ئەدوای ئەمە (ئەلفرید کوالا) کە کارسازێکی ئەڵمانی بوو و بەناوی (دویتش بانك) دەسوورایەوە لەگەڵ بانقێکی ئەڵمانی مافی بەکارخستنی هێڵی ئاسنینی (حیدر پاشا- أزمید) و مافی دامەزراندنی هێڵی ئاسنینی (أزمید- أنقرة)یان وەرگرت.

لە ساڵی ١٨٨٩ ئیمپراتۆر غەلیومی دووەم سەردانی ئەستەنبۆڵی کرد لەو کاتەی سەری لە یۆنان دەدا. سوڵتان عبدالحمید زۆر رێزی لێنا، دوای ئەمە چەند بانقێکی ئەڵمانی و چەند سەنتەرێکی بازرگانیی ئەڵمانی لە شوێنە جیاجیاکانی دەوڵەتی عوسمانی کرانەوە.

میریی ئەڵمانی توانی بە سوڵتان عبدالحمید بسەلمێنێ، کە پێشنیازەکانی ئەندازیاری ئەڵمانی (فون بریسیل) وەربگرێ لە بارەی دامەزراندنی چەند هێڵێکی ئاسنینی درێژ کە ئەستەنبۆڵ بە شارە گەورەکانی ئەنادۆڵ و هەروەها بە سوریا و عێراق و حیجاز ببەستێت.

سوڵتان عبدالحمید بەجۆرە بیری لەو پێشنیازانە کردەوە: دامەزراندنی هێڵی ئاسنینی درێژ لە لایەن ئەڵمانیاوە دەبێتە هۆی توند بەستانەوەی دەوڵەتی عوسمانی بە ئەڵمانیا و ئەمەش وا لە ئەڵمانیا دەکات، کە لە پشت دەوڵەتی عوسمانی بوەستێ لە کێشە رامیاری و سەربازییەکانی. هەروەها بوونی هێڵی ئاسنینی درێژ بەرگریکردن لە دەوڵەت ئاسان دەکا و -ئەگەر هات و ئینگلتەرا هەرەشەی کرد دوای ئەوەی لە میسر چەسپا- بەخێرایی سەرباز بۆ عێراق و سوریا و کەنارەکانی ئەنادۆڵ دەنێرێ. جگە لەمەش باری ئابووری خەڵکی ئەو ناوچانەی کە هێڵی شەمەندەفەری پێدا رەت دەبێ چاك دەکات و بەرزی دەکاتەوە بەخێرایی و گواستنەوەی بەرهەمی کشتوکاڵی ئاسان دەبێ و نرخی دادەبەزێ و ئەوانەی، کە سوپای روسیا لەناوچەی بەلقانی عوسمانی دەری کردبوون و بەرەو ئەنادۆڵ چووبوون یارمەتیی نیشتەجێبوونیان دەدا.[1]

ئەڵمانیەکان هێڵی شەمەندەفەری (اسکی شهر- قونیه)یان لە ١٨٩٦ تەواو کرد و باڵیۆزی دەوڵەتە رۆژئاواییەکان لەم رووەوە بە خۆکەوتن و داوای مافی دامەزراندنی هێڵی ئاسنینی (قونیه) و (بەغدا)یان کرد و لە بەغداشەوە بۆ کەنداوی عەرەبی.

---

١ قاراڵ، ج٨، ١٧٣-١٧٦-١٨٠.

ئیمپراتۆری ئەڵمانی (غەلیومی دووەم) بۆ جاری دووەم لە ١٨ی ئۆکتۆبەری ١٨٩٨ سەردانی ئەستەنبوڵی کرد و سەری لە قودس دا و کەنیسەی (لوثر)ی تێدا کردەوە و سەردانی دیمەشقیشی کرد، بەمجۆرە پێشبڕکێی دامەزراندنی ئەم هێڵە ئاسنینە بەلای ئەڵمانیادا شکایەوە و لە ساڵی ١٨٨٩ مافی دامەزراندنی هێڵی شەمەندەفەری بەغدا بەرەو ئەڵمانیا درایە ئەڵمانیا و لە ١٩٠٣ مۆرکرا، بەڵام لەبەر بار و زرووفی نێو دەوڵەتی جێبەجێ نەکرا.

سولتان عبدالحمید عادەتی وابوو کە لە هەڵس و کەوتە رامیارییەکاندا ئاگای لەخۆ بێت، هەر چەندە هاوڕێیەتی عوسمانی و ئەڵمانی لە رووی ئابووری و ڕامیاری و لەوانەیە سەربازیش سوود بەخش بێت، بەڵام پەیوەندییەکانی بە ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی ئەوەی لەبیر نەبردەوە کە بە ئاشکرا بێ لایەن بێت.

هەروەها بە تەواوی چاودێری ئەو کۆمپانیا ئەڵمانیانەی دەکرد، کە لە هێڵەکاندا کاریان دەکرد، فەرمانی بە باڵیۆزی خۆی دا لە بەرلین، کە ئاگاداری رەنگدانەوەی هاوڕێیەتی عوسمانی و ئەڵمانی بێت. ئینجا سولتان عبدالحمید بینی کە کارەکە بەم جۆرەیە:

١-کۆمپانیا ئەڵمانیەکان بەرێگەی ئاشتی هەوڵی دەست بەسەراگرتنی دەمامك دراو(المقنع)یان دەدا، کۆمپانیەکان نەوتیان دۆزیبوویەوە و ئاشکرایان نەکردبوو، هێڵی ئاسنینیش بە ئاراستەی بیرە نەوتەکان دەڕۆیشت.. "ڕاپۆرتی هەواڵگری عوسمانی".

٢-کۆمپانیا ئەڵمانیەکان ئەو زەویانەیان دەویست، کە لە هەردوو رۆخی هێڵی ئاسنینی بەغدا بوون، بۆ ئەوەی خۆی خاوەندێتی بیرە نەوتەکان بکات دوای دەرهێنانی نەوت لێیان.. "ڕاپۆرتی هەواڵگری عوسمانی".

٣-باڵیۆزی دەوڵەتی عوسمانی لە (بەرلین) ساڵی ١٨٩٠ بە دەوڵەتی ڕاگەیاند کە رۆژنامە ئەڵمانیەکان باسی کۆمپانیا ئەڵمانیەکان دەکەن، کە دەیانەوێ چەند نیشتەجێیەکی داگیرکراو بە درێژایی هێڵی ئاسنینی بەغدا بەرەو ئەنادۆڵ دابمەزرێنن.

سولتان عبدالحمید بەمجۆرە وەڵامی ئەمەی دایەوە:

"باڵیۆزەکەم لە بەرلین پێی ڕاگەیاندنم کە قەیسەری ئەڵمانی لەو بۆ چوونەیە، کە گۆرەپانێکی دەسەڵاتی ئەڵمانی لە ئەنادۆڵ دابمەزرێنێ، هیچ گازاندەم لە ئەڵمانیا نیە بۆ

ڕێکخستنی ئابووریی عوسمانی، بەڵام ڕۆژنامە ئەڵمانیەکان باسی دامەزراندنی چەند نیشتەجێیەکی داگیرکراو دەکەن لەسەر هەردو لای هێڵی ئاسنینی بەغدا. ئایا مەبەستی ئەم ڕۆژنامانە چیە؟."[1]

لە بنچینە سوڵتان نەیدەویست ببێتە هاوپەیمانی ئەڵمان، بەڵام دەیویست وا دەربخات کە هاوپەیمانیانە، چونکە ئەمە ڕێککەوتنەکەی لەگەڵ ئینگلتەرا ئاسان دەکا، لە دیدگای سوڵتانەوە نزیکبوونەوە لە ئەڵمانیەکان هەلی بزوتنەوەی پێ دەبەخشێ لە گۆڕەپانێکی گەورە تا هیند، ئەمەش نە ڕوسیا و نە ئینگلتەرا قایل ناکات و وایان لێدەکات، کە لە بەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی نزمی بنوێنن و لەگەڵی پێك بێن.[2]

دوای ئەوەی ئەڵمانیەکان زانییان کە سوڵتان عبدالحميد چاو تێبڕینەکانیانی ئاشکرا کردووە لەوەی، کە بگەنە نەوتی ئەنادۆڵ و کەنداوی عەرەبی، دوژمنەکانی سوڵتان عبدالحميديان گرتە باوەش و یارمەتیی ئەندامانی کۆمەڵەی (إتحاد و تەرەقی)یان داو لە (سالۆنیك) دەستیان بەسەر ڕێکخستنەکانی ئەو کۆمەڵەیە دا گرت و ئەڵمانیەکان لەو کارەیاندا پیشتیان بە گروپە ماسۆنیەکان بەستبوو، بە تەواوی هەر وەکو ئینگلیز کە لە (مناستر) دەستیان بەسەر ڕێکخستنەکانی بزوتنەوەی (الاتحاد و الترقی) دا گرتبوو، لە هەردوو شاری (سالۆنیك) و (مناستر) شۆڕشگێڕان ڕاپەڕین بۆ لادانی سوڵتان عبدالحميد.[3]

## ٦) چاوتێبڕینەکانی یۆنانی (چاوتێبڕینەکانی یۆنانی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی بێزەنتی کە پایتەختەکەی ئەستەنبوڵ بێت):

دەوڵەتی بێزەنتی لەسەر دەستی سوڵتان (محمد فاتح) کۆتاییی پێهات هەر کە ئیسلام چووە ناو قوستەنتینیەوە، بەڵام بەتریرکیی ئەرثوذکس لە قوستەنتینیە -هەر چەند (محمد الفاتح) هەڵس و کەوتی لەگەڵ دیانەکان باش بوو- دوای فەتحی عوسمانی ستراتیژییەکی تایبەتی گرتە بەر کە لەسەر ئەم بنەمایانە بەند بوو:

---

١ قارال، ج٨/ ١٧٣-١٧٦ و ١٨٠.

٢ المذكرات، ص٦٨-٦٩.

٣ المذكرات، ص٦٨-٦٩.

١-هەوڵدان لە پێناو بەردەوامیی ژیانی بەتریرکیی ئەرثوذکسی لە قوستەنتینیە و هەروەها کەنیسەکانیش.

٢-کەنیسەکان دەست و پێوەندەکانی خۆیانیان لەسەر ژیانەوەی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی پەروەردە دەکرد.

٣-دامەزراندنەوەی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی لەسەر حسێبی کزیی فەرمانڕەواییی عوسمانیەکان.

لە کتێبی (تورکیا لە ساڵی ١٨٥٥) برگەیەك دەڵێ: "دیانەکانی ئەروام باوەڕێکی پتەویان بەو پێشبینیانە هەیە کە (٤٠٠) ساڵ پێشتر ڕوویداوە- کە قوستەنتینیە (ئەستەنبۆڵ) جارێکی تر دەگەڕێتەوە باوەشی ئەرثوذکسەکان.".

کتێبەکە لە دانانی (F.H Abucini)ە و لە ساڵی ١٩٧٧ وەرگێڕانە تورکیەکەی دەرچووە.

* * *

دیانەکانی بێزەنتە ناوی (میکالو أیدیا) واتا: (پەیامی مەزن)یان لە بیرۆکەی ژیانەوەی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی و نەمانی عوسمانیەکان نا.

* * *

بەرژەوەندیەکانی بەتریرکیی ئەرثوذکسی لە قوستەنتینیە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی ڕوسیا یەکی گرتەوە، هەر کە ڕوسیا لە مشووری ئەوەدا بوو کە بگاتە ناوی گەرم (المیاه الدافئة). لە ڕووی مێژوویەوە تێبینی کراوە کە هەر کاتێ دەوڵەتی عوسمانی کز بووبێ پەیوەندییەکانی نێوان بەتریرکیی ئەرثوذکسی قوستەنتینیە و مۆسکۆ زێتر و بەتینتر دەبێت. ئەم بەتریرکیە ناوی (بەتریرکیی فەنار) بوو، لە دیدگای ئەمەوە پەیمان بەستنی لەگەڵ ڕوسیا سوودی کەنیسەی تێدایە لەبەر بەهێزی ڕوسی بۆ پێکانی مەبەستی زیندووکردنەوەی بێزەنتی. ڕوسیاش لەو باوەڕە دابوو کە پەیمان بەستنی لەگەڵ کەنیسە سوودی خۆی تێدایە بۆ ئەوەی دیانەکانی (ئەنادۆڵ و بەلقان) دژی دەوڵەتی عوسمانی بەکاربێنێ.

پەیمانە توند و تۆڵەکەی نێوان بەتریرکیی فەنار و مۆسکۆ دژی دەوڵەتی عوسمانی

شێوەی جەنگێکی بێ سنووری گرتە خۆ. لە تایبەتیەکانی ئەم جەنگە: پێکانی بنچینەی رۆشنبیری دەوڵەتی عوسمانی و تێکدانی دامەزراوە ئیسلامیە عوسمانیەکان بوو.

* * *

ئەم پەیوەندیە بە پلانەکانیەوە بەڵگەنامەیەکی زۆر وروووژێنەر ئاشکرا دەکات کە (أغناتیف)ی باڵیۆزی ڕوسیا لە ئەستەنبوڵ بە ڕوونی دەری بڕی و دەڵێ: "گەیشتمە سەنتەری (بەتریرکیە) و لەکاتی گفتوگۆم لەگەڵ (برمانوس)ی بەتریق، ڕەشنووسی دوانەکەی بەتریقی پێش خۆی (گریگسۆریۆس)ی بۆ خوێندمەوە کە بۆ (الکساندر)ی قەیسەری ڕوسیای ناردبوو.". لەم دوانەدا چەند ڕاسپاردەیەکی دژی عوسمانیەکانی تێدایە کە جێی سەرنج و گرنگیدانە، ڕاسپاردەکانیش ئەمانەن:

"لەناوبردنی عوسمانیەکان و تێکدانی دەوڵەتەکەیان زۆر ئەستەمە، چونکە ئەوانە زۆر ئارامگر و لەبەرگریدا خۆ گرن. هەروەها شانازیکردن بە خۆ و نەفس بەرزییان دوو شتی ڕوونە لە ئاکاریاندا، بنچینەی ئەو سیفەتە ئاکاریانەش پابەندبوونیانە بە ئاینەکەیان و قایلبوونیان بە قەدەر و گوێڕایەڵیکردنی سوڵتان و سەرکردە و گەورەکانیانە.".

"بۆیە لە سەرەتادا دەبێ هەستی گوێڕایەڵیکردنیان لەناو ببرێ و پەیوەندییە واتاییەکانیان بپلیشێنرێتەوە و توند و تۆڵیی ئاینەکەیان لەق بکرێ، کورتترین ڕێگەش بۆ ئەمە: لەسەر هزر و بیری دەرەوەدا رابهێنرێن کە لەگەڵ مەعنەویاتیان ناگونجێ و وایان لێ بکرێ بە پێچەوانەی هەڵس و کەوتە ئاساییەکانیان هەڵس و کەوت بکەن. هەر کە مەعنەویاتی عوسمانیەکان شوێنی پێ لەق بوو، ئیتر ئەو هێزە بنەڕەتیەی کە بەرەو سەرکەوتنی دەبردن جێلەق دەبێ. لەبەر ئەمە تەنیا سەرکەوتن لە گۆڕەپانەکانی جەنگ بەس نیە بۆ باکۆ(تصفیة)کردنی دەوڵەتی عوسمانی، ئەو شتەی کە دەتوانرێ بکرێ ئەوەیە کە: ئەم کارە تێکدەرە لە بونیادی عوسمانیەکان ئەنجام بدرێ بێ ئەوەی هەستی پێ بکەن .".

باڵیۆزی ڕوسی لە ئەستەنبوڵ جەنەرال (أغناتیف) لە بارەی ئەم ڕاسپاردانەوە دەڵێ "زۆر بە ڕوونی و ئاشکرایی و ڕاستی ئەمەم ـ کارە تێکدەرانەکە (وەرگێڕ)- بۆ بەدیار

کەوت لەکاتی کارکردنم لە دەوڵەتی عوسمانیدا."[1]

* * *

لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەی عیسایی (کاترینای دووەم)ی ئیمپراتۆریەتی ڕوسیا هیوا و ئاواتەکانی ئەرثوذکسی ورووژاند لە دەوڵەتی عوسمانیدا بۆ گێڕانەوەی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتە، ڕوسیا و نەمسا لە ساڵی ١٧٨٧ پەیماننامەی پڕۆژەی یۆنانییان مۆر کرد، کە ئاماژە بە (دابەشکردنی دەوڵەتی عوسمانی دەکا لە نێوان ڕوسیا و نەمسا"، هەروەها لەم پڕۆژە یۆنانیە هاتووە کە "ئیمپراتۆریەتێکی بیزەنتی لەژێر سایەی ڕوسیا دابمەزرێ و پایتەختەکەی قوستەنتینیە (ئەستەمبوڵ) بێت".

ئەو دەوڵەتە بیزەنتیەی کە پێشنیاز کراوە، سنوورەکەی ئەم وڵاتانە دەگرێتەوە: بولگاریا و دو برۆجە و (ئێستا لە ڕۆمانیایە) تەراقیا و مورە و مەقدۆنیا و ئەلبانیا و (جبل الاسود). میر قوستەنتین کە لە ساڵی ١٧٧٩ لە دایکبووە و نەوەی کاترینای ئیمپراتۆری ڕوسیایە دەکرێتە ئیمپراتۆری ئەم دەوڵەتە.

* * *

لە ساڵی ١٨١٤ کۆمەڵەیەکی مەسیحی بەناوی (ایتریا) دامەزرا و کۆمەڵەیەکی نهێن کارە دژی دەوڵەتی عوسمانی، هێشتا ساڵی ١٨١٨ نەهاتبوو، کە ئەم کۆمەڵەیە چەند لقی لێ بوویەوە لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی دەوڵەتی عوسمانی، وەك: سلانیك، ترخالە، تشاملیجە، مورە، ئەفلاق، بوغدان، قودس، ئەسکەندەریە، دوورگەکانی دەریای ئیجە و ئەستەنبۆڵ و بوخارست. هەروەها لقێکیشی لە مۆسکۆ هەبوو.

ئەم کۆمەڵە چالاکیەکانی خۆی لەو شوێنانە چڕ کردەوە، کە ڕۆمیان لێ زۆر بووە بەتایبەتی (نیوە دوورگەی مورە). مەبەستی کۆمەڵەکە لە سەرەتادا "دامەزراندنی دەوڵەتێکی یۆنانیی سەربەخۆ بوو لە نیوە دوورگەی مورە" و ئینجا لەسەر حسێبی دەوڵەتی عوسمانی سنوورەکەی فراوان بکرێ و ئەم فراوانبوونە بەردەوام بێ، تا زیندووکردنەوەی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی کە پایتەختەکەی ئەستەنبۆڵ بێت.

ڕوسیا لایەنگریی ئەم کۆمەڵەیەی کرد و باڵیۆزەکانی ڕوسیا لە ئەفلاق و بوغدان و

---

١ قوجقباش، الصراع التركي- اليوناني، ص٣٠.

مورە چوونە ناویەوە، هەروەها هەندێ ئەفسەری ڕوسیش بەگەڵ کۆمەڵەکە کەوتن.

گەورەترین لایەنگری کۆمەڵەکە لەناو ڕوسیا (کابودیستریا)ی ڕاوێژکاری وەزارەتی دەرەوەی ڕوسی بوو، لە بنەچەدا ڕۆمیی یۆنانی بوو و لە کۆنگرەی ڤیەننای ساڵی ١٨١٤ بەشداری کردبوو، لە دوانەکانی کۆنگرەدا بە ئاشکرا لایەنگری (ئەرۆام)ە یۆنانیەکان بوو.

ئەمەش بووە هۆی زیادبوونی چالاکیەکانی مەسیحیە ڕۆمە ئەرثوذکسەکان دژی دەوڵەتی عوسمانی.

ئەم کۆمەڵەیە لە ساڵی ١٨٢١ بڕیاری یاخیبوونێکی دا دژی دەوڵەتی عوسمانی، لە کاتی یاخیبوونەکەدا بتریقی قوستەنتینیە (گریگۆریس) نامەیەکی بۆ بوترسی قەیسەری ڕوسیا نارد و تێیدا دەڵێ: "هەر کە ئاگاداری بڕیارتان بووین بە دامەزراندنی قوتابخانەیەکی گشتی (بەزمانی شفرە: دەوڵەتی ڕۆمیی یۆنانیە) بۆ بڵاوکردنەوەی زانستە یۆنانیەکان (مەبەستی سەربەخۆیی یۆنانە و لە کاتی خۆی سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بووە) زۆر بەختەوەر بووین."

ئەم دوانە کەوتە دەست هەواڵگریی عوسمانیەکان و بەجوانی پەیوەندیی نێوان بتریق (گریگۆریۆس) و ئەندامانی کۆمەڵەی (ئیتریا)یان بۆ ڕوون بوویەوە. دەسەڵاتی عوسمانی لە (٢٢)ی نیسانی ١٨٢١ ئەم (بتریق)ەیان لە دەرگای ناوەڕاستی (بترکیە)ی ئەستەنبۆڵ لە سێدارە دا و ئەم دەرگایە لەوکاتەوە تا ئێستا بە داخراوی ماوەتەوە وەکو نیشانەیەکی پرسەی (بتریرکیە).

لە سێدارەدانی (بتریق) هەڵەیەکی رامیاریی مەزن بوو هەر وەك هەندێ لە مێژوونووسە تورکەکان وەسفیان کردووە- ئەم ڕووداوە کرایە هۆکارێك بۆ بانگەشەی دژی دەوڵەتی عوسمانی لە دەرەوە و سۆزی ئەوروپا بەگەڵ دیانە ئەرثوذکسەکانی دەوڵەتی عوسمانی کەوت.

ئەم یاخیبوونەی ڕۆمەکان بەردەوام بوو و ئەوروپا پشتی کێشەی یاخیبووەکانی گرت و دۆزەکە بووە (ململانێی نێوان ئیسلام و مەسیحیەت) بە بۆچوونی ئەورووپیەکان.

ئەندامانی کۆمەڵەی (ئیتریا) داوایان لە دیانەکانی ئەوروپا کرد، کە یارمەتیی "نەوەی یۆنانییە کۆنەکان، مامۆستای ژیاری ئەوروپی" بدەن. لە پایتەختە ئەوروپیەکان چەند لیژنەیەکی یۆنانی بۆ کۆکردنەوەی دراو و چەککردنی یاخیبووەکان دامەزرا و

ئەندامەکان دەستیان بە دواندن کرد و بازرگانە ئەوروپیەکان دەستیان بە یارمەتیدانی یاخیبووەکان کرد لە رووی مادییەوە، گیان بازەکانی فەرەنسا و ئینگلتەرا و ئەڵمانیا و هەندێ لە سەربازەکان بەرەو (مورە) چوون بۆ یارمەتیدانی یاخیبووەکان دژی دەوڵەتی عوسمانی، تا گەورەترین شاعیری سەردەمی نوێی ئەوروپی (اللورد بیرون)ی شاعیری ئینگلیزی وازی لە ژیانی رابواردن و خۆشی ئیتالیا هێنا و ژنەکەی بەجێهێشت، کە زۆر زۆری خۆش دەویست و ژیانی خۆی پێشکەشی دۆزی یۆنانی کرد دژی عوسمانیەکان.

(محمد علی پاشا)ی والیی میسر لە لایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە توانی لە ساڵی ١٨٢٧ یاخیبوونەکە بکوژێنێتەوە.

* * *

ئەوەی شایانی گوتنە لێرەدا یۆنانیەکان دوورگەی (کریت)یان بەبەشێکی دانەپچڕاوی (پەیامی گەورە) واتا: زیندووکردنەوەی دەوڵەتی بێزەنتە دادەنا و لەسەر حسێبی پاکۆ(تصفیة)کردنی عوسمانیەکان. بۆیە بیرۆکەی یاخیبوونیان لە دوورگەکە بڵاو کردەوە دژی دەوڵەتی عوسمانی چونکە (کریت) عوسمانی بوو.

* * *

لە دوای کۆنگرەی بەرلین کە ٨٠٠٠ کم[٢] لە خاکی عوسمانی دایە یۆنان، یۆنان داوای لە دەوڵەتی عوسمانی کرد، کە سنورەکەی لەگەڵ راست بکاتەوە، سوڵتان عبدالحمید حەزی لەوە نەبوو کە تاکە بستە خاکێك بداتە یۆنان، بۆیە جەردەکانی یۆنانی سنووری عوسمانییان بەزاند، بەڵام بەرپەرچ درانەوە و ڕاونران.

دوای چەند هەوڵدانێك لە لایەن دەوڵەتە ئەوروپیەکانەوە، پەیماننامەیێ بەسترا بۆ ڕێکخستنی سنووری نێوان دەوڵەتی عوسمانی و یۆنان لە ٢٤ی مایۆی ساڵی ١٨٨١ بۆ ئەوەی یۆنان (١٣,٤٠٠) کم[٢] و ٢٩,٠٠٠ کەسی بەرکەوێ.

لە ڕاستیدا ئەمە بلیمەتیەکی رامیاریی سوڵتان عبدالحمیدە، چونکە ئەگەر بڕیارەکانی کۆنگرەی بەرلینی جێبەجێ بکردایە، دەوڵەت ٨٠٠٠ کیلۆمەتر دووجای دەدۆڕاند و "ڕێکخستنەوەی سنوور بە شێوەیەکی ڕامیاری کە سوڵتان عبدالحمید ویستی بێ خوێن ڕژان بلیمەتیەکی گەورەیە.".

دوای ئەمە یۆنان هەوڵی دا له پێناو دامەزراندنی ئیمپراتۆریـەتی رۆمـی بـێزەنتی لەسەر حسێبی دەوڵەتی عوسمانی- کە کریت و ئیبیر و مـەقدۆنیا بخاتـە پـاڵ خۆیـەوە و جەنگی لەسەر دەوڵەتی عوسمانی راگـەیاند و هێزەکـانی یۆنـانی هێرشـیان کـردە سـەر سنووری عوسمانی بەڵام بەسەر شۆڕی گەڕانەوە.

لـە (٢٦)ی ئـاداری ١٨٩٨ ڕووداوێ ڕوویـدا، کـە ڕۆڵێکـی گرنگـی هـەبوو لـە تەشەنەکردنی ڕووداوەکان، یۆنانیەکان لە (اشـقودرە) بەشـەو بـەرازێکیان لـە میحرابـی یەکێ لە مزگەفتەکان سەربڕی و دیواری مزگەفتەکەیان بە وێنەی خاچ پڕکرد. هـەر کـە بەیانی موسڵمانەکان ئەمەیان بینی، تووڕە بوون و ورووژان و هێرشیان کردە سەر مـاڵی دیانەکان. لە نێوان موسڵمانە عوسمانیەکان و دیانە یۆنانیەکان چەند کوشتارێ ڕوویـدا و لە ئەنجامدا دەوڵەتە گەورەکان دەستیان خستە ناو کێشەکەوە و ئەم دەوڵەتانە لە چـواری نیسانی هەمان ساڵ یاداشتێکیان دایە هەر دوولا و ئاگاداریان کردنەوە کە بەرەو جەنگ نەچن و ئەوەی دەستپێکەر بێ لێپرساو دەبێت. یۆنان گرنگیـی بەمـە نـەدا و سـنووری عوسمانی بەزاند و ئەو کاتە دەوڵەتی عوسمانی بۆ بەرگریکردن لە خـۆی جـەنگی لەسـەر یۆنانیەکان ڕاگەیاند.

سوڵتان عبدالحمید خۆی سەرکردایەتیی ئەم جەنگەی کرد، داوای لە (أدهم پاشا) کرد کە سەرکردایەتیی سوپا بکا و فەرمانی پێکرد، کە جەنگێکی خێرا ئەنجام بدا بۆ ئـەوەی دەوڵەتە گەورەکان بکەونە بەر باری واقیعەوە. هێزەکانی یۆنانی لە ماوەی سێ حەفتـەدا لە هەموو بەرەکانی جەنگدا شکستیان هێنا.

سوپای عوسمانی لـە جـەنگی (دومیقـە) لـە ١٧ی مـایۆی ١٨٩٨ بـەرەو (أثینـا)ی پایتەختی یۆنان چوو. میریی یۆنانی دەستی لەکار کێشـایەوە و میریـە نوێیەکـە پـەنای بردە بەر (نیقولا)ی قەیسەری ڕوسیا و هـەموو دەوڵەتـە ئەورووپیـەکان و داوای لێکـردن یۆنان ڕزگار بکەن و ئەسینا لە عوسمانیەکان بپارێزن.

(نیقۆلا)ی قەیسەری ڕوسی برووسکەیەکی پیرۆزبایی بۆ سوڵتان عبدالحمید هەنارد کە بەسەر یۆناندا زاڵبووە و تکای لێکرد کە سوپای عوسمانی لەوە زێـتر لـە یۆنـان نەچێتـە پێشەوە.

دەوڵەتە ئەورووپیەکانیش پشتی یۆنانیان گـرت و دەوڵـەتی عوسمـانی وەڵامـی داوای

ڕوسی و ئەورووپیی دایەوە بەمــەرجێ (تسـالیا) بـۆ ئـەو بـێ و ۱۰,۰۰۰,۰۰۰ ملیـۆن بژاردنی جەنگی بدەنێ.

سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا (اللورد سالبوری) گوتی: " نابێ ڕێگا بدەین کـە مـانگی یەکشەوە بچێتە شوێنێك پێشتر خاچی لێ بووبێ. ".

بەم شێوەیە دەوڵەتی عوسمانی نەیتوانی (تسالیا) وەربگرێ و دەوڵەتـە ئەورووپیـەکان بوونە چەند بەشێك، تاکو یۆنان بژاردنی جەنگ نەدات و ئەمەشـی بـۆ چـووە سـەر بـە بیانووی کزیی بودجەی یۆنانی. لە بارەی (کریت) ڕێك کەوتنی دەوڵەتی لەسەر ئـەوەبوو، کە سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بێت بەمەرجێ (أثینا) ڕەزامــەندیی هـەبێت لەسـەر ئـەو والیەی کە سـوڵتانی عوسمـانی دەیکاتـە فـەرمانڕەوای دوورگـەی (کریـت)، هێزەکـانی عوسمانی کشانەوە و والی بەڵێنی دا، کە ئەو موسـڵمانانە بپـارێزێ کـە لـە دوورگەکـە ماونەتەوە.

یۆنانیەکان لەچاو تێبڕینەکانی خۆیان بەردەوام بوون کە چەند پارچـەیێ لـە دەوڵـەتی عوسمانی دابڕن، بۆ ئەوەی لە لایەك دەوڵەتی بێزەنتی زیندوو بکەنەوە و لە لایەکی دیـش عوسمانیـەکان لـە بـەلقان و ئەسـتەنبۆڵ و ئـەنادۆڵ دەربکـەن، چونکـە ئەسـتەنبۆڵ لـە پلانکاریی یۆنانی پایتەختی ڕۆمایە.[1]

* * *

ئەم جەنگە سوودێکی مادیی بۆ دەوڵەتی عوسمانی نەبوو، بەڵام لــە ڕووی واتاییــەوە کاریگەریەکی مەزنی هەبوو و لە جیهانی ئیسلامییەوە بە هیوایـەکی زۆرەوە پێشـوازی لێکرا، لە لایەن سەرکردەی موسڵمانانی زەریای هیندی و زەریـای باسـفیکی پیرۆزبـایی ڕژایە سەر کۆشکی (یلدز) کە شوێنی سوڵتان عبدالحمید بوو.

دواندەری مزگەفتەکانی ناوەڕاستی ئەفریقیا و هینـد و زەریـای ئەتڵەسـی سوپاسـی خوایان کرد لەســەر ئـەو سـەرکەوتنەی، کـە سـوپای خەلیفـە بەدەسـتی هێنـاوە. ئـەم سەرکەوتنە لەگەڵ بچووکیەکەی- وای لە سـوڵتان عبدالحمیـد کـرد کـە لـە کۆشـکی (یەلدز) بە خاکساری و گۆشەگیری بمێنێتەوە و کاریگەرییە واتاییەکەی لەسەر دەسـت و

---

١ قوجة باش، المرجع السابق، ص٥١ و ١٠٠-١٠٦.

پێوەند و هاوڵاتیەکانی بێت و بووە "هۆکارێك بۆ ئەوەی جیهانی ئیسلامی مەزن.وەکو تاکە دڵێ لیێ بدات".

لە جەژنی قوربان کە لە دوای ئەم سەرکەوتنە هات، نوێنەرانی جیهانی ئیسلامی لە هەموو لایەکی جیهانەوە: میرەکانی هیند، شێخەکانی ولاتی عەرەب و سەرۆکی هۆزەکان هاتنە لای سوڵتان عبدالحمید بۆ جەژنە پیرۆزە و پیرۆزبایی لێکردنی بە بۆنەی سەرکەوتنەوە. یەکێ لە ئەمیندارەکانی بالیۆزی بەریتانی لە ئەستەنبۆڵ کاتی خۆی- لە نامەیەکی کە بۆ باوکی نووسیبوو دەڵێت: "ئەم جەژنی قوربانە کاریگەریەکی زۆری بەسەر دەروونمدا هەبوو، ئەم جەژنە سەلماندیی کە سوڵتان عبدالحمید پلە و پایەیەکی بەرزی هەیە لەناو هەموو موسڵمانانداو ئەو هەولانەی کە دەیانەوێ ناو بەدی بکەن پووچەڵن.".[1]

* * *

ئەوەی لە بارەی ئەم جەنگەوە دەگوترێ لەگەڵ سادەییەکەی کە چاو تێبڕینەکانی یۆنانی تا رادەیەك وەستان، ئەم جەنگە نیازە راستەقینەکانی کۆمەڵەی (الاتحاد و الترقي) ئاشکرا کرد لەبەردەم موسڵمانەکان، ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە ڕایانگەیاند کە "یاخیبووەکانی دژی دەوڵەتی عوسمانی پاڵەوانی سەربەستین". بەلام میری شاعیرانی عەرەب (أحمد شوقي) لە قەسیدەیەکی، کە پیرۆزبایی لە سوڵتان عبدالحمید دەکات لەسەر سەرکەوتنەکەی بیروبۆچوونی گشتیی جیهانی ئیسلامی دەردەبڕێ دەڵێ:

بسيفك يعلو الحق و الحق أغلب

و ينصر دين الله أيان تضرب[2]

واتا:

بە شمشێرت حەق بەرز دەبێ و حەق سەرکەوتوو ترە

ئایینی خوا سەردەخا لەهەر شوێنێ لێی بدرێ.

---

١ ضيانور في تأريخ الاسلام، تأليف: شهبندر زاده أحمد حلمي، ص٧٧٠، أستانبول ١٩٨٢.

٢ الشوقيات، الجزء الاول، ص٤٢.

# پاری یەکەم

# لە کێشەی ڕۆژهەڵاتیەوە بۆ کۆمەڵگای ئیسلامی

## (دەوڵەتی عوسمانی لە نائومێدییەوە بەرەو ئومێد)

کێشەی ڕۆژهەڵاتی وا پێناسە دەکرێ: "کە کێشەی ڕێککەوتنی دەوڵەتە ئەوروپیەکان و ڕوسیایە لەسەر کۆتایی هاتنی دەوڵەتی عوسمانی ئەمە سەری جیهانی ئیسلامیە و بەڕۆژهەڵات ناوی دەرکردووە- بەمجۆرە جیهانی ئیسلامی تێك دەچێ و دەکەوێتە ژێر چاوتێبڕینەکانی ڕۆژئاوایی و ملکەچی بزوتنەوەی داگیرکردنی جیهانی دەبێت".

هەر کە عوسمانیەکان دوای هێز و شکۆمەندی و بڵاوبوونەوە کزبوون، کێشەی ڕۆژهەڵاتی بەم واتایەوە دەستی پێکرد، لەکاتی کزبوونی دەوڵەتی عوسمانی بزووتنەوەی دەوڵەتە ئەوروپیەکان و ڕوسیا دەستیپێکرد و زانستە نوێیەکانیان وەرگرت و ئەو دەوڵەتانە بوونە هاوپەیمانی یەکتری دژی عوسمانیەکان.

* * *

بەڵام کۆمەڵگای ئیسلامی لەسەردەمی سوڵتان عبدالحمید لە گۆڕەپانی سیاسەتی جیهانی بەدیارکەوت و بە تەواوی لەکاتی هاتنە سەر عەرشی سوڵتان عبدالحمید لە ساڵی ١٨٧٦ع. سوڵتان بینی کە سیاسەت لە دەوڵەتەکەی لە لایەن چەند وەزیرێکەوە دادەڕێژرێ و جێبەجێدەکرێ کە ئەوروپا نموونەی بەرزیانە و باوەڕیان بە هزری هێناوە و بە توندی لەسەر شێوازەکەی دەڕۆن. ئەوانە لە سەرەتای فەرمانڕەوایەتی سوڵتان عبدالحمید لە هەوڵی ئەوەدا بوون، کە وڵاتی عوسمانی کە کزیی ئاشکرا دیار بوو- تووشی جەنگ بکەن دژیڕوسیا و کە بەهێزە لە ڕووکەشدا- سوڵتان ئەوماوەیەی نەدرایێ کە ناقایل بێت، ئەمە ئازاری بە وڵاتی عوسمانی گەیاند سەرەڕای دواکەوتنی پێشووی.

سوڵتان عبدالحمید هەر کە پشووی هاتەوە بەر، ئەمەی بە هەل زانی و ئەوانەی بە هزری ئەوروپی کاریگەر بوون دەسەڵاتی لیٚ سەندنەوە و خۆی بە توندی سەرکردایەتی

وڵاتی کرد و هەلس و کەوتی ڕامیاریی لە مەیدانی جیهانی نەرم و نیان بوو، بە شێوەیەك ئەو دەوڵەتانەی کە یۆنانیان دەپاراست هەڵوێستێکی بێلایەنیان وەرگرت لە ناخۆشیی نێوان عوسمانی و یۆنانی، سوڵتان خۆی سەرپەرشتی جەنگی عوسمانی و یۆنانی لەگەڵ بچووکیەکەی- دەکرد و هێزەکانیعوسمانی سەرکەوتنێکی مەزنیان بەدەست هێنا و شاندە ئیسلامیەکان لە هەر چوار پەڕی زەوییەوە بە خێرایی هاتن و پیرۆزبایی سەرکەوتنیان لە سوڵتان کرد، شاعیرە موسڵمانەکان لە وڵاتە جۆر بە جۆرەکانی ئیسلامیەوە شیعریان لە پەسندیی "خەلیفەی موسڵمانان سوڵتان عبدالحمیدی دووەم." دەهۆنیەوە. سورییەکان لەکاتی جەنگ- چەند لیژنەیەکیان پێکهێنا بۆ کۆکردنەوەی بێشە(تبرعات) بۆ یارمەتیدانی دەوڵەتی عوسمانی، هەروەها لیژنەکانی مانگی سوریان پێکهێنا بۆ چارەسەرکردنی بریندارەکانی ئەم جەنگە و دڵدانەوەی کەس و کاریان، موسڵمانەکانی باکووری ئەفریقیا ئاهەنگیان دەگێڕا بە بۆنەی سەرکەوتنی سوپای عوسمانی بەسەر یۆنانیەکان، هەر چەندە دەسەلاتی داگیرکەری فەرەنسی بەرهەڵستی دەکرد، دەسەڵاتدارانی باکووری ئەفریقیا شادبوونی موسڵمانانیان بەسەرکەوتنی عوسمانی وا وەسف دەکرد کە: "لە ئەنجامی ڕەگەزپەرستیەکی کوێرانەی ئایینییە.".[1]

موسڵمانەکانی هیند چەند لیژنەیەکی کۆکردنەوەی بێشەیان پێکهێنا بۆ ئەوەی یارمەتیە مالّی و پزیشکیەکان بۆ دەوڵەتی عوسمانی بنێرن بۆ یارمەتیدانی لە جەنگەکەی لەگەڵ یۆناندا، هەروەها چەند نوێنەرێکی کۆمەڵەی ئیسلامی لە (حەیدەر ئاباد دکن) چوونە ڕۆژنامەی (مؤید المصریة) و دەیانگوت: "ئێمە موسڵمانین و سوڵتان عبدالحمید خەلیفەی گەورەی موسڵمانانە، کەواتە ئێمە دەست و پێوەندی ئەوین، بۆیە بە ئەرکی خۆمانی دەزانین، کە وەڵامی داوایەکەی بدەینەوە و ئێمەش وەکو عوسمانیەکان- ئەو یارمەتیە سەربازیەی، کە سوڵتان فەرزی کردووە جێبەجیّ بکەین بۆ بەهێزکردنی ئەو سوپایەی، کە عەرشی پیرۆزی خەلیفایەتی دەپارێزێ.".[2]

---

١ أحسان ثريا صيرما، بەڵگەنامەیەك لە چالاکیەکانی سوڵتان عەبدول حەمیدی ئیسلامی دژی داگیرکەری فەرەنسی لە باکووری ئیفریقا، گۆڤاری پەیانگەی مێژوو، ئەستەنبوڵ، ١٩٧٧، - وەرگێڕاوە- ل١٨٠.

٢ أحمد فهد الشوابكة، بزووتنەوەی کۆمەڵگای ئیسلامی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمەوە تا ساڵی ١٩٠٩، نامەی ماجستێر بە سەرپەرشتی دکتۆر (صلاح العقاد و دکتۆر محمد حرب) لە ساڵی

ئەم هەستە ئیسلامیە گشتیە و پەروەردەی تایبەتیی سولتان عبدالحمید و بیرکردنەوەی بە پێچەوانەی ڕۆژئاوا، وای لە سولتان کرد هەست بکا کە دەتوانرێ سیاسەتێکی دی لە بریتیی سیاسەتی عوسمانی پیادە بکرێت و بریتیەکە بریتیە لە "بۆ چاکسازی دەوڵەت هەنگاو بۆ ناوەوەی نەتەوە بنرێت" لە بریتیی "هەنگاونان بۆ دەرەوە بۆ چاکسازی".

ئیتر سیاسەتەکەی دارشت و بریتی بوو لە: وەستان دژی چاوتێبڕینەکانی ڕۆژئاوایی لە وڵاتی موسڵمانان و موسڵمانەکانی لەسەر تاکە وشەیەك و تاکە هەستێك پێگەیاند.

سولتان عبدالحمید مەبەستی ئەوە نەبوو کە پەیوەندیەکی ڕامیاری پێك بێنێ، کە هەموو وڵاتی موسڵمانان بگرێتەوە لە یەکەیەکی سیاسی تاك و تەنیا، بەڵکو ویستی هەستی موسڵمانان لە بزوتنەوەیەکدا کۆ بکاتەوە و جەخت لەسەر یەکگرتنیان بکا و بەرامبەر دوژمنەکانیان بە هێز و توانا بن. بەو جۆرە:

-ئەوانەی هەڵگری ڕۆشنبیری ڕۆژئاوان و دەستیان خستۆتە ناو سەنتەرە کارگێڕی و ڕامیارییە بزێوەکانی رشتەکانی دەوڵەتی ئیسلامی بە گشتی و دەوڵەتی عوسمانی بەتایبەتی لە سنووری خۆیان دەوەستن هەر کە دەبینن بەربەستێکی ئیسلامی گەورە و بەتین لە پێشیان دەوەستێت.

-دەوڵەتە داگیرکەرەکانی ئەوروپی و ڕوسیا لە سنووری خۆیان دەوەستن هەر کە دەبینن موسڵمانەکان لە تاکە ریزێك وەستاون و بە چاویلکەیەکی تازەوە دەنۆڕنە چاوتێبڕینە داگیرکارەکانیانەوە، ئەویش چاویلکەی "یەکێتی ئیسلامیە".

-سەلماندنی ئەوەی کە موسڵمانەکان دەتوانن هێزێکی ڕامیاری جیهانی پێك بێنن لە ڕووبەڕووبوونەوەی جەنگی ڕۆشنبیری و هزری و بیروباوەڕیی ڕوسی- ئەوروپیی مەسیحی و حسێبی بۆ دەکرێت.

-یەکێتیە ئیسلامیە تازەکە ڕۆڵی دەبێ لە کارتێکردنە سەر سیاسەتی جیهانی.

---

١٩٨٣ لە لایەن زانکۆی (عین شمس)ەوە مۆڵەتی پێدراوە، نامەکە، ل٢٩٠، لە ڕۆژنامەی (المؤید) ژمارە ٣٠٨٦ لە ١٨٩٧/١/٢٧، وتاریَ بەناونیشانی "داوایێ بۆ یارمەتیدانی خەلیفەی شکۆدار"، لە داهاتوودا ئاماژە بەم سەرچاوەیە دەکرێ کە چەند دەقێکی سوود بەخشی تێدایە بەناوی (الشوابکة).

-دەوڵـەتی عوسمـانی بـەپێی ئـەوە کـە دەوڵـەتی خەلیفایـەتی ئیسـلامییە-دوای کزبوونێکی مێژوویی- هێزی خۆی دەگێڕێتەوە، بـەمجۆرە دەتوانـرێ بـەهێز بکـرێ و بـە ئامێری زانستی نوێ ساز بدرێ لە هەموو بوارەکانەوە و شکۆمەندی خۆی بـۆ بێتـەوە و وانەیەکی مێژوویی پێکدێنێ و دەڵێت: "هەوڵدان لەپێناو بەهێزکردنی کیانی ڕامیـاری و کۆمەڵایەتی ئیسلامی چاکترە لە بەزەوی دادانی و پێکهێنانی کیـانێکی نـامۆ لـەڕووی هزری و کۆمەڵایەتی لەسەر هەمان زەوی.".

-زیندوو کردنەوەی دەسەڵاتی خەلیفایـەتی بـۆ ئـەوەی ببێتـە ئـامڕازێکی بـەهێز و ڕووکەشی نەبێ هـەروەك مـاوەێك ڕوویـدا. بـەم شـێوەیە تـەنیا سـوڵتان لـەڕووی چـاو تێبڕینەکانی ڕۆژئاوا و بـەکرێگیراوەکانی نـاوەوەی ناوەسـتێ، بـەڵکو ئەمـە یەکەیـەکی هەستیە لە نێوان هەموو گەلــە موسـڵمانەکان و سـوڵتان وەکـو هێمـایێك و رابـەرێك و هۆیەکی یەکگرتن دەبێت.

مێژوونووسی بەریتانی (ئـارنوڵد توینبـی) ئامـاژەی بـەم لایەنـەوە کـردووە دەڵـێ: "مەبەستی سوڵتان عبدالحميد لە سیاسـەتە ئیسـلامیەکەی، کۆکردنـەوەی موسـڵمانانی جیهانە لە سایەی یەك پەرچـەمدا، ئەمـەش دژە هێرشـێکی موسـڵمانانە دژی هێرشـی جیهانی ڕۆژئاوایی، کە دەیویست دەست بەسەر جیهانی ئیسلامیدا بگرێ.".[1]

---

١ إحسان ثريا صيرما، ڕۆڵی سۆفیگەریەکان لەسیاسەتی دەرەوەی سوڵتان عەبدول حەمیدی دووەم، گۆڤاری ئیسلام، ئەنقەرە، نۆڤێمبەری ١٩٨٤، ل٤٠-٤٣. هەروەها بڕوانە: محەمەد حەرب، بنەما سەرەکیەکانی بنچینەی مێژوویی و هزری بزوتنەوەی پارتی سەلامەت لە تورکیا، باسێکی کۆنفرانسی ئاراستەکانی هزری ئیسلامی هاوچەرخ لە بەحرەین، ساڵی ١٩٨٥، ٤٤٢.

# پاری دووەم

## هۆكارەكانی سوڵتان عبدالحمید بۆ جێبەجێكردنی كۆمەڵگای ئیسلامی

سوڵتان عبدالحمید بۆ جێبەجێكردنی كۆمەڵگای ئیسلامی هەموو توانا بەردەستەكانی ئەو سەردەمی بەكارهێناوە، لەوانە:

لە هەموو ڕەگەزەكانی جیهانی ئیسلامی لە زانا و هەڵكەوتووەكانی بواری ڕامیاری چەندەها بانگخواز(داعیە)ی هەڵبژاردووە و بەرەو شوێنە جۆراوجۆرەكانی جیهانی ئیسلامی ناردوون بۆ ئەوەی پەیوەندی بە گەلە موسڵمانەكانی ئەو ناوچانە بكەن و بیروبۆچوون و ئامۆژگاریەكانی سوڵتانیان پێ ڕابگەیەنن و زانستە ئیسلامیەكان بڵاو بكەنەوە لە ناوەوە و دەرەوەی وڵاتە ئیسلامیەكان و كتێبە بنچینەییە ئیسلامیەكان چاپ بكەن و بۆ یەكەم جار لە مێژووی دەوڵەتی عوسمانی زمانی عەرەبی بكرێتە زمانی دەوڵەت و گرنگی بە مزگەفتەكان بدەن لە بواری نوێكردنەوە و چاككردنەوەیان و چەند هەڵمەتێكی بێشە (تبرع) ئەنجام بدەن بۆ ژیاندنەوەی مزگەفتەكان لە جیهاندا.

هەروەها گرنگی بە هات و چۆكردن درا بۆ بەستنەوەی بەشە جیاجیاكانی دەوڵەتی عوسمانی بەیەكتری و دڵدانەوە و كێشكردنی سەرۆك هۆزە عەرەبیەكان و دامەزراندنی قوتابخانەیەك لە پایتەخت بۆ فێركردنی منداڵی سەرۆك هۆز و خێڵەكان و مەشق پێكردنیان لەسەر كارگێڕی و دڵدانەوە و كێشكردنی شێخەكانی ڕێبازە سۆفیگەریەكان و سوود وەرگرتن لە ڕۆژنامەگەریی ئیسلامی بۆ بانگەشەكردن بۆ كۆمەڵگای ئیسلامی و بەكارهێنانی هەندێ ڕۆژنامە بۆ ئەم مەبەستە و هەوڵدان بۆ پەرەپێدانی بزوتنەوەی زانستی و تەكنیكی لە دەوڵەتی عوسمانی و نوێكردنەوەی دەوڵەت لەو بوارانەی كە پێویستن.

دەتوانرێ ئەمانە بە دوور و درێژی وەك لەمەو دواوە دێ باس بكرێن:

## ١-بانگخوازەکان (الدعاة):

ئەمانە ژمارەیان زۆرە و لێرەدا لەسەر بنەمای کەسێتی دیار و ناوچەی جوگرافی چەند نموونەیەکیان دەخەینە ڕوو:

### ١/ لە ئەفغانستان: بەڕێز جەمالودینی ئەفغانی:

جەمالودینی ئەفغانی کەسێتیەکی سەیر و سەمەرەی هەبوو، خاوەن کەسێتیەکی بەتین بوو، چاوی لە حەق نەدەترووکاند و لەسەر حەق لەسەر زەنشتی کەس نەدەترسا، کەسێتیەکی سەرکردایەتی هەبوو و بانگەوازی یەکبوونی موسڵمانان و پەیوەندبوونیان و وەستانیان وەك یەك پیاو دەکرد. هەر شتێکی بیتوانیبایە بەکاری دەهێنا لە کەس و دامەزراو و هزر- بۆ گەیشتنە ئامانجەکەی لە یەکێتی ئیسلامی دا، لە گەیشتنە ئامانجەکانی هەندێ بە پەلە و شۆڕشگێڕ ئاسا بوو.

لە جیهانی ئیسلامیدا ناوبانگێکی وای دەرکرد، کە هیچ کەسێ لە بار و زرووفی ئەو نەگەیشتبێ. هۆکارە چاکسازییە هەندەکیەکانی وەکو تەنیا چاکسازیی کارگێڕی، یا تەنیا چاکسازی فێرکردن- دوور دەخستەوە، چونکە ئەم چاکسازییە هەندەکیە "بار و زرووفی دەوڵەتە ئیسلامیەکان چاك ناکا و چارەسەریی کێشەکانیان ناکات، هەروەها ئەو توانایەی ناداتێ کە بەرامبەر دوژمنەکانی بوەستێ".

بەلای جەمالودینی ئەفغانیەوە هۆکاری راپەڕینی جیهانی ئیسلامی بریتیە لە "هەستانەوەی دەوڵەتی ئیسلامی لەباری کزی و ئاگادارکردنەوەیەتی بۆ جێبەجێکردنی کاروبارەکانی و گەیشتنە ڕیزی دەوڵەتە بەهێزەکانە". مەبەست لە وەسفەکانی جەمالودینی ئەفغانی تەنیا دەوڵەتی عوسمانییە و چیدی نا.[1]

ئەفغانی ڕای وابوو، کە دەبێ دەوڵەتی عوسمانی سیاسەتی لامەرکەزی پەیڕەو بکات

١ عبدالرحمن الرافعي، جمال الدين ص١٧٧-١٧٨، و محمد رشیدرضا، تأريخ الاستاذ الامام، ج١، ص٧٣. وأحمد أمين، زعماء الاصلاح، ص٨٩ و فرنو (يقظة العالم الاسلامي)، ترجمة بهيج شعبان، ص١٠٧، و محمد رشيد رضا، تأريخ الاستاذ الامام، ج١، ص٧٣، و الرافعي جمال الدين، ص٤٨ و المخزومي، ص٢٤، و ميرزا لطف الله خان، ص٧١، و المخزومي أيضا، ص١٨، و أحمد شفيق، مذكراتي في نصف قرن، ج١، ص١٠٩، على التوالي نقلا عن الشوابكة ١٣٣ وما بعدها.

و ویلایەتەکانی سەربەخۆییان هەبێ و تەنیا لە کار و بارە گرنگەکانەوە پەیوەندییان بە ئەستەنبۆڵەوە هەبێ و دەوڵەتێکی یەکگرتوو پێك بێنن، دوای ئەمە وڵاتە ئیسلامیەکانی تری وەکو: ئێران و ئەفغانستان و هیندی پێوە بلکێنرێت.

هەروەها ئەفغانی لەو باوەڕەدا بوو، کە موسڵمانەکان دەتوانن تەنیا لە ڕووی ئاڕاستە و هەست و مەبەست یەك بن، بێ ئەوەی بیر لە یەکێتی سیاسی بکەنەوە کە دەوڵەتەکانیان ڕێك بخات.[1]

دوای ئەوەی ئەفغانی لە ئەستەنبۆڵ چاوی بە سوڵتان عبدالحمید کەوت لە پڕۆژە گەورەکەی خۆی پەشێمان بوویەوە، کە بریتی بوو لە (دەوڵەتی یەکگرتووی ئیسلامی) و تەنیا بە یەکبوونی بۆچوونی جیهانی ئیسلامی قایل بوو، سوڵتان عبدالحمید لە چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ ئەفغانی هەستیکرد کە ئەفغانی لە بیرکردنەوەیەکی تیۆری دایە و بە قووڵی لە بار و زرووفی ڕامیاری و هزری(فکری)ی وڵاتی موسڵمانانی نەکۆڵیوەتەوە.

* * *

ئەفغانی لە بواری بانگەوازەکەی بۆ (یەکێتیی ئیسلامی) بەرنامەیەکی کامڵ و سنووردار و مەبەست ڕوونی نەبوو. ئەو بەپەلە بوو و دەیویست لە ژیانیدا بەری ئەمامەکەی و سەرکەوتنەکەی ببینێ.

(فرنو)ی بیریاری فەرەنسی لە کتێبەکەی دا (وشیاریی جیهانی ئیسلامی) بزوتنەوەی ئەفغانی کورت دەکاتەوە و دەڵێت: "ئەفسەکانی وشیارکردەوە زیاتر لەوەی ڕێگای نوێیان پێ نیشان بدات.".[2]

ئەفغانی بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕەکانی کە تایبەتن بە یەکبوونی موسڵمانان لەژێر پەرچەمێکدا چەند ڕێگەیەکی گرتە بەر:

١-**بزوتنەوەی کەسیی**: لەوانەش: دوانەکانی خۆی و چاوپێکەوتنەکانی بە سەرۆك و پاشایان و ئامادەکردنی دوانەدەر و ڕۆشنبیری گەورەی موسڵمانان، وەکو:

---

١ سەرچاوەی پێشوو.

٢ سەرچاوەی پێشوو.

(عبدالله الندیم) لە قاهیرە و (محمد عاکف) لە ئەستەنبۆل.

**٢-نووسین لە رۆژنامەکان:** ئەفغانی بەیارمەتیی قوتابییەکەی (شێخ محمد عبدە) رۆژنامەی (العروة الوثقی)ی لە پاریس دەرکرد بۆ بەرگریکردن لە کیشەکانی جیهانی ئیسلامی و ئاگادارکردنەوەی رۆژهەڵاتیەکان لەو ئەرکانەی، کە پشتگوێیان خستوونە و بوونەتە هۆی کەوتن و کزبوونی جیهانی ئیسلامی و دیاریکردنی ئەو رێگایانەی، کە پێویستە موسلمانەکان لەسەری برۆن بۆ ئەوەی تێبگەن کە چییان لەکیس چووە و، وشیارکردنەوەی هیمەت و پەیوەندی گریدان لەنیوان میللەتانی رۆژئاوا و رۆژهەڵات و هەستکردن بە سوودە هاوبەشەکانی نێوانیان، "بەهێزکردنی پەیوەندییە گشتیەکان لە نیوان میللەتاندا و گەیشتن بە قازانجە هاوبەشەکانی نێوانیان، هەروەها رۆژنامەکە-لایەنگری ئەو سیاسەتانەیە کە حەزیان لە ستەم و بەکەمزانینی مافی رۆژهەڵاتیەکان نییە.".[1]

**٣-دامەزراندنی کۆمەڵە و دامەزراوەکان و بەکارهێنانیان وەکو هۆکارێ بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەرەکانی:** ئەمەش یەکیکە لە تەکنیکەکانی ئەفغانی وەك بەدیار دەکەوێ- کە ئاور لە جیاوازیی رێباز، یا سیاسەت یا باوەر نەدریتەوە.

بەڵام ئەو کۆمەڵ و دامەزراوانەی کە ئەفغانی بۆ خزمەتکردنی کیشەکەی خستیە ژیر دەستی ئەمانەن:

**یەکەم: کۆمەڵەی العروة الوثقی**-: ئەمە کۆمەڵەیەکی ئیسلامیی جیهانیە و لەسەر بنچینەی ئیسلامی دامەزراوە و لەسەر ئەندامی پێویستە، کە "هەر چەندی دەتوانی هەوڵ بدات بۆ زیندوکردنەوەی برایەتیی ئیسلامی، هیچ شتێ بەپێش نەخا تەنیا گەر ئایین پێشی خستبی، هیچ شتێ بەدوا نەخا تەنیا گەر ئایین دوای خستبی، تەنیا پییەك نەبزوینی گەر بزانێ بەگشتی، یان بە هەندەکی زیان بە ئایین دەگەیەنێ.".[2]

ئەم کۆمەڵەیە چەند لقێکی لە باکووری ئەفریقیا و میسر و هیند و وڵاتانی تری رۆژهەڵاتی ئیسلامی بڵاو بوویەوە. ئەوانەی کە مێژووی جەمالودینی ئەفغانییان

---

١ سەرچاوەی پیشوو.

٢ سەرچاوەی پیشوو.

نووسیوەتەوە دەڵێن: "کۆمەڵەیەکی نهێنیە لە ڕێکخستن و ئەندام و پەیوەندییەکانی، ئەمەش وەکو هەموو ئەو دامەزراوانەی کە ئەفغانی دایانیمەزراندوە یا سەرپەرشتیانی کردووە.[1]

**دووەم: کۆمەڵەی ڕێکخستنی پارتی نیشتمانی:** ئەم کۆمەڵەیە لەسەر بنچینەیەکی نیشتمانی نەتەوەیی دامەزراوە. (میرزا لطف الله خان) لەم بارەیەوە دەڵێ: "ئەفغانی لە میسر ئەم پارتەی دامەزراند و گەنجەکان لە دەوری کۆبوونەوە. یەکەم کۆنفرانسی پارتەکەی کردەوە کە سێ (٣) ملیۆن گەنجی میسری بەخۆوە گرتبوو.". ئەم پارتە لەساڵی ١٨٧٩ع دامەزرا.

یەکێ لە توێژەرەوە موسڵمانەکان ڕەخنە لەمە دەگرێ و دەڵێ: "ئەوەی ئاشکرایە ئەم ژمارەیە پێوەنانی پێوە دیارە، ئەم پێوەنانەش لە دەسکەوت و کردەوە ئەندێشەییەکانی ئەم پارتەدا دیارە و زۆر قەبەیان کردووە.".[2]

(اللورد کرومر)ی باوەڕپێکراوی بەریتانی لە میسر ستایشی کردەوەی ئەفغانیی کردووە لە دامەزراندنی ئەم پارتە نیشتمانیە و دەڵێت: "پارتی نیشتمانی دیارترین ڕووکاری بزوتنەوەی عەرەبە لە سێزدە سەدە لەمەو بەرەوە.".[3]

**سێیەم: ئەنجومەنی ڕۆژهەڵات:** ئەمە گروپێکی ماسۆنیە و سەر بە ئەنجومەنی ڕۆژهەڵاتی فەرەنسیە. ئەفغانی بەگەڵ کەوتنە ماسۆنیەکەی کردە هۆکاری بۆ جێبەکێکردنی مەبەستەکانی.

سەرەتا لە ساڵی ١٨٧٨ بەگەڵ گروپی ماسۆنیی قاهیرە کەوت و لەم ڕووەوە دەڵێ: "یەکەم شت کە ئارەزوومی بەرەو کۆشکی ئازادان (**مەبەستی ماسۆنیە**) برد ناونیشانە گەورە ترسناکەکەی بوو -سەربەستی و برایەتی و یەکسانی-، **هەروەها قازانجی مرۆڤ و هەوڵدان بۆ ڕماندنی قەڵای ستەم و بنیاتنانی دادوەرییەکی ڕەها.**".[4]

ئەفغانی هەر کە بینی شێوازە نەزۆکەکانی ئەم گروپە ناتوانێ مەبەستەکانی بپێکێ،

١ سەرچاوەی پێشوو.
٢ سەرچاوەی پێشوو.
٣ سەرچاوەی پێشوو.
٤ سەرچاوەی پێشوو.

وازی لێهێنا، -گروپی قاهیرە سەر بەگروپی ئیسکتلەندیی بەریتانی بوو- گروپێکی دیـی دامەزراند، کە سەر بە گروپـــی ڕۆژهـــەڵاتیی فەرەنســی بــوو، قوتـابی و ئەوانــەی پێــی کاریگەر بوون بەگەڵ خۆی خستن و ژمارەیان بـــووە (٣٠٠) کـەس. لـە نێـوان ئەوانـەی چوونە ناو گروپەکەوە (محمد توفیق)ی جێگری والی بوو کە دوایی بووە والیی میسر.

**چوارەم: کۆمەڵەی ئێرانی (فتاة) لاوان:** ئەمە کۆمەڵەی بابیەکانی ئێرانیە، کە دوای زنجیرەیێ لە کاری گێرەشێوێنی و تۆقـاندن لـە سـاڵی ١٨٥٠ لـە ئـێران هـەڵاتن. دامەزرێنەری بزووتنەوەی بابی (محمد علی)ی سەرۆکی ڕێبازی شێخایەتیی دەروونیە، کە لە (٨)ی یۆلیۆی ١٨٥٠ لەگەڵ یەکێ لـە موریدەکـانی لـە (تـەوریز) لـە سـێدارە درا. سەرکردەکانی بابیەکان لـــە سـەرووی هـەموویان (صبـح الازل) و برایـەکی (بـهاء الله) لەترسی سزادانیان هەڵاتنە بەغدا. لەبەر ئەمە میریی فارسی داوای لە دەوڵەتی عوسمانی کرد، کە دوورتریان بخاتەوە لەناو دەوڵەتی عوسمانی، بەمجۆرە لە هـاوینی ١٨٦٤ع بـەرەو ئەستەنبۆڵیان بردن و دوایی بەرەو (ئەدرەنە)، لەم شوێنەدا (بهاء الله) داوای ئەوەی کرد کە دەرکەوتەی یەکەمی ویستی خواییە*، هەروەك (دامەزرێنەری بزوتنەوەکەش) ئەمەی دەگوت، لێرەدا دژایەتی کەوتە نێـــوان (بـهاء الله) و بـرا گەورەکـەی، چونکـە ئـەمیان باوەڕی بە داواکەی (بـــهاء الله) نـەبوو و رقـە بەرییـەکی خوێنـاوی کەوتـە نێوانیـان و دەوڵەتی عوسمانی چووە نێوانیانەوە و (بهاء الله) و دەستوپێوەندەکانی بـۆ (عکـا) دوور خستەوە و (صبح الازل) و دەستوپێوەندەکانی ئەویشی بۆ (قبرص) هـــەنارد، بـەم جـۆرە بابیەکان و بەهائیەکان لە دەوڵەتی عوسمانی بە پارچە پارچەیی لە تاراوگەدا ژیان.[1]

دوای ئەوەی سوڵتان عبدالحمید لە ساڵی ١٨٩٢ع داوای لە ئەفغانی کرد کە سەردانی ئەستەنبۆڵ بکات، ئەفغانی لـە کۆشـکێك نیشـتەجێ بـوو لـە گـەڕەکی (شیشـلی) لـە پایتەختی عوسمانی و لەوێدا دەستی بە چالاکیە هەمە جۆرەکانی کرد لە پێناو داواکەیدا و یەکێ لەو چالاکیانەش ئەفغانی وەکو (کانگا و ڕاوێژکاری) بابیەکان بوو.[2]

---

* واتا: (بهاء الله) هەستی بەوە دەکرد کە خوا چووەتە ناو لەشیەوە و بەشێکە لە خوا (حلول) وەرگێڕ-.

١ برۆکلمان، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٦٥-٦٦٦.

٢ شریف ماردین، ص٥٥.

جەمالودينى ئەفغانى كۆمەڵەيەكى لە ئەستەنبۆڵ بۆ بابيەكان ريكخست و نـاوى نـ كۆمەلەى (ئيرانى لاوان)، هەروەها بە نهينيەوە هەنديكيانى نارده ئيران بۆ ئـەوەى دژى فەرمانرەوايى ئيران كار بكەن.

هەندى لەو بابيانەى لەسەر گواسـتنەوەى چاپكراوەكـانى (تركيـا الفتـاة) و (الاتحـاد والترقي) دەژيـان و ئەمانـە لـە لايـەن عوسمانيـەوە چـاپكراوى قەدەغـە بـوون- ئـەم چاپكراوانەيان لەسەر ئەندامـەكانى (الاتحـاد والـترقي) دابـەش دەكـرد لـەناو دەولـەتى عوسمانى، هەروەها ئەم بابييانە هەندى كـارى رۆژنامەگـەرى و ئەدەبيـەكانى كۆمەلـەى عوسمانيە نوييەكانى دژ بە رژيمى عوسمانييان چاپ دەكرد.[1]

(إبراهيم تيمو)ى دامەزرينەرى كۆمەلەى (الاتحاد و الترقي) دەليت:

رەزا عەجەمى قوتابيى ئەفغانى و بكوژى شاى ئيران كە شاى كوشت پيـى گـوت: لە دەستى جەمالودينەوە وەرى گرە- رۆژنامە قەدەغە كراوەكانى لە ئەستەنبۆڵ دەدايى، ئەو رۆژنامانەى كە بەرهەلستكارەكانى سولتان عبدالحميد لە ئەوروپا دەريان دەكرد و بە دزييەوە دەهاتە ناو دەولەتى عوسمانييەوە.[2]

ئەوەى شايانى باسە ئـەفغانى پەيوەنديـەكى لـە نيـوان كۆمەلـەى ئـيرانى لاوان و توركياى لاوان لە دەولەتى عوسمانى و ئەورووپا دروستكرد، هيشتا بريارەكانى كۆمەلەى ئيرانى لاوان لە ئەستەنبۆڵ كە (أبوضيا توفيـق)ى ميـژوو نووسـى عوسمـانى بـەناوى كۆمپانياى ئيرانى ناوى ناوە- ديار نييە و كەس ئاگادارى كارەكـانى نييـە، وا پيدەچـى لەسەر پلانى ئەفغانى رۆيشتبى لە نهين كاريدا.[3]



---

١ شريف ماردين، ص٥٥.

٢ إبراهيم تيمو، مذكرات إبراهيم تيمو مؤسس الاتحاد و الترقي (رۆمانيا ١٩٣٩) و أستانبول ١٩٨٧ ص٥٩.

٣ الشوابكة، ص١٣٤ و مصطفى كامل ثاشا، المسألة الشرقية ج١، ص٢٨، و كتاب صادق أل بايراق بعنوانه التركي (أفغاني يتردية) أي: الرد على الافغاني وهو (السيوف القواطع) إنما بحروف لاتينية و جريدة اللواء في (٥) مارس عام ١٩٠٠ و مصطفى كامل المسألة الشرقية ج١، ص٢٢٦ و مجلة العالم الاسلامي (مصر) العدد (٩٤) في يناير ١٩٠٧، و مصطفى كامل أيضا ج١، ص٥: نقلا عن االشوابكة، بالتوالي صفحة (١٤٦) الرسالة- وما بعدها.

ئەفغانی لە هەڵبژاردنی کەسێتیە لاوەکانی ئەو وڵاتانەی سەری لیّ دەدا، یا ئەوانەی پێی کاریگەر بوون سەرکەوتوو بوو، گرنگیی پێدەدان و پەروەردەی دەکردن بۆ ئەوەی لە ئاییندەدا ڕۆڵی خۆیان لە بنیاتنانی نەتەوەی ئیسلامی ببینن، ئەفغانی وەك ڕەوشتی خۆی- لە هەڵبژاردنی ئەوانەدا بێلایەن بوو، چونکە مەبەستی کۆتایی بنچینەی بزوتنەوەکەی بوو. هەر لەبەر ئەمە لە ئەستەنبۆڵ گەنجێکی هەڵبژارد کە لە دواییدا بووە پێشڕەوی تەوژمی ئیسلامی لە تورکیا، ئەویش بانگخوازی ئیسلامی و شاعیری ئیسلامی (محمد عاكف) بوو. هەروەها ئەفغانی لە ئەستەنبۆڵ (محمد أمین)ی هەڵبژارد و گیانی شۆڕشگێڕێتی خۆی خستە دەرونیەوە و لە ئەنجامدا (محمد أمین) بووە شاعیری میللیی پێشڕەو لە تورکیادا و شیعرەکانی لەنێوان نەتەوەیی و بە پلەی یەکەم- ئیسلامیدا بوو. کارتێکردنی ئەفغانی لە هزری (الاتحاد و الترقی)ی نەتەوەیی لەڕێگەی (محمد أمین)ەوە گەیشتە یەکگرتووەکان (الاتحادیون) کە هاوڕێیان بوو.

یەکێ لەو قوتابیانەی کە ئەفغانی لە ئەستەنبۆڵ هەڵیبژاردبوون مافپەروەری بلیمەت (محمد سید (فندی) بوو کە لە دواییدا- بووە (محمد سید بگ)ی مافپەروەری تورکیی مەزن، خاوەنی کتێبی (الخلافة: ماهیتها الشرعیة) بوو، لە ١٩٢٤ لە ئەستەنبۆڵ دەرچوو. ئەم کتێبە بریتیە لە دوانەکەی لە پەرلەمانی تورکی و لەکاتی ئەتاتورك- لەو دوانەدا (محمد سید بگ) ئەو دەقە یاساییانەی پێشکەشکرد، کە خیلافەتی ئیسلامی پێ هەڵوەشێنرایەوە. (محمد سید) باوەڕی بە جیاکردنەوەی نێوان پابەندبوونی کەسی بە ئیسلام و شەریعەتی ئیسلامی هەبوو.

لە قوتابیەکانی ئەفغانی لە میسر شێخ (محمد عبدە) و زەعیم (سعد زغلول)ی سەرکردەی شۆڕشی میسری ١٩١٩ بوو لەژێر دروشمی (ئایین بۆ خوا و نیشتمان بۆ گشت) و موسڵمان و قیبتیە میسریەکانی کردە یەك دژی ئینگلیز. ئەوەی شایانی گوتنە (سعد زغلول) دامەزرێنەری پارتی (وەفد) بوو لە میسر، یەکەم پارت بوو ئایین و دەوڵەتی لە یەکتر جودا کردەوە و، هانی میسرییە موسڵمان و دیانەکانی دا کە بەرگریی دوژمنی بێگانە بکەن کە ئینگلیزە.



ئەفغانی لایەنگریی داوای سوڵتان عبدالحمیدی کرد بۆ کۆمەڵگای ئیسلامی و زۆر

پرۆژەی لەهی سوڵتان گەورەتری پێشكەشكرد، ئومێدی سوڵتان لە یەكبوونی مەبەستی نێوان گەلە ئیسلامیەكان و یەكبوونی بزووتنەوەكەی زیاتر نەبوو، ئەمە لە هەمان كاتدا یەكێتیەكی هەستیی كردەیە و خیلافەت لەو یەكێتیەدا بە سام و هێز دەبێت.

بەڵام ئەفغانی پرۆژەیەكی پێشكەشی سوڵتان كرد بە مەبەستی یەكبوونی سوونە و شیعە، كەچی بۆچوونی سوڵتان عبدالحمید لە یەكگرتنی بزوتنەوەی ڕامیاریی هەردوولایان زیاتر نەبوو بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ئیمپریالیزمی جیهانی.

سوڵتان عبدالحمید لە بانگەشەكردن بۆ كۆمەڵەی ئیسلامی زۆر سوودی لە ئەفغانی وەرگرت، سەرەڕای جیاوازیەكی ڕوونی نێوان بیروبۆچوونی سوڵتان و ئەفغانی، هۆیەكانی جیاوازییان ئەمانەن:

١-باوەڕهێنانی ئەفغانی بەكێشەی یەكێتیی موسڵمانان و لە هەمان كاتدا لایەنگریكردنی شۆڕشگێڕە نەتەوەییە تورك و عوسمانیەكان دژی سوڵتان عبدالحمید.

٢-داوای ئەفغانی بۆ یەكێتیی گەلە موسڵمانەكان، بەشێوەیێكە وەكو تاكە ساختمان و تاكە دڵی بن لە ڕووبەڕوبوونەوەی دەوڵەتە ئەورووپیەكان، كە دەیانویست دەوڵەتی عوسمانی لەناو بەرن، لە هەمان كاتدا ئەفغانی دژی داگیركەری فەڕەنسی نەوەستا بە تەنیا وشەیەكی ناڕەزاییش. خۆ لەو كاتەدا سوڵتان عبدالحمید پێویستی بە بەرگریكردنی فەڕەنسیەكان هەبوو لە باكووری ئەفریقیا.[1]

٣-ناڕەزایی دەربڕینی ئەفغانی بە داگیركەری ئینگلیز، كەچی **سوڵتان عبدالحمید** دەری بڕیوە كە هەواڵگری عوسمانی پیلانێكی لە **وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی** بەدەستكەوتووە، كە ئەفغانیش لەگەڵ (بلنت)ی **ئینگلیزی هاوبەشیی تێیدا كردووە،** پیلانەكە بریتیە لەوەی كە سوڵتان عبدالحمید **لە خیلافەت دوور بخرێتەوە و بەگشتی لە** عوسمانیەكانیش بسێنرێتەوە.

ئەم (بلنت)ە ڕامیارێكی ئینگلیزیە و لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی كار دەكا و دانەری كتێبی (مستقبل الاسلام)ە و بە ئاشكرا هەوڵی ئەوە دەدا كە

١ سەرچاوەی پێشوو.

خەلیفایەتی لەبەردەستی عوسمانیەکان دەربهێنرێ و بدرێتە عەرەبەکان.

(مصطفی کـامل پاشـا)ی سـەرۆکی بزوتنـەوەی نیشـتمانی لـە میسـر لـە کتێبـە بەناوبانگەکەی (المسألة الشرقیة) بەرپەرچی (بلنت) دەداتەوە و دەڵێ:

"بە گشتی بەڕێز دانەری کتێبی (دوا ڕۆژی ئیسلام) لەو باوەڕەیە دانەریش وەرگێڕی ئاواتەکانی هاوڕەگەزەکانیەتی- کە شیاوترە بۆ ئیسلام، ئینگلتەرا دەوڵەتێکی بۆ دابنـێ و پێویستە خەلیفەش ئینگلیزی بێ." [1]

٤- سەرەڕای چاوتێبڕین و جەنگەکانی ڕوسیا دژی عوسمانی و دابڕینی چـەند پارچـە خاکێکی عوسمانی، هەڵوێستی ئەفغانی لە بنەمای خۆ فراوان کردنی ڕوسی سەیر بوو لە دیدگای کۆمەڵگای ئیسلامیەوە، چونکە ئەفغانی دانی بە بەرژەوەندیـەکانی ڕوسـیا لـە هیند دەنا و هانی دەدان بۆ داگـیرکردنی، ئەگـەر ڕوویـدا نـاڕەزایی دەرنـابڕێ و بـەڵکو ئامۆژگـاری ڕوسـیەکان دەکـات کـە ئاسـانترین و هێمنـترین ڕێگـا بگرنــە بــەر بــۆ جێبەجێکردنی، ئەمەش لە ڕێگەی خواستنی یارمەتی لە دەوڵـەتی فـارس و ئەفغانـەوە دەبێ، تا دەرگای هیندی بۆ بکرێتەوە، بەمەرجێ هەردوو دەوڵەتەکـە هاوبـەش بـن لـە دەستکەوت و قازانجەکان.

٥-ئەو نارێکیە بیروباوەڕیەی کە لە نێوان زاناکانی ئەستەنبۆڵ و ئەفغانی دەرکەوت و پەیدابوونی کتێبی شێخ خەلیل فەوزی فیلیباوی (السیوف القواطع) واتا: شمشێرە بڕەکان بۆ بەرپەرچدانەوە لەسەر بیر و بـاوەڕی ئـەفغانی و بێدەنگبوونـی ئـەفغانی و بـەرگری نەکردنی لە خۆی. کتێبەکە بـە زمـانی عەرەبیـە و لـەکاتی خـۆی بـۆ زمـانی تورکـی وەرگێڕدراوە.

٦-ئارەزووی سوڵتان عبدالحمید لەوەی کە هەموو دەسەڵاتەکان بخاتە دەستی خۆیەوە دوای ئەوەی گەلێ ئازار و تـاڵیی لـە دەسـتێ وەزیـر و ئەفسـەری سـوپاکەی و سـەرۆك وەزیرەکانی بینـی، ئەوانـەی کـە بـە هـزری ڕۆژئـاوایی کاریگـەر بـوون و دەیانویسـت دیموکراتیەتێکی ئەوروپی بنیات بنێن، کــە ئەنجوومـەنێکی هـەڵبژێردراوی تێدابـێ کـە نوێنەرایەتی هەموو گەلانی عوسمانی بکات. سوڵتان عبدالحمیـد دژی ئەمـە وەسـتا بـە

---

١ سـەرچاوەی پێشوو.

بیانووی ئەوەی كە ژمارەی نوێنەرە موسڵمانەكان نزیكەی نیوەی ژمارەی گشتیی پەرلەمان دەبێت.

لەو كاتەی كە ئەفغانی ئارەزووی لە دیموكراتیەتە و نایەوێ دەسەڵات هەر لە دەستی تاكەكەسێك بێت و ئارەزووی لە سەربەستی ڕا دەربڕینە.

## ٢/لە میسر: مستەفا كامل پاشا:

سوڵتان عبدالحمید كە بانگەوازی كۆمەڵگای ئیسلامیی دەكرد، زانیی كە لە میسر گەنجێكی بلیمەت هەیە و ناوی (مصطفی كامل)ە و مافپەروەرێكی میسرییە و پێش ئەوەی بگاتە تەمەنی بیست ساڵی لە زانكۆی (تولوز)ی فەرەنسی دەرچووە، زمان پاراو و قسە ئەفسووناوییە، بە دووان و وتار و كتێبەكانی خۆی تەرخانكردووە بۆ بەرگریكردن لە داگیركردنی میسر لە لایەن ئینگلیزەكانەوە و ئارەزووی لە كۆمەڵگای ئیسلامییە.

سوڵتان عبدالحمید داوای لە (مصطفی كامل) كرد، كە سەردانی ئەستەنبۆڵ بكا، مستەفا كامل لە تەمەنی بیست و دوو ساڵی بوو، واتا:

دوای دەرچوونی لە زانكۆ بە دوو ساڵ وەڵامی داواكەی دایەوە، سوڵتان جارێكی دی داوای سەردانی لێكردەوە، مستەفا كامل لە ٣٠ی یۆنیۆی ١٨٩٦ وەڵامی دایەوە و دوای سێ ساڵ لە ٢٥ی مایۆی ١٨٩٩ سەردانی سێیەمی كرد بۆ ئەستەنبۆڵ و سوڵتان عبدالحمید پلەی (متمایز)ی پێ بەخشی. هەر لە هەمان ساڵ (١٨٩٩) و لە مانگی ئۆگستۆس سوڵتان پلەی دووەمی (الثانیة) پێ بەخشی. لەسەردانێكی تریدا بۆ ئەستەنبۆڵ سوڵتان نیشانی (مەجیدیی دووەم)ی پێ بەخشی. بەڵام لە ساڵی ١٩٠٤ سوڵتان پلەی مستەفا كاملی بۆ (میری میران) گۆڕی، چونكە زۆر بە حەماسی كاریگەر بوو بۆ كۆمەڵگای ئیسلامی.

* * *

بەڵام هزری بانگەوازی كۆمەڵگای ئیسلامی مستەفا كامل بەمجۆرە بوو:

سوڵتان عبدالحمید دانا و بەتوانایە لە سیاسەت، هەوڵێكی بێ وچان دەدا بۆ ئەوەی سەربەرزی و شكۆمەندی و یەكێتی موسڵمانان بگێڕێتەوە.

هەندی لە رامیارە بەریتانیەکانی وەکو (بلنت) رەخنە لە سولتان عبدالحميد دەگـرن، هۆیەکەشی بۆ ئەمە دەگەریتەوە کە سولتان ئارەزووی لەوەیە گوتـەی موسـلمانەکان لـە دەوروبەری پەرچەمی خیلافەتی ئیسلامی کۆ بکاتەوە و سیاسەتی کۆمەلگای ئیسلامی لە نیوانیان قوول بکاتەوە، ئەمەش کاریکـە ئینگلیزەکـان دوور دەخاتـەوە لـەوەی، کـە بتوانن ناکۆکی بخەنە ناو موسلمانەکان و لە دەسەلاتی عوسمانی بە دووریان بخەنەوە.

مستەفا کامل گەواهی دەدا "ئەو یەکەم کەسە بەرامبەر خوا و خەلك گـەواهی دەدا کـە سـولتان عبدالحميـد گـەورەی دانایەکانـە و پیشـرەوی رامیارەکانـــە و پیشـــەوای میللەتانە.".

مستەفا کامل لەو باوەرەیە کە سولتان عبدالحميد "لە هەموو رۆلەکانی میسر زیـاتر میسری خۆش دەوی و لە هەموویان راستگۆ ترە بەرامبەری و بەرزترین حەز و ئارەزووی لەوەدایە کە موسلمانان لە سەروەری دابن لە ژیر پەرچەمی خەلیفایەتی.".[1]

هەروەها مستەفا کامل لەو باوەرەیە "کـە ناخۆشـی و تـەنگو چەلەمـە لـە هـەموو رویکەوە گەمارۆی دەولەتی عوسمانیی داوە و دوژمنەکانی لە هەموو سووچیکەوە پیلانی بۆ دەگیرن و دەولەتان هەموویان یـەکن دژی.". لەبـەر ئەمـە "سـولتان عبدالحميـد بـە هەموو توانایەکی هەول دەدا کاروبارەکان ریك بخا و حالەتەکان چاك بکاتەوە و کارەسات و مەترسی‌یەکان لابەریت.".[2]

مستەفا کامل لە بارەی خۆشەویستی خـۆی و میسـر و میسـرییەکان بـۆ دەولـەتی عوسمانی پێشرەوی بزوتنەوەی کۆمەلگای ئیسلامی- دەلیت: "دەبیستن یـەکی دەڵێ: ئەوە چیانە میسرییەکان دەولەتی عوسمانییـان خۆشـدەوی و قوربـانی لـەپیناو قـازانجی دەدەن و کەوەری[3] نابن لە راگەیاندنی ئەو خۆشەویسـتیە؟ ئیمـە دەولـەتی عوسمانیمـان خۆشدەوی، پێش هەموو شتێ دەمانەوێ دەوڵەتێکی رۆژهەلاتی بەدی بکەین، کە تیشك و رووناکیی بۆ هەموو نەتەوەیەکی رۆژهەلاتی بچیت، خۆشمان دەوێ چونکە موسـلمانین،

---

١ سەرچاوەی پیشوو.

٢ سـەرچاوەی پیشوو.

٣ کەوەری: بیزار، وەرس.

وا هەستدەكەین كە موسڵمانانی ڕۆژهەڵات دەپارێزێ و پارێزگاری وڵاتە پاكە پیرۆزەكە دەكات.

لە ڕاستیدا وڵاتی خەلیفایەتی ئیسلامی وڵاتی ئێمەیە، ئەو ڕووگەیەیە كە پەنای بۆ دەبەین و ڕووی تێدەكەین، ئەگەر بەرامبەر یەكێ لە ئەركەكانی كەم و كوڕیمان هەبوو، ئەوا بێگومان كەم و كوڕیمان لە گەورەترین ئەرك كردووە.".[1]

※ ※ ※

مستەفا كامل لای وابوو كە كێشەی ڕۆژهەڵاتیی، كێشەیەكی ئایینیە و لەسەر بنەمای دژایەتیكردنی ئەورووپای مەسیحی بۆ جیهانی ئیسلامی و دەوڵەتی عوسمانی بەتایبەتی هەستاوە. لەم ڕووەوە گوتی: مانەوەی دەوڵەتی عوسمانی تەنیا بۆ میسری و موسڵمانەكان پێویست نیە، بەڵكو بەگشتی بۆ هەموو جۆری مرۆڤی پێویستە و مانەوەی دەسەڵاتی هێمنی و ئاشتیە كەبۆ میللەتانی ڕۆژئاواو و ڕۆژهەڵات.

※ ※ ※

بەلای مستەفا كاملەوە گواستنەوەی خەلیفایەتی لە دەوڵەتی عوسمانیەوە واتا: بۆ خەلیفایەتیی عەرەبی- پیلانێكی بەریتانییە، مەبەستی ئینگلیز ئەوە بوو كە ملوانكەی خەلیفایەتی لە ملیان بێت نەك لە سینگی ئیسلام.

※ ※ ※

مستەفا كامل توانای دواندەری و خامەكەی بەكارهێنا بۆ بانگەشەكردنی كۆمەڵگای ئیسلامی و هاوكاریكردنی موسڵمانان و هەوڵدان لە پێناو دوورخستنەوەی مەترسییە ڕۆژئاواییەكان لە جیهانی ئیسلامیدا، هەروەها توانی بەسەركەوتنێكی مەزنەوە- كە ڕەگەزە ئایینی و ڕامیاری و نیشتمانییەكان بەكاربێنێ بۆ خزمەتی بانگەوازی كۆمەڵگای ئیسلامی.

※ ※ ※

مایەوە ئەوە بگوترێ: كە سوڵتان عبدالحمید لەگەڵ مستەفا كامل ڕێكبوو لەوەی، كە بەرگرییەكی عاقڵانەی ئاشتیانە بكرێ و ڕووبەڕوو بوونەوەی سەربازی لەگەڵ دەوڵەتە

١ سەرچاوەی پێشوو.

ڕۆژئاواییەکان دوور بخرێتەوە، چونکە دەوڵەتی عوسمانی ئامادەی ئەم ڕووبەڕووبوونەوەیە نەبوو.

## ٣/لە سوریا: شێخ (أبو الهدی الصیادی):

خەڵکی شام بەوە ناسراون کە پێش خەڵکی تر پەیوەندییان بە عوسمانیەکانەوە کردووە بۆ ئەوەی وڵاتەکەیان لە ستەمی مەملوکیەکان بپارێزن.[1] هەروەها بەوە ناسراون کە پارێزگارییان لە کولتووری ئیسلامی کردووە و بەرامبەر هێرشی کولتووری ڕۆژئاوایی، کە لە بێروتەوە دەهات وەستاون. هیچ باڵیۆزێکی بێگانە نەیتوانیوە بچێتە ناو دیمەشقەوە تەنیا لەژێر پاسەوانیی ئیبراهیم پاشای میسری نەبێ، لە ١٨٣٣ ئەم پاشایە ڕێگای بە باڵیۆزی ئینگلتەرا دا کە بچێتە ناو دیمەشقەوە، لەگەڵ ئەمەش خەڵکی دیمەشق ورووژان.

خەڵکی شام بوونە لایەنگری دەوڵەتی عوسمانی لە ناکۆکیەکەی لەگەڵ محەمەد عەلی پاشا هەر کە لە ساڵی ١٨٣٢ سوریای گرت، هەروەها سورییەکان وەستانێکی برایانەیان لەگەڵ عوسمانی و پاشماوەی عوسمانیەکان کرد لەکاتی جەنگەکەی دژی یۆنان ساڵی ١٨٩٧ع.

لە ئەنجامی فشاری ڕۆشنبیری دەوڵەتە ئەوروپییەکان و فەرەنسا لەسەر وڵاتی شام بەتایبەتی، خەڵکی بە گشتیی بەرگرییان لەو فشارە کرد، کە بریتی بوو لە قوتابخانە ئەوروپییەکان و پەیوەندیەکانی دیانەکانی شام بە ڕۆژئاواوە. سوڵتان عبدالحمید ویستی جەخت لەسەر بەقای دەوڵەتی عوسمانی بکا بە سورییەکان بە گشتی.

بۆیە لە دەسەڵاتە گەورە و گرنگەکانی دەوڵەت لە بواری ڕامیاری و سەربازی پەنای بردە بەریان و هەندێکی لێکردنە ڕاوێژکار، لەوانەش (عزت پاشا العابد)ی دیمەشقی و (نسیم پاشا ملحمه)ی لوبنانی و (سعید پاشا الکردی)، هەروەها شێخ (أبو الهدی الصیاد)ی کردە ڕاوێژکاری خۆی.

❊ ❊ ❊

---

١ محمد حرب، العثمانیون في التأریخ و الحضارة، ص١٧٠.

شێخ (أبو الهدی الصیاد) بەناوبانگترین زانایانی ئایینیی سەردەمی خۆی بوو و یەكێ لە دەسەڵاتەكانی نەقیبی پیاو ماقووڵانی هەموو ویلایەتی حەلەب بوو، لە ساڵی ١٨٧٣ لە سەردەمی سوڵتان عبدالعزیزدا شێخ تەمەنی بیست و پێنج ساڵ بوو. سوڵتان عبدالحمید لە خۆی نزیك كردەوە و خانەی خەلیفایەتی (مشیخة المشایخ)ی پێ بەخشی و بەنازناوی (مستشار الملك) ناوی دەركرد و سی (٣٠) ساڵ خزمەتی دەوڵەتی عوسمانیی كرد و بەرگریی لێ دەكرد و جەختی لەسەر ئەوە دەكرد، كە پێویستە موسڵمانان دانی پێدا بنێنن و پابەند بن پێیەوە و لایەنگریی سوڵتانیان بن.

ئەم پەیوەندییەی نێوان سوڵتان عبدالحمید و (ابو الهدی) لەسەر هەندێ لە رۆڵەكانی سوریا رەنگی دایەوە و (ابو الهدی) هەندێكیانی گەیاندە پلەی بەرز لە پایتەختی عوسمانی ئەستەنبۆڵ و حەلەب و تەرابلس و دڵنەوایی زانا و مەلایەكانی دەدایەوە بەشێوەیەكی تایبەتی.

شێخ (ابو الهدی) لە ئامۆژگاریكردنی سوڵتان دڵسۆز بوو، ئەمەش لەو كاغەز و بەڵگەنامانە بەدیار دەكەوێ كە پیاوانی میریی (الاتحاد و الترقی) دەستیان بەسەرا گرتبوو دوای لادانی سوڵتان، لەم بەڵگەنامانەدا بۆیان دەركەوت: كە شێخ (ابو الهدی) لەگەڵ سوڵتان دوو ڕوو و سیخوڕ نەبوو هەروەك دوژمنەكانی دۆڵیان بۆ لێدەدا- بەڵكو لە پلەی ئامۆژگاریكەرێكی رابەردا بوو، شێخ هیچ گفتوگۆیەكی لەگەڵ سوڵتان نەكرووە ئەگەر سوودی نەتەوە و دەوڵەت و خەڵكیی تێدا نەبێت.

ئەو هەڵمەتەی كە كرایە سەر (ابو الهدی) و زۆربەشی بە كۆن و نوێوە لە لایەن رۆڵەكانی شارەكەی خۆیەوە كراوەتە سەری لە چوارچێوەی ناكۆكیی خێزانی دەرناچێت و حەلەب لەو كاتەدا بەو جۆرە ناكۆكیانە ناسراو بوو، هەندێ خانەوادەی حەلەبی لەوانەش خانەوادەی (كەواكیبی) لە ڕووی ئێرەییەوە دژی ئاڵ (روفاعی) وەستان كە شێخ (ابو الهدی) لەو بنەماڵەیەوە بووە، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەو خانەوادەیە پلە و پایە و بەشێكی لە ئەستەنبۆڵەوە پێدرا بوو.

شێخی سەیادی وەكو ڕاوێژكاری یەكەمی سوڵتان بوو لە ڕێكخستنی كاروباری بزووتنەوەی كۆمەڵگای ئیسلامی و سەرۆكایەتیی ئەگەر بشێت- لیژنەی ناوەندیی

پرۆژەی کۆمەڵگای ئیسلامیی دەکرد لە پایتەختدا. ئەم لیژنەیەش ڕاستەوخۆ لەژێر سەرپەرشتیکردنی سوڵتان عبدالحمید دا بوو.

شێخ (ابو الهدی) تەنیا بە هزر و بزووتنەوە خزمەتی کۆمەڵگای ئیسلامی نەکرد، بەڵکو بە کتێب دانان ڕواڵەتەکانی گرنگیی ئەو کۆمەڵگایەی لە ژیانی موسڵمانان دەستنیشانکرد و ڕوونیکردەوە، کە بنەما گرنگەکانی بریتیە لە دەسەڵاتی خەلیفایەتی. هەروەها جەختی لەسەر ئەوە کرد کە پێویستە موسڵمانەکان لە دەورەی دەسەڵاتی خەلیفایەتی کۆ ببنەوە بەتایبەتی لە باروزرووفی دەست درێژیی دەرەوە بۆ سەر دەوڵەتی موسڵمانان، مەزنترین دانراوی بەناوی "داعي الرشاد لسبيل الاتحاد و الانقياد"ە.[1]

## ٤/لە سیبیریا: عبدالرشید إبراهیم:

بانگخوازێکی ئیسلامیە و نووسەر و قازی و گەڕۆك بووە، لە ساڵی ١٨٥٣ لە سیبیریا لەدایکبووە و لە ساڵی ١٩٤٤ هەر کە لە ناو ژاپۆنیەکان خەریکی بڵاوکردنەوەی ئیسلام بووە، مردووە.

خوێندنی ئایینی لە مەککە و مەدینە وەرگرتووە و گەیشتووەتە ئەستەنبوڵ، بووەتە یەکێ لە بانگخوازەکانی کۆمەڵگای ئیسلامی و ژیانی لەسەر ئەم بنەمایە وەستاندووە، کۆمەڵگای ئیسلامی خاڵی بزووتنەوەکەی بوو لە گەڕانە دوور و درێژەکەی بۆ بانگەشەکردن بۆ ئیسلام و کۆمەڵگای ئیسلامی لە تورکستان و مەغۆلستان و چین و ژاپۆن و مەنشووریا و وڵاتەکەی خۆی سیبیریا وکۆریا و سەنگافوورە و وڵاتی هیند و حیجاز. کۆمەڵگای ئیسلامی کاکڵەی چاوپێکەوتنەکانی بوو لەگەڵ خەڵکی لە هەموو ئەو وڵاتانەدا.

لە توێژینەوەکەیدا هەوڵی دەدا نهێنی پێشکەوتنی ژاپۆن بزانێ و دەستنیشانی هۆیەکانی دواکەوتنی جیهانی ئیسلامی بکات، هەر لە ئەندێشەی پێویستبوونی یەکێتیی ئیسلامیدا بوو.

لەو کاروبارانەی کە (عبدالرشید إبراهیم) زۆر گرنگیی پێدەدا چۆنیەتی ڕاگەیاندنی

---

١ جريدة لسان الحال السورية في ١٠ مارس ١٨٨٦، و يوسف الحكيم، سوريا في عهد العثماني، ص٥٨، و محمد كرد علي، مذكراته، ج١، ص٢٤٦ نقلا عن الشوابكة من ص٦٦ إلى ص٦٩.

بانگەوازی ئیسلامی بوو لەناو ژاپۆنیەكان و ئەم كارە خەوی لێ دەزراند چونكە ژاپۆنیەكان هەروەك عبدالرشيد إبراهيم دەلی- لە بواری خوو و رەوشت و ئاكار و شێوازی ژیان و بنیاتی خێزانیی یەكگرتوویان زۆر لە ئیسلام نزیك بوون و سەرنجی ئەوەی دەدا، كە نیردراوە مەسیحیەكان هەولی تیكدانی بنیاتی ئاكاری ژاپۆنیەكان دەدەن، لەبەر ئەوە (عبدالرشيد) داوای لە زانا موسلمانەكان دەكرد كە بە خێرایی بگەنە ژاپۆن و ئیسلامی تیدا بلاو بكەنەوە و ژاپۆنیەكان بە ئەستەنبۆلەوە گری بدەن، كە پایتەختی خەلیفایەتیە و سەنتەری بزووتنەوەی كۆمەلگای ئیسلامییە.

* * *

(عبدالرشيد) بە رەخنە و شێوازە ئاشكرا و تیژەكەی دژی سیاسەتی ئینگلیزی لە هیند دەوەستی و، هیمەتی هیندییەكان دەورووژینی، چونكە ئینگلیزەكان ستەم لەگەلە موسلمانەكان دەكەن و دوای ئەوەی دەمامكی فیلاوی دەپۆشن و دەیان چەوسیننەوە، بە هەموو شیوەیەك رووی ئینگلیزەكان بەو گەلانە نیشان دەدا و لە دیدگای ئەو، ئیسلام گەورەترین دوژمنی ئینگلیزە داگیركەرەكانە، بۆیە داگیركەری ئینگلیزی دژی ئیسلام دەوەستی، تا لە دەروونی موسلمانەكان كزی بكا بۆ ئەوەی بە ئاسانی ئینگلیزەكان سەركردایەتیی گەلە موسلمانەكان بكەن.

(عبدالرشيد إبراهيم) دەڵێت: "كاتی دادی هەموو ئاگر پەرستەكانی هیند پەنا بۆ ئیسلام دەبەن و (براهما) و (زەردەشت) و (بوزا) خۆیان لەبەر ئیسلام ناگرن." و "بەقەد دووركەوتنەوەی موسلمانەكان لە ئیسلام نەتەوەكانی دی لیی نزیك دەبنەوە.".

* * *

(عبدالرشيد) لە بارەی كۆمەلگای ئیسلامیەوە دەلێ: "ئەگەر موسلمانەكان كاریان بە ئیسلام بكردایە روسیا نەك هەر نەی دەتوانی سەركردایەتی و ئاراستەكردنی ۲۵۰,۰۰۰ سەربازی موسلمان لەناو سوپاكەی بكات بەلكو نەی دەتوانی ئەو موسلمانانە لەچوار چێوەی سنووری خۆی بهێلێتەوە و موسلمانەكان بەشداریی ئەو جەنگە نامرۆڤایەتیەیان نەدەكرد كە روسیا ئەنجامیان دەدات و ئینگلتەرا نەیدەتوانی بە سەربازەكانی میسر لە موسلمانەكانی سودان بدات. هەروەها ئینگلتەرا نەیدەتوانی بە

موسڵمانەکانی هیند دەست درێژی بکاتە سەر ئەفغانستان.".

(عبدالرشید) لە بارەی ململانێی نێوان موسڵمانەکان و ئەوانی دی دەڵێت: "ململانێیەکی بەردەوامان لەپێشە لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا، ئەنجامەکەشی ئەگەر بیرمان کردەوە- -موسڵمانەکان خۆ لەبەر ڕۆژئاواییەکان ناگرن- لەو دواییەدا زیاتر لە بواری هزرییەوە نەك سەربازی؛ ئامێرە جەنگیەکانی ئەمڕۆی جیهانی ڕۆژئاوا لە ڕاستیدا بۆ جەنگ نیە، بەڵکو بۆ ترساندنی دژە هزریانە و سەپاندنی هزری خۆیانە. ئەگەر بەپێی بۆچوونی ئیسلام موسڵمانەکان داوای ئازادیی خۆیان بکەن و ڕێزی واتای ئیسلام بە حەق بگرن، ئەو کاتە واتای ژیان تێدەگەن و لە ئەنجامدا دەبنە ڕێنیشاندەر و سەرکردەی هەموو وڵاتانی ڕۆژهەڵات. بێگومان لەو کاتەدا هەموو ئاواتەکانی وڵاتە ڕۆژئاوایەکان لە بنچینەوە وردوخاش دەبێ. لەو کاتەدا ژیاری ڕاستەقینەی چوار پەڕی جیهان ڕووناك دەکاتەوە و ژیاری ڕاستەقینەش ئیسلامە.".

* * *

(عبدالرشید) بە گەڕان و سووڕانەکانی لە وڵاتە ئیسلامی و نا ئیسلامیەکان زۆر خزمەتی هزری کۆمەڵگای ئیسلامیی دەکرد، ڕاڤەی ئیسلامیەکانی دەکرد و داوای دەکرد و سەرنجی خەڵکی بۆ ڕەوشتە ئیسلامیەکان رادەکێشا و داوای لێدەکردن کە لە دەوری ئیسلام و خەلیفەی موسڵماناندا کۆ ببنەوە. تاقیکردنەوەکەی خۆی لە گەڕانەکەیدا بۆ چینە ڕۆشنبیرە ئیسلامیەکەی ئەستەنبۆڵ راڤە دەکرد، (محمد عاکف)ی شاعیری ئیسلام بەو تاقیکردنەوەیە کاریگەر بوو و ئەم کاریکەریەش لە شیعر و قەسیدەکانی ڕەنگی دەدایەوە.

(عبدالرشید) ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە وشیارکردنەوەی موسڵمانەکانی تورکستان لە مەترسیی ڕوسی و ڕەهەندەکانی، هەندێ مزگەفت و قوتابخانەی ئیسلامیی لەو شوێنانە دروستکرد کە سەردانی کردن.

هەوڵ و کۆششێکی زۆری دا تا میریی ژاپۆنی لە ساڵی ۱۹۳۹ دانی بە ئیسلام ناو مزگەفتی تۆکیۆ لە ساڵی ۱۹۳۷ کرایەوە و گەلێ لە قوتابیە ژاپۆنیەکان لەو مزگەفتە فێربوون و (عبدالرشید) زۆر هەوڵی دا بۆ بەردەوامبوونی ئیسلام لە ژاپۆن و جێگیر

بوونی.

ئەم بانگخوازە (داعیة) چالاکە لە (٣١) ئۆگستۆسی ١٩٤٤ مرد.

* * *

(عبدالرشید إبراهیم) حەفت کتێبی هەیە، بەناوبانگترینیان گەشتەکەی بۆ ئاسیا (رحلته في آسیا) لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم و کتێبی ئاسیا لە مەترسیدایە (آسیا في خطر) ئەوە وەرگێڕانێکی تورکیە لە زمانی ژاپۆنییەوە و کتێبی ئایینی خۆڕسك (دین الفطرة)، هەموویان بە زمانی تورکین و لە ئەستەنبۆڵ چاپکراون.[1]

## ب-ڕێبازە سۆفیگەرییەکان:

دەوڵەتی عوسمانی هەر لە دامەزراندنیەوە متمانەی کردۆتە سەر شێخی ڕێبازە سۆفیگەریەکان لە هەندێ بنچینەکانی سیاسەتی دەرەوەیدا. دەوڵەتی عوسمانی ئەو زاهیدانەی* دەنارده ئەو ناوچە ئەوروپیانەی کە دەیویست فەتحیانی بکات، جا لەوێ نیشتەجێ دەبوون و خەڵکییان دەناسی و خەڵکیش ئەوانی دەناسی، ئەمەش جۆرە بانگەشەیەکی عوسمانی بوو بۆ ئیسلام، تا ئەگەر سوپای عوسمانی دوای ئەوە هاتن، دێنە سەر خاکێ کە دەیناسن و دەیانناسن.

هەروەها دەوڵەتی عوسمانی ئەو زاهیدانەی بەکاردەهێنا بۆ زانینی ڕای گشتی ئیسلامی و ئاڕاستەکانی، جا چ لەناو دەوڵەت یا لە دەرەوەی، لەو پەڕی تورکستان تا باکووری ئەفریقیا.

**سوڵتان عبدالحمید لەسەر هەمان سیاسەت ڕۆیشت لە بانگەشەکردن بۆ کۆمەڵگای ئیسلامی، ئەو سۆفیە زاهیدانەی بەکارهێنا بۆ خزمەتی کۆمەڵگای ئیسلامی و بەتایبەتی کۆمەڵگای ئیسلامی بنچینەی بیرکردنەوەی ئەوانە بوو. سوڵتان پەیوەندیەکی دروستکرد لە نێوان ئەستەنبۆڵ و تەکیە و خانەقای ئەو ڕێبازە سۆفیگەریانە لەهەر چوار**

---

١ عبدالرشید إبراهیم، رحلته في العالم الاسلامي و الیابان، ج١، ص١١-١٤ و دائرة معارف اللغة الترکیة و آدابها، ج١، ص٢/٢٢.

* زاهید و سۆفی جیان، زاهید پێش سۆفی پەیدابووە (وەرگێڕ).

بەڕێ جیهانی ئیسلامیدا.

پێویستە ئەمەشی بخەینە سەر کە سوڵتان عبدالحمید هەر چەندە ئەو سۆفیە زاهیدانەی بەکاردەهێنا بۆ بانگەشە کردنی کۆمەڵگای ئیسلامی، بەڵام سولّتان جگە لەوانەشی بەکاردەهێنا کە ببنە هۆکار و کۆڵەگە بۆ بیرۆکەی کۆمەڵگەی ئیسلامی.

* * *

لە پایتەختی خەلیفایەتی لیژنەیەکی ناوەندی لە زانا و شێخەکانی رێبازە سۆفیگەریەکان دامەزرا، لەوانەی کە بە لەخوا ترسان و زوهد و غیرەتی ئایینی ناسراو بوون، بۆ ئەوەی ببنە ڕاوێژکاری سولّتان لە کاروباری کۆمەڵگەی ئیسلامیدا، لەوانەش: شێخ (احمد أسعد) جێگری راخستنی پیرۆز لە حیجاز، شێخ (أبو الهدى الصيادي) شێخی رێبازی روفاعی، شێخ (محمد ظافر الطرابلسي) شێخی رێبازی مەدەنی، شێخ (رحمة الله) یەکێ لە زاناکانی حەرەمی مەککە، ئەوانە دیارترین ئەندامانی لیژنەی ناوەندیی کۆمەڵگای ئیسلامی بوون و هیتریشیان لەگەڵ بوو.

چەند دەستەیەکی لقیی ئەم لیژنەیە لە شوێنە جیاوازەکانی دەوڵەتی عوسمانی هەبوو، یەکێکیان لە مەککەی پیرۆز لەژێر سەرپەرشتی شەریفی مەککە و گرنگیەکەی بڵاوکردنەوەی بیرۆکەی کۆمەڵگای ئیسلامی بوو لە وەرزی حەجدا، ئەویتریان لە بەغدا و هەمان گرنگی هەبوو لەناو پەیڕەوانی رێبازی قادری، ئەوانەی بە زۆری لە باکووری ئەفریقاوە دەهاتن بۆ سەردانی دامەزرێنەری رێبازی قادری شێخ عبدالقادری گەیلانی. ساڵێکیان ژمارەی ئەوانەیان بە ٢٥,٠٠٠ کەس خەملاند. لیژنەی بەغدا کاری ئەوە بوو کە ئەوانە لەسەر هەڵگرتنی کۆمەڵگای ئیسلامی و بەرگریکردنی داگیرکەری فەرەنسی لە باکووری ئەفریقا ئامادە بکات.

هەواڵگری فەرەنسی وەسفی ئەوانەی کردووە کە لە باکووری ئەفریقاوە دێنە بەغدا و چەند کارێ دژی فەرەنسی و داگیرکاریی فەرەنسی ئەنجام دەدەن کە "ئەم کارانە جۆرە وورووژاندنێکی هەندێ لە پیاوانی ئایینیی سەر بەرێبازی قادرین."[1]

---

١ إحسان ثريا، وثائق فرنسية عن نشاط الطرق الصوفية التي لعبت دورا في سياسة السلطان عبدالحميد الاسلامية في شمال أفريقيا، ص٢٨٧ و نفس المرجع ص٢٨٦ و وثيقة عن فعاليات

لیژنەی ناوەندی کۆمەڵگای ئیسلامی لە ئەستەنبۆڵ لقێکی ئەفریقیی هەبوو زۆر بەنهێنییەوە لە باکووری ئەفریقا کاری دەکرد، کارەکەی ڕێکخستنی کاری نێوان کۆمەڵە ئایینیەکانی ئەوێبوو بۆ بەرگریکردنی داگیرکاری فەڕەنسی، کۆمەڵەکانیش ئەمانە بوون: شازلی و قادری و مەدەنی.[1]

❊ ❊ ❊

دەسەڵات و شکۆمەندی ئەم بزوتنەوەیە گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە کارگێڕیی هەواڵگریی فەڕەنسی لە باکووری ئەفریقا بەمجۆرە وەسفی بکات: "سوڵتان عبدالحمید بەپێی ئەوەی کە سەرۆکی کۆمەڵگای ئیسلامیە- دەتوانێ بەهۆی پەیوەندییە بەتینەکانی بە کۆمەڵە ئاینیەکانی باکووری ئەفریقا سوپایەکی خۆجێیی ڕێکوپێك کۆ بکاتەوە و ئەگەر کار پێویستی کرد- بەرامبەر هەر هێزێکی بێگانە بوەستێت.".[2]

❊ ❊ ❊

وا پێدەچێ دەسەڵاتەکانی فەڕەنسی نەیتوانیبێ ئەو هۆیانە بزانێ، کەوای لە موسڵمانەکانی باکووری ئەفریقا کردووە کە سەر بە پایتەختی خەلیفایەتی (ئەستەنبۆڵ) بن، ئەوەی توانیویانە، هەوڵیان داوە کە شکۆمەندیی سوڵتان عبدالحمید لە دەروونی موسڵمانەکانی باکووری ئەفریقا کز بکەن، هەوڵدانی ئەو دەسەڵاتانە لە سیاسەتی کۆمەڵگای ئیسلامییان داوە، ئەمەش بە پەیڕەویکردنی سیاسەتی فەڕەنسی کە لەسەر ئەم خاڵانە وەستاوە:

**١-لە خشتە بردنی هەندێ شێخی ڕێبازە سۆفیگەریەکان بە سامان و دەسەڵات، بۆ ئەوەی لەگەڵ فەڕەنسا و سیاسەتی فەڕەنسی بوەستن لە باکووری ئەفریقا.**

**٢-قەدەغەکردنی حاجیەکان لە چوونە حەج تاکو نەگەنە بانگخوازانی کۆمەڵگای ئیسلامی، ئەمەش بە چەند شێوازێکی شیاو، واتا: ڕانەگەیاندنی قەدەغەکردنی حەج و**

---

السلطان عبدالحميد المرجع السابق، ص١٧٩، و دور الطرق الصوفية، مجلة الاسلام بأنقرة، ص٤٠-٤٣.

١ سەرچاوەی پێشوو.

٢ سەرچاوەی پێشوو.

بەهۆی چەند هۆکارێکی تەندروستی خەڵکی بترسێنرێن، وەکو بڵاوکردنەوەی هەواڵی هەبوونی نەخۆشیی ڕشانەوە (کۆلێرا).[1]

* * *

سوڵتان عبدالحمید کاروانێکی لە سۆفی و زاهیدەکان نارده هیند، بۆ پووچەڵ کردنەوەی هەوڵدانەکانی ئینگلیز لەبارەی ستاندنەوەی خەلیفایەتی لە عوسمانیەکان و دانی بە عەرەبەکان، هەروەها ئەم کاروانە پەیوەندیی بە هەندێ لە دەسەڵاتدارانی دوورگەی عەرەبی کرد، بەتایبەتی حیجاز.[2]

* * *

هەروەها چەند پەیوەندییەك هەیە لە نێوان سوڵتان عبدالحمید بەپێی ئەوەی سەرۆکی کۆمەڵگای ئیسلامییە و خەلیفەی موسڵمانانە و سوڵتانی دەوڵەتی عوسمانییە لەگەڵ ڕێبازە سۆفیگەریەکان و شێخەکانیان لە تورکستان و خوارووی ئەفریقا و چین. هەندێ لەو پەیوەندییانە ئاشکرا کراون و زۆربەیان بە بەڵگەنامەی تەواوەوە پەردەیان لەسەر لانەدراوە.

## ج-بەعەرەبکردنی دەوڵەتی عوسمانی:

سوڵتان عبدالحمید-هەر لەو کاتەی کە دەسەڵاتی گرتە دەست- پێی وابوو کە پێویستە زمانی عەرەبی ببێتە زمانی ڕەسمیی دەوڵەتی عوسمانی. لەو بارەیەوە دەڵێ: "زمانی عەرەبی زمانێکی جوانە، بریا لەمەو بەرەوە بمان کردایەتە زمانی ڕەسمی دەوڵەت، بۆ (خیرالدین پاشا)ی-تونسی-م پێشنیار کرد-هەر کە سەرۆکی وەزیران بوو- کە زمانی عەرەبی ببێتە زمانی ڕەسمی، بەڵام سەعید پاشای گەورە ئەمینداری کۆشك ڕەخنەی لە پێشنیازەکەم گرت و گوتی: "ئەگەر زمانی دەوڵەتمان کردە عەرەبی، دوای ئەمە ڕەگەزی تورکی هیچی بۆ نامێنێتەوە، سەعید پاشا مرۆڤێکی بۆش بوو، قسەکانی بۆشبوون، ئەم کێشەیە چ پەیوەندییەکی بە ڕەگەزی تورکییەوە هەیە؟! بەتەواوی کێشەکە ئەمە نیە، ئەمە کێشەیەکە و ئەویتریش کێشەیەکی ترە. ئەگەر

---

١ سەرچاوەی پێشوو.

٢ المذكرات، ص٧٢.

زمانی عەرەبیمان کردە زمـــانی رەسمیـی دەوڵـەت هـەر هیـچ نـەبێ بـەلای کـەمی-پەیوەندیمان بە عەرەبەوە زیاد دەکات.".[1]

※ ※ ※

لەراستیدا سولتان عبدالحمید بەتایبـەتی لەسـەرەتاکانی دەسـەلاتی- گلـەیـی لـە وەزیر و ئەمیندارەکانی کۆشکی سولتانی هەبوو، کە بیرکردنەوەیان لەگەڵ ئەودا جیاوازە و ئەوان بە رۆژئاوا و هزری رۆژئاوا کاریگەرن و کۆمەڵە گوشارێ دەخەنە سـەر کۆشـك، جا چ لەسەردەمی سولتان عبدالمجیدی باوکی بێ، یـا لەسـەردەمی سـولتان عبدالعزیـزی مامی بێ، یان لەسەردەمی خۆی بێ.

※ ※ ※

نارەزایی لە پێشنیازەکەی سولتان عبدالحمید کە زمانی دەوڵـەتی عوسمـانی بکرێتـە عەرەبی تەنیا لەو وەزیرانەوە نەبوو، کە بە رۆژئاوا کاریگەر بوون، بەڵکو هەندێ زانایانی ئایینیش نارەزاییان دەربڕی.[2]

※ ※ ※

## د-بلاوکردنەوەی زانستە ئیسلامیەکان و دامەزراندنی چەند سەنتەرێك بۆ لێکۆڵینەوە ئیسلامیەکان:

لەبەر ئەوەی سولتان عبدالحمید حەزی لە زانیاری بوو، بۆیە گرنگیی بە بزووتنــەوەی فـێرکردن دا و پلـەی قوتابخانـەی (الملکیـة) بـۆ قوتابخانەیـەکی بـالا بـەرزکردەوە، تـــا فەرمانبەری وشیار ئامادە بکات بۆ کارگێری ولات.

لەبەر گرنگیدانی بە دادوەری قوتابخانەیەکی بۆ مافپـەروەران کـردەوە و لـە کیســەی

---

١ ضیا قارال، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٠٣، لە یاداشتەکانی دکتۆر عاتف حسێن دکتۆری سولتان وەرگیراوە، لە سولتان خۆی وەرگیراوە لە گفتوگۆیەکی تایبەتی دکتۆر، بروانە دەفتەری ژمارە (١١) لەو یاداشتانە لە کتێبخانەی کۆری مێژوویی تورکی لە ئەنقەرە.

٢ شهاب الدین تکین چاغ، -مامۆستام بەرەحمەتی خوا بێ- لەو باسەی کە پێشکەشی کۆنگرەی چوارەمی نێو نەتەوەیی لێکۆڵینەوە تورکیەکان- هۆبەی مێژوو، بەناونیشانی (رووخانی دەوڵەتی عوسمانی) کۆنگرەکە لە سێپتێمبەری ١٩٨٢ لە ئەستەنبۆڵ بەسترا.

تايبەتى خۆى هەندێ پارەى تەرخان كرد بۆ دامەزراندنى قوتابخانەيەكى بازرگانى.

بەڵام هەواڵگرى عوسمانى راپۆرتێكى پێشكەشى سوڵتان كرد، كە قوتابخانەى (الملكية) بووەتە گۆرەپانى تەوژمى نەتەوەيى‌ى توركى و كادير و بانگخوازى نەتەوەيى ئامادە دەكات.

ئەمە سەرنجى سوڵتانى راكێشا، بەتايبەتى كە دژايەتى لەگەڵ سياسەتە ئيسلاميەكەى دەكا كە دژى نەتەوايەتيە، بۆيە مامۆستا نەتەوەييەكانى بۆ چەند شوێنێكى تر گواستەوە و قوتابيەكان خۆپيشاندانێكيان دژى سوڵتان ئەنجام دا.[1]

سوڵتان هەستى كرد كە قوتابخانەكان و ياساى فێركردن بەبيرى رۆژئاوايى كاريگەرن و تەوژمى نەتەوەيى لەو قوتابخانانە بالاّ دەستە، بۆيە دەستى لە كاورباريان وەردا و بەپێى بۆچوونى سياسى خۆى- بەرەو لێكۆڵينەوە ئيسلاميەكان ئاراستەى كردن و ئەم فەرمانانەى دەركرد:

-دوورخستنەوەى بابەتى ئەدەب و مێژووى گشتى لە پرۆگرامى خوێندن.

-دانانى وانەكانى فيقهو تەفسير و ئاكار لە پرۆگرامى خوێندن.[2]

-تەنيا مێژوويى ئيسلامى بە عوسمانيەوە دەخوێنرا.

سوڵتان قوتابخانەكانى دەوڵەتى خستە ژێر چاودێريى خۆيەوە و بەرەو خزمەتى كۆمەڵگاى ئيسلامى و سياسەتى خۆى و سياسەتى دەوڵەتى عوسمانى ئاراستەى كردن.

يەكێ لە كردارە فێركرنەكانى بۆ خزمەتى سياسەتە ئيسلاميەكەى:

سوڵتان لە ئەستەنبۆڵ بەپێى ئەوەى كە بنكەى خەليفايەتييە و سەنتەرى دەسەڵاتە (قوتابخانەى هۆزە عەرەبيەكانى) كردەوە بۆ فێركردن و ئامادەكردنى منداڵى هۆزە عەرەبيەكان لە ويلايەتەكانى: حەلەب و سوريا و بەغدا و بەسرە و مووسڵ و دياربەكر و تەرابلسى رۆژئاوا و يەمەن و حيجاز و سنجقەكانى: بەنغازى و قودس و ديرول و زوور.

قوتابخانەى هۆزە عەرەبيەكان لە ئەستەنبۆڵ بۆ (٥٠) قوتابى دامەزرا و بەتير و پشك هەڵدەبژێردران، دوايى ئەو ژمارەيە زۆرتر بوو گەيشتە (٢٥٠) قوتابى، دەرچووەكانى ئەم

١ عثمان آركين، تأريخ التربية التركية، صفحات:٦١٤-٦١٥و ٨٤٠و ١١٨٠-١١٨٢ على التوالي.

٢ عثمان آركين، تأريخ التربية التركية، صفحات:٦١٤-٦١٥و ٨٤٠و ١١٨٠-١١٨٢ على التوالي.

قوتابخانەیە دەچوونە قوتابخانە سەربازییە بەرزەكان و دوای ئەمە پلەی باڵایان وەردەگرت، هەروەها دەیانتوانی بچنە قوتابخانەی (الملكیة) و شارستانی بوو- ساڵێكیان لێ دەخوێند و پلەی (قائم قام)یان وەردەگرت و دەگەڕانەوە وڵاتی خۆیان.

ماوەی خوێندن لە قوتابخانەی هۆزە عەرەبیەكان لە ئەستەنبۆڵ پێنج ساڵە و بەشی ناوەخۆی هەیە و دەوڵەت خەرجیی قوتابیەكان دەدات و هەموو قوتابیەك (مۆڵەتی سەردانی خزمانی) هەیە و هەر دوو ساڵ جارێك لەسەر حسێبی دەوڵەت سەفەر دەكات.

بەرنامەی قوتابخانەی هۆزە عەرەبیەكان لە ئەستەنبۆڵ بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

ساڵی یەكەم: قورئانی پیرۆز- ئەبجەدیە- زانستە ئاینیەكان- خوێندنەوەی توركی- نووسەوەری(املاء)- مەشقی سەربازی.

ساڵی دووەم: قورئانی پیرۆز- تەجوید- زانستە ئاینیەكان- نووسەوەری- ژمێرە- خوێندنەوەی توركی- خۆشنووسی- مەشقی سەربازی.

ساڵی سێیەم: قورئانی پیرۆز- تەجوید- زانستە ئاینیەكان- چیرۆكی پێغەمبەران- خوێندنەوە و مۆرفۆلۆجی(صرف) توركی- نووسەوەری- خۆشنووسی- ژمێرە- جوگرافیا- فەرەنسی، مەشق.

ساڵی چوارەم: قورئانی پیرۆز- تەجوید- زانستە ئاینیەكان- مۆرفۆلۆجی عەرەبی- زمانی فارسی- نووسین و ڕێزمانی توركی- جوگرافیا- ژمێرە- خۆشنووسی- زانیارییە هەمەجۆرەكان- وێنە- زمانی فەرەنسی- خۆشنووسی فەرەنسی- مەشق.

ساڵی پێنجەم: قورئانی پیرۆز- تەجوید- زانستە ئاینیەكان- ڕێزمانی عەرەبی- زمانی فارسی- مێژووی عوسمانی- ڕێزمانی عوسمانی- نووسین و خوێندنەوەی توركی- گفتوگۆی توركی- جوگرافیا- ژمێرە- ئەندازە- خۆشنووسی- زانیارییە هەمە جۆرەكان- پاراستنی تەندروستی- بنەماكانی گرتنی دەفتەر- زمانی فەرەنسی- خۆشنووسی فەرەنسی- وێنە- مەشق.[1]

* * *

هەروەها سوڵتان عبدالحمید "پەیمانگەی مەشقكردنی ئامۆژگار و رابەرەكان"ی

١ سەرچاوەی پێشوو.

دەمەزرێنە بۆ ئامادەکردنی بانگخوازی کۆمەڵگای ئیسلامی، لەو پەیمانگەیە دەردەچن و هەر چوار پەڕی جیهانی ئیسلامی بڵاو دەبنەوە و بانگەوازی ئیسلام و خەلیفایەتی و کۆمەڵگای ئیسلامی دەکەن.(١)

❊ ❊ ❊

بێگومان هەموو قوتابیانی خوێندنی ئایینی لە قوتابخانە و پەیمانگەکان بە پێویستی بانگخوازی ئیسلام و کۆمەڵگای ئیسلامی بوون.

یەکێ لە چالاکیەکانی سوڵتان عبدالحمید و گرنگیدانی بە زانستە ئیسلامیەکان، ئەم چالاکیەی بوو لە چین:

ڕۆژنامەکانی ئەستەنبوڵ هەواڵێکیان بڵاوکردەوە کە ژمارەی موسڵمانانی (چین) نزیکەی (٧٠) ملیۆنە و ئەو موسڵمانانە زۆر وشیارن و زانستیان خۆش دەوێ و ئارەزوویان لە سوود وەرگرتن لە زانیاریە ئیسلامیەکان هەیە و قوتابخانە و دامەزراوی فێرکردنیان هەیە و تەنیا لە شاری پەکین (٣٨) مزگەفت هەیە و موسڵمانەکان نوێژیان لێ دەکەن و دوعا بۆ خەلیفەی موسڵمانان سوڵتان عبدالحمید دەکەن و دووانی (خطبة) هەینی لە مزگەفتەکانی پەکین بە زمانی عەرەبیە و دوایی بۆ زمانی چینی وەردەگێڕدرێ، دوعا کردن بۆ سوڵتان عبدالحمید خەلیفەی موسڵمانان هەر لە شاری پەکین ئەنجام نادرێ، بەڵکو هەموو مزگەفتەکانی چین دەگرێتەوە.(٢)

❊ ❊ ❊

لە شاری پەکین پایتەختی چین- زانکۆیەك دامەزرا و موسڵمانەکانی چین ناویان لێنا "خانەی زانستەکانی حەمیدی" نیسبەتە بۆ سوڵتان و خەلیفە عبدالحمیدی دووەم، یان بەپێی ڕاپۆرتی باڵیۆزی فەرەنسی لە ئەستەنبوڵ بۆ وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسا لە پاریس ناوی لێنا بوو "زانکۆی حەمیدییە لە پەکین".

بۆ کردنەوەی ئەم زانکۆیە هەزارەها لە موسڵمانەکانی چین و موفتی موسڵمانەکان لە پەکین و گەلێ لە زانا موسڵمانەکانی ئەوێ و ژمارەیەکی زۆر لە فەرمانبەر و

١ مصطفى طوران، الانقلاب العثماني، القاهرة، ص٣٧.

٢ جريدة "ترجمان حقيقت" مقال "رسالة من پكين" في ١٣٢٥/١٢/٢٦هـ.

لێپرسراوانی وەزارەتی زانیاریی چینی ئامادە بوون. هەروەها وەزیری زانیاریی چینی بڕیاری ئامادەبوونی دا، بەڵام هەڵكردنی رەشەبا و كڕێوەیەك[1] نەیهێشت ئامادەبێ، چونكە زانكۆی حەمیدی دوو كاتژمێر لەماڵی ئەوەوە دوور بوو.

لە ڕێ و رەسمی كردنەوەیدا، بە زمانی عەرەبی دووانێك درا و دووواندەرەكە دوعای بۆ سوڵتان عبدالحمید كرد و موفتی پەكین دووان و دوعایەكەی وەرگێڕایە سەر زمانی چینی، "زۆربەی موسڵمانە ئامادەبووەكان لە خۆشییاندا زۆر بەگەرمی گریان." و "موسڵمانەكانی چین لەناو خۆیاندا زۆر پابەندن بە ئایینەوە و خوێندنەوەی دووانەكە بە زمانی عەرەبی- زمانی ئایینی موسڵمانەكان و هەڵكردنی پەرچەمی دەوڵەتی عوسمانی لەسەر دەرگای ئەم زانكۆیە زۆر كاری كردە سەر ئەو خەڵكە دڵ پاكانە و فرمێسكی لەچاو هێنان.".[2]

## ه-خزمەتكردنی هەردوو حەرەمی پیرۆز:

سوڵتان عبدالحمید زۆر گرنگیی بە بنیاتنانی مزگەفت و چاككردنەوەی كۆنە مزگەفتەكان دا، هەروەها زۆر هەوڵی دا كە بازاڕی بازرگانی بنیات بنێ و چاكیان بكاتەوە، ئەمەو جگە لە بنیاتنانی ئاوی ڕێگاكان و قوتابخانە و دروستكردنی مزگەفت لە جیهاندا.

سوڵتان ئەگەر بە بەرگوێی بكەوتبایە كە لە شارێ لە شارەكانی دەوڵەتی عوسمانی- یا گوندێ یا ناحیەیێ- مزگەفتی تێدا نییە كە نوێژی هەینیی لێ بكرێ، یەكسەر فەرمانی بنیاتنانی مزگەفتی لێ دەكرد، گەلێ مزگەفتی گرنگی لە شارە عەرەبییەكان بنیات ناو كۆنەكانی چاككردەوە و هانی خەڵكی دەدا بۆ حەجكردن.[3]

---

١ كڕێوە: بەفرێكە بەدەم باوە بباریێ.

٢ إحسان ثريا، جامعة السلطان عبدالحميد في پكين، التعليق ص١٦١-١٦٢.

٣ سعيد سفر الغامدي، موقف المعارضة في المشرق العربي من حكم السلطان عبدالحميد الثاني، الشام و مصر ١٢٩٣-١٣٢٧ه ١٨٧٦-١٩٠٩م، رسالة دكتوراه باشراف الدكتور محمد محمود السروجي مجازة من جامعة الامام محمد بن سعود الاسلامية بالرياض عام ١٤٠٦-١٩٨٥م و ستذكر فيما بعد باسم الغامدي.

مصطفى واعظ، الروض الازهر، ص٢٨٠-٢٨١، الموصل ١٩٤٨ نقلا عن الغامدي، ص٨٤.

لەگەڵ ئەو گرنگیدانەی بە مزگەفتەکان لە ناوەوە و دەرەوی دەوڵەت، گرنگیەکی زۆری بە مزگەفتی حەرام دا لە مەککەی پیرۆز، بەپێی راپۆرتی قایمقامی ئەرکانی جەنگ بەڕێز (محمد صادق) سوڵتان داوای لێکرد، کە مزگەفتی مەککەی پیرۆز چاك بکاتەوە، لە راپۆرتەکەدا دەڵێ: زۆر پێویستە چاکسازی لەو مزگەفتە بکرێ لەبەر ئەم هۆیانە: بە زەحمەت تابلۆیە خەتەکانی ناو حەرەم دەخوێنرێنەوە کە دە (١٠) تابلۆن: لەسەر ساختمانی زەمزەم و لەسەر دەرگای سەلامی کۆن. لەبەر ئەوەی شێوەی دیوارەکانی حەرەمی مەککی تێکچووە بەهۆی کەوتنی سواقی دیوارەکانی و شکانی ئەو بەردانەی کە لەسەر خاکی تەواف کردن و لەسەر ناوچەی خوار گومبەتەکان راخراوە و دەرپەڕیون و لەوانەیە کۆسپ بخاتە بەر جوولانەوەی حاجیەکان. حەرەمی مەککە پێویستی بە بنیاتنانەوەی هەندێ ساختمان(مبنی) هەیە لە دەوروبەری کەعبە و لەچوارچێوەی حەرەمەکە.

راپۆرتی ئەفسەری ئەندازیار بەڕێز (محمد صادق) هەندێ پێویستی تری دیاریکردووە: لەوانەش هەڵکەندنی چەند بیرێکی گەورە بۆ ئەوەی ئاوی زەمزەمیان تێ بکاتەوە، دیاریکردنی شوێنی نوێژکردنی ژنان بەتۆڕێکی ئاسنین و جگە لە پێویستیەکانی تر.

سەرۆك ئەندازیارانی عوسمانی (محمد صادق) پێویستیەکانی حەرەمی مەککەی بە دوو هەزار و هەشت سەت و چل و هەشت لیرەی عوسمانی خەملاند.[1]

* * *

(حسین باسلامە) دەڵێ: سوڵتان عبدالحمید لە ساڵی ١٢٩٩ك عەمرەی لە کەعبەی شکۆدار دێناوە و ناو کەعبەی بە مەڕمەڕ ڕاخست.

* * *

لە ساڵی ١٢٩٧ك فەرمانێ لە سوڵتان عبدالحمیدەوە دەرچوو بۆ نوێکردنەوەی

١ محمد حرب، خريطة لمنطقة الحرم المكي و تقرير هندسي عنها، مجلة الدارة، الرياض، العدد الثالث، السنة الثالثة عشرة ربيع الاخير ١٤٠٨- نوفمبر ١٩٨٧م، ص٤٣-٥٤، و حسين باسلامة، تأريخ الكعبة المعظمة، ص٢٢٣، جدة ١٣٥١. وقد نقل حسين باسلامة عن الفتوحات الاسلامية للسيد أحمد دحلان.

دەرگاکانی سەربانی کەعبە و نوێکردنەوەی مەڕمەڕی تەواف کردن و چێکردنەوەی بەردەکانی حەوشی کەعبە، لەهەمان ساڵدا دوو کلیلی کەعبە نوێکرانەوە کە لە زیو دروستکرابوون لە ئەستەنبۆڵ و نوێکردنەوەی کلیلە زیوینەکە و لەگەڵ پەردە و قفڵی شوێنی ئیبراهیمی خەلیل سەلامی خوای لێبێ. پەردە کۆنەکە لەگەڵ فەرمانبەرێکی تایبەتی نێردرایە ئەستەنبۆڵ. فەرمانبەرەکەش (شێخ محمد الامین المکی) بوو. لە هەمان ساڵ شوێنی ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێ چاککرایەوە لەگەڵ سەکۆی سەرووی دەرگای ئیبراهیم، هەروەها سواق[1] و نەخش و زەخرەفەی هەردووکیان نوێکرانەوە.

سولتان عبدالحمید نۆ (٩) مۆمدانی گەورەی لەزیو دروستکراو و کۆمەڵێ بوخووردانی پێشکەشکرد، کە هەموو ئێوارەیەك لەبەردەم سەکۆی کەعبەی پیرۆز دابگیرسێنرێن. زۆر بەجوانی خاکی حەرەمی پیرۆز چاککرایەوە و سواق درایەوە، هەروەها شەش کۆڵەگە لە لای قوتابخانەی (داودی) بە مەڕمەڕ چاککرایەوە و هەندێ گومبەتی بەردەم شوێنی چوونە ژوورەوەی دەرگای (عەلی) نوێکرانەوە و هەموو شۆستەکانی ژێر گومبەتەکان چاککرانەوە.

لە ١٢٩٩ك بەپێی فەرمانێکی سولتان عبدالحمید چواردەوری حەرەمی مەککەیی پیرۆز فراوان کرا.

لە ساڵی ١٣٠١ك نیشانەکانی (سەفا و مەروە) نوێکرانەوە، کۆمەڵە قومەکانی دۆڵی ئیبراهیم لابران، هەروەها ئەو قومانەی باران هێنابوویە بەردەم دەرگاکانی حەرەمی پیرۆز لابران.

هەروەها سوڵتان فەرمانی دا کە رۆندان و نەخشەکانی شوێنی ئیبراهیم و چالاوی زەمزەم نوێ بکرێنەوە. فەرمانی دا کە هەندێ مۆمدانی زیوین و چەند فانۆسێك بەبڕی (٢٥١٤٤) قرۆشی عوسمانی بۆ مەککەی پیرۆز بنێردرێت. هەروەها هەندێ قورئان و کتێبی ئایینیی بۆ بنێردرێت.

سوڵتان فەرمانی نوێکردنەوە و دامەزراندنی ئاوەڕۆی کانیی (زبێدە) و ڕێگاکانی دا، ئەمە کانیەکی گرنگە بۆ مەککەی پیرۆز.

---

١ سواق: بۆیەکردن، ڕووکەش کردن.

کارکردن لەم پرۆژەیەدا لەرێگەی لیژنەیەکی ئاوەدانکردنەوە بوو بە سەرۆکایەتیی (عثمان نوری پاشا) و ئەندامێتی میر (آلای صادق بگ) و هیدی. ئەم لیژنەیە کارەکانی لە دۆڵی نوعمانەوە-هەشت کاتژمێر لە مەککەی پیرۆزەوە دوور بوو- دەست پێکرد، ئەوە ئاوەڕۆی ئاوی کانیی زبێدەیە و چوار ساڵ کارکردن بەردەوام بوو بە شەو و ڕۆژەوە زیاتر لە سێ هەزار کرێکار شەو و ڕۆژ کاریان تێدا دەکرد، بەمجۆرە کانیەکان بە توانا و هیمەتێکی زۆرەوە چاککردەوە و نوێکردەوە و سەرچاوەیەکی ئاوی شیرینیان بۆ حاجیەکان مەیسەر کرد.

لیژنەی کانیی ئاوی (زبێدە) هەژدە عەمبار ئاو و کانیەکی ئاویان لە هەموو ناوچەکانی مەککەی پیرۆز دامەزراند، چەند کانیە ئاوێکی فرە کونی لەهەر چوار لای حەرەمی پیرۆز دامەزراند بۆ ئەوەی حاجیەکان دەستنوێژی لێ هەڵگرن. هەروەها بۆڕیی ئاویان بۆ ئەم دامەزراوانە ڕاکێشا: نەخۆشخانەی ئاوارەکان، چێشتخانەی (خاسەکی)ی خۆراییی سوڵتان، دایەرەی میری، ئۆردووگای تۆپی سوڵتانی، برووسکە خانە، نانەواخانەی سەربازی، سەنتەرەکانی ئیشکگری سەربازی، گەرماوەکان، پێشتر کوندەی ئاو لەکاتی حەجکردن بە ڕیاڵێ دەفرۆشرا، یەکسەر نرخەکەی دابەزی و تەنیا بووە بیست بارە.

لیژنەیەکی ماڵی بۆ ئەم دامەزراوانە ڕێکخرا بەسەرۆکایەتی فتوا دەری حەنەفی مەککەی پیرۆز و سەرۆکی زانایەکان شێخ (عبدالرحمن سراج)، هەموو ئەمەش لە ساڵی (١٣٠١)ی کۆچی بوو.



دوای کۆتایی هاتنی پرۆژەی کانیی زبێدە و پاشکۆکانی، فەرمانێکی سوڵتانی دەرچوو بۆ کارکردن لە پرۆژەی ئاوی کانیی وەزیریە بۆ خزمەتکردنی دانیشتوانی (جدە). دانیشتوانی (جدە) لەو سەردەمەدا (ساڵی ١٣٠٣ك) سی هەزار (٣٠,٠٠٠) کەس بوو.

لە پرۆژەی ئاوی وەزیریە (٣٥٠٠) کرێکار کاری دەکرد، ئاوی وەزیریە لەلای یەمانییە و دوو کاتژمێر و نیو لە جدەوە دوورە. کارکردن لەم پرۆژەیەدا سێ ساڵ و نیوی خایاند تا ئاو گەیەنرایە جدە. بەمجۆرە خەڵکی جدە و دەیەها هەزار لە حاجیی

موسڵمانەکان لە زیانی ئاوی بۆگەنی چاڵەکان رزگار بوون و چەندەها عەمباری ئەو و کانیی ئاویان لە جدە دامەزراند، هەروەها بۆ هەریەکێ لەم شوێنانە (ئۆردووگای سوڵتانی، دایەرەی میری، نەخۆشخانەی سەربازی) بۆڕیی ئاویان گەیاندێ. لەوانەی کە زۆر لەم پرۆژەیەدا ماندوو بوون-لەتەك کارمەندە هونەرییە سەربازییە عوسمانییەکان-سەرۆکی شارەوانی جدە (أحمد قمصانی) و نووسەری لیژنەی دامەزراوەکان (علي المصري) و هەروەها بەڕێز (محمد طاهر الداغستانی).

❊ ❊ ❊

لە هەمان ساڵ (١٣٠٣ك) چاڵاوەکانی ئاوی عەرەفات پاك کرانەوە و چاککرانەوە، پرۆژەی هێنانی ئاو لە ئاوی کانیی (زبێدە)وە بۆ (مینا) جێبەجێکرا، کە لە دۆڵی (المفجر)ەوە پەڕاندیانەوە. هەروەها دوو عەمباری گەورەی ئاویان لە ساڵی (١٣٠٣) دامەزراند و هەر لە مینا دەرمانخانەیەك و نەخۆشخانەیەکیان دامەزراند کە جێی (٤٠) نەخۆشی لێ دەبوویەوە (١٣٠٣ك). لەبەر ئەوەی ئەو ڕێگایانەی کە دەگەیشتنە چیای (سەور) زۆر ڕك و نارێك بوون و حاجی و گەشتیاران زۆر ئازاریان دەچێشت، ئەو ڕێگایانە چاککرانەوە و ڕاست کران لە (١٣٠٦ك).

بەپێی فەرمانێکی سوڵتانی چاپخانەی (ویلایەت) لە مەککەی پیرۆز دامەزرا بۆ چاپکردنی کتێبە ئایینیەکان بە زمانی عەرەبی و تورکی و فارسی و هیندی و جاوی. هەروەها کتێبی ئیسلامیی چاپ دەکرد و بەسەر وڵاتانی ئیسلامیدا دابەشی دەکرد.

❊ ❊ ❊

هەروەها خانەی پۆستە و برووسکە لەدوو قات دامەزرا و لەپێش ساختمانی میری بوو، لە مەککەی پیرۆز و چەند هێڵێکی تەلگرافی چەسپاو لە جدە بۆ مەککەی پیرۆز و تائیف دامەزرا. بڕیی (٥٦,٠٠٠) قرۆشی عوسمانی بۆ هێڵی تەلگرافی نێوان (مەعان) و مەککەی پیرۆز خەرجکرا.

❊ ❊ ❊

مینبەری مزگەفتی مەککەی پیرۆز بە دەستی چەند کرێکارێکی کارساز، کە لە ئەستەنبۆڵەوە هاتبوون زۆر بە نایابی چاك کرایەوە و، دوو ئاڵای قامیشدار دروستکرا بۆ

ئەوەی هەموو هەینیەك لەسەر مینبەری کەعبەی شکۆدار هەڵکرێ، ئەمانەش لە ئەستەنبۆڵ دروستکران بۆ ئەوەی پێشکەشی ئەو شوێنە بکرێ (١٣٠١ك).

* * *

بەپێی فەرمانێکی سوڵتانی دوو شوێنی خۆ پاککردنەوە لە نەخۆشخانەی ئاوارەکانی موسڵمانان لە مەککەی پیرۆز بنیات نرا.[1]

* * *

بەڵام خزمەتەکانی سوڵتان عبدالحمید بۆ مەدینەی موونەوەرە بریتی بوون لەمانە:

سوڵتان عبدالحمید فەرمانی دا کە بڕی (٧٥٣٨٠) قرۆشی عوسمانی خەرج بکرێ بۆ کۆڵەگە چەسپاوەکانی سەر بنکەی گومبەتی گۆڕی پێغەمبەر ﷺ و ئەو پەردەی کە لە نێوانیانە. هەروەها فەرمانی دا کە ساختمانەکانی خزمەتچیەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەوانەی پێویستیان بە چاککردنەوەیە چاك بکرێنەوە و ڕەساس و ڕۆندان و نەخش و زەخرەفەی گومبەتی پێغەمبەر و ناو مزگەفتی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ نوێ بکرێنەوە و کۆمەڵە فانوسێك پێشکەشی (روضة)ی پاك بکرێت و ڕۆندان و زەخرەفەی گومبەتی (روضة) و دەرگاکانی حوجرەی پێغەمبەری نوێ بکرێنەوە، هەروەها فەرمانیدا کە کۆمەڵێ فانۆس و مۆمدانی زیوین بەبڕیی (٦٣٢٢٥) قرۆشی عوسمانی دروشم و چرا دروست بکرێن و بنێردرێنە گەڕەکە بەرزەکانی مەدینەی مونەووەرە.

دووبارە مزگەفتی (قبه الرؤوس) لە مەدینە و مزگەفتی شەهیدەکانی بەدر چاك بکرێنەوە، مزگەفتی (مونیف) چاك بکرێتەوە و لە ئەستەنبۆڵەوە پەردەی بۆ ڕەوانە کرا و چاککردنەوەی مزگەفتی (دە) موژدە دراوەکان بە بەهەشت(العشرة المبشرة) لە مەدینەی مونەووەرە.

هەروەها مافووری زۆر بەنرخ کە لە کارگەی سوڵتانی دروستکرا بوون هەناردرانە مزگەفتی پیرۆزی پێغەمبەر.

* * *

---

١ محمد الامين المكي، خدمات خلفاء آل عثمان للحرمين الشريفين، ص١١-١٣ أستانبول ١٣١٨ه.

سوڵتان کۆمەڵە کتێبێکی ئیسلامیی هەنارده مەدینەی مونەووەرە.

* * *

دادگای شەرعیی لە مەدینــەی مونــەووەرە چــاککردەوە و قوتابخانــەی (روشــدیە) و دواناوەندی و بنکەیەکی پۆلیسی دامەزراند و کەوانەیــەکی لــە عەنبەریــە دروســتکرد بەناوی خەلیفەی موسڵمانان.

* * *

بڕیی (٢٦٤٠٢٢) قرۆشی عوسمانی بۆ خەڵکی هەردوو حــەرەمی پــیرۆز خــەرجکرد، بەخشیشی خەڵکی هەردوو حەرەمی پیرۆز (٢٦٤٠٢٢) قرۆشــی عوســمانی بــوو ســاڵانە لەگەڵ دیاریی سوڵتانی، خەرجکردنی بڕیی (٢٦٤٠٠٠) قرۆشی عوسمانی بۆ ئەوانەی لــە نەهاتی زیانیان لێکەوتووە لــە ســاڵی ١٣٠٧ك لــە خــەڵکی هــەردوو حــەرەمی پــیرۆز. خەرجکردنی (١٠٠٠) لیرەی عوسمانی لــە گیرفــانی تایبــەتی ســوڵتان بــۆ ئــەو حاجیــە هەژارانەی کە لــە زەریــای هیندییــەوە دێــن. خــەرجکردنی بڕیــی (٢٦٤٠٢٢) قرۆشــی عوسمانی بۆ جاری سێیەم بۆ خەڵکی هەردوو حەرەمی پیرۆز و عارەبە دەشتەکیەکان کــە تووشی نــەهاتی بوونــە. خــەرجکردنی بڕیــی (١٠٠٠) لــیرەی عوســمانی بــۆ یارمــەتیی حیجاز.[١]

## و-گرنگیدانی بە هۆیەکانی گواستنەوە:

سەردەمی سوڵتان عبدالحمید بەسەردەمی کۆمەڵگای ئیسلامی وەسف دەکرێ، بەڵام هەنــدێ لــە مێژوونوســانی تــورك وایــان لا خۆشــە ئەمەشــی بخەنــە پــاڵ "ســەردەمی دامەزراندنی هێڵی ئاسنین و بەکارخستنی".

باروزروفی ماڵیی دەوڵەتی عوســمانی خــراپ بــوو، بۆیــە دەوڵــەت ناچــار بــوو، کــە پرۆژەکانی هێڵی ئاسنین بداتە کۆمپانیا بێگانەکان.

هەر چەندە دەوڵەتی عوسمانی هەندێ پرۆژەی خۆجێیی بۆ دامەزراندنی هێڵی ئاسنین جێبەجێکردبوو، بەڵام درێژکردنەوە و بەکارخستنی دایە کۆمپانیا بێگانــەکان جگــە لــە

١ محمد الامين المكي، المرجع السابق، ص٦-١١.

هێڵی ئاسنینی حیجاز.

سیاسەتی دامەزراندنی هێڵی ئاسنین لە بوارەکانی ستراتیژی و سەربازی و بازرگانی و کشتوکاڵی پێویست بوو. لەبەر ئەوە سوڵتان قایل نەدەبوو کە هێڵی ئاسنین لە ناوچە سنووریەکان دابمەزرێ نەخۆ دەوڵەتێکی بێگانە بۆ دوژمنکاری دژی دەوڵەتی عوسمانی بەکاری بێنێ. دەسەڵاتی سەربازیی عوسمانی راسپاردەی دەکرد کە لە نزیک کەنارەکان هێڵی ئاسنین دانەمەزرێ، نەوەکو کەشتیەکانی بێگانە تێکی بدەن.

لە ڕووی ڕامیاریەوە سوڵتان عبدالحمید تەنیا متمانەیەکی کەسی لەسەر ئەڵمانیا هەبوو کە هێڵی ئاسنینی بۆ دابمەزرێنێ، لەترسی ڕێککەوتنی نێوان ئینگلتەرا و ڕوسیا دژی دەوڵەتی عوسمانی لە کێشەی ڕۆژهەڵات، بەتایبەتی ئینگلتەرا-دوای داگیرکردنی میسر- لە نیوە دوورگەی عەرەبی نزیك ببویەوە و مەترسیی ڕوسی لە ئەنادۆڵ نزیك بوو، سوڵتان عبدالحمید بۆ دوورخستنەوەی ئەم کارەساتەی کە لەگینە[1] ڕوویدات، ناچار بوو ڕەزامەندی بکات لەسەر هێڵی ئاسنین کە بە ئەنادۆڵدا تێدەپەڕێ و دەگاتە بەسرە و ئەڵمان سوودی لێ دەبینێ و ئەم هێڵە دەبێتە بەربەستێك دژی مەترسیی ئینگلیزی و ڕوسیی چاوەروان کراو.[2]

## -هێڵی ئاسنینی حیجاز:

گرنگترین پرۆژەکانی هێڵی ئاسنینی سوڵتان عبدالحمید هێڵی ئاسنینی حیجاز بوو، سوڵتان لە بارەی ئەم پرۆژەیەوە دەڵێ: "دامەزراندنی هێڵی ئاسنینی حیجاز خەونی دێرینم بوو.".

هێڵی ئاسنینی حیجاز لە ساڵی ١٩٠١ دەستپێکرد بۆ ئەوەی حیجاز بە ئەستەنبوڵەوە ببەستێتەوە بۆ سوودی حاجیەکان و پەیوەندی بەستنی موسڵمانان بە خەلیفەوە لە شوێنە جیاوازەکانەوە و (١٥٠٠) کیلۆمەتر درێژییەکەی بێت و لەساڵی ١٩٠٨ بگاتە مەدینەی مونەوەرەوە و دیمەشق بە مەدینە ببەستێتەوە و (حوران) بە (دەرعا) و دەریای سپی ببەستێتەوە لە ڕێگەی حەیفاوە. ئەم لقە خزمەتێکی زۆری

١ لەگینە: ڕەنگە.

٢ قارال، المرجع السابق، ص٤٦٩.

حاجیە میسرییەکانی کرد کە بە کەشتی لە ئەسکەندەرییەوە دەهاتنە حەیفا و لەوێوە بە هێڵی ئاسنین بۆ حیجاز.

بۆ ئەم پرۆژەیە لە دەوڵەتی عوسمانی و لە هەموو لایەکی جیهانی ئیسلامی بێشە(تبرعات)ی بۆ کۆکرایەوە و هەندێ باجی خۆجێیی و پوولی پۆستەی عوسمانی بۆ دەرکرا.

ئەم پرۆژەیە سوودێکی زۆری هەبوو بۆ گەلێ لە ئەندازیارە عوسمانیەکان و کرێکارە کارسازەکان و کرێکارە ئاساییەکان کە پسپۆڕیی لێ وەرگرن.[1]

یەکێ لە قازانجەکانی هێڵی ئاسنینی حیجاز دەوڵەتی عوسمانی چیدی پێویستی بەکەناڵی سوێس نەبوو کە بەریتانیا دەستی بەسەرا گرتبوو، هەروەها دامەزراندنی ئەم هێڵە ئەنجامێکی واتاییی هەبوو، چونکە دەوڵەتی عوسمانی خۆی دایمەزراندبوو، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە "ئێمە میللەتێکین توانای پێشکەوتنمان هەیە".[2]



پرۆژەی هێڵی ئاسنینی حیجاز لە سەرەتادا برەوی نەبوو، سەعید پاشای سەرۆك وەزیران گازاندەی لێی هەبوو، هەندێ گلە و گازاندە لەسەر خەڵکی تایبەتی و گشتی دەهات و دەچوو، لەوانە "عەرەبەکانی بیابانی حیجاز و هەندێ دانیشتوانی مەککەی پیرۆز و مەدینەی مونەوەرە لە دامەزراندنی دەستی یارمەتییان نیە و بەڵکو ناقایلیشن، چونکە هەندێ کەسی دووڕوو وایان خستۆتە دڵیان، کە ئەم هێڵە زیان بە بازرگانییان دەگەیەنێ و ژیانیان تێکدەدا، چونکە ژیانیان لەسەر گواستنەوەی حاجی و گەشتیار و بازرگانەکانە بە هۆی وڵاغەکانیان، ئەم هێڵە وڵاغەکانیان لەکار دەخات و قازانجیان نامێنێ و دەستیان کورت دەبێ و گیانیان دەردەچێت."[3]

زانایانی ئایینی و ڕۆشنبیرە موسڵمانەکان دژی ئەم قسە و قسەڵۆك و بانگاشانە وەستان و لە بارەی سوودی هێڵی ئاسنین ئامۆژگاریی خەڵکیان کرد و کتێب و

١ حكمت بايور، تأريخ الانقلاب التركي، ج١،ص١٤٤.

٢ قارال، المرجع السابق، ص٤.

٣ محمد عارف، السعادة النامية الابدية في السكة الحجازية الحديدية، ص٢٨٦.

ـ میکەیان دانا و بانگەشەکانیان پووچەڵ کردەوە و گوتیان "بزانە کە دامەزراندنی ئەم هێڵە ئاسنینە پەیوەندیکردنی باوەڕداران بە یەکترەوە ئاسان دەکات." و نموونەی ئەم هێڵە وەکو هێنانی چەك و تۆپ و باڕووت و فیشەك و ئەسپ و شتی تر و هیچ جیاوازییەکیان نییە و بەڵکو دامەزراندنی هێڵی ئاسنین شایانترە پێش بخرێت.".[1]

بەڕێز (محمد عارف الدمشقي) ئیمامی شافیعییەکان لە شام سوودی هێڵی ئاسنینی بۆ موسڵمانان بەگشتی ڕوون کردۆتەوە و بۆ خەڵکی هەردوو حەرەم بەتایبەتی، ئەمەش بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو گوتانەی، کە گوایا ئەم هێڵە کار لە حیجاز پەك دەخات و گوتی:

"سودی یەکەم: زۆرکردنی حاجی و گەشتیار و بازرگانەکان، ڕاکێشانی ئەم هێڵە ئاسنینە لە شام بۆ مەککە چەندەها قات ژمارەی حاجیەکان زۆر دەکا، ئەگەر ژمارەی حاجیەکانی ئێستا لە شام هەزار بێت، ئەوا بێگومان دوای بوونی ئەم هێڵە ژمارەیان دەگاتە بیست هەزار.

سوودی دووەم: "دەوڵەتی عوسمانی لە کاتی پێویست دەتوانێ هەموو یارمەتی و کەل و پەلێك بۆ ئەو شوێنانە بنێرێ هەر کاتێ بیەوێ. لە نزیکترین کات دەیگاتێ و تووشی دەستدرێژیی عەرەبە دڕوندەکان نابێ و ئەو وڵات و خەڵك و حاجیانە دەکەونە ئاسایشێکی تەواوەوە. ".

سوودی سێیەم: ...خاکی حیجاز لە مەدینەی مونەووەرە تا مەککەی پیرۆز هەمووی بۆ چاندنی دانەوێڵە و پاقلەمەنی و گندۆرە و تەرۆزی و ئاروو و هیدی دەشێت. هەروەها بۆ ڕواندنی هەموو جۆرە دارێکی بەرداری وەکو: مێو و خورما و هەنار و هەنجیر و گوێز و مۆز و بەهێ و لیمۆ و ترنج و هەموو جۆرەکانی دەشێت، بەرهەمی ئەمانە تەنیا لە دۆڵی (فاتیمە) و دۆڵی (لیمون)ەوە بۆ شاری مەککە دێت و ئەوانیتر لە شوێنی خۆیان تێکدەچن بە هۆی درێژیی ماوەی گواستنەوە. بەڵام خورما و هاوڕەگەزەکانی کە بە هۆی گواستنەوە تێك ناچن، لە ناوچە نزیکەکانەوە وەردەگیرێ نەك لە دوورەکان. لەگەڵ ئەمەش نرخەکانیان کەمە و بایی خەرجییەکانیان ناکات، بۆیە تەنیا ئەوەندە دەڕوێنن

١ محمد عارف، المرجع السابق صفحة ٢٠٩ و صفحات ٢٨٧-٢٩٠ و ٢١٦ و ٢١٤ و ١٩١-١٩٢ على التوالي.

كە بەشی خۆیان بكات. ئەو ئاوەی هەیانە ئێستا بە چاكی سوودی لیٚ وەرناگرن، جا ئەگەر هێڵی ئاسنین بەناو خاكیان یان بەناو خاكی دراوسێیان دا چوو و، ئەوا گواستنەوە ئاسان دەبیٚ و بەرهەمەكان تێك ناچن و كرێی گواستنەوە كەمتر دەبیٚ لەكرێی گواستنەوە بە حوشتر، بەمجۆرە قازانج دەكەن و چاندن و رواندن و بازرگانییان زیاتر دەبێت، هەروەها لە نزیك شاری مەدینەی مونەووەرەش.

سوودی چوارەم: كۆچەرانی حیجاز ئێستا پیشەسازییان نییە، هەروەها لە مەككە و مەدینەش، بۆیە هەموو جل و بەرگە چنراوەكانیان لە بازرگانەكانی شام وەردەگرن كە بەلایاندا ڕەت دەبن..

هەروەها كەل و پەل و پێویستی ناو ماڵ و رایەخەكانیان بەنرخێكی زۆر گران لەوان و لە بازرگانەكانی هەردوو حەرەم كە لە خوا ناترسێن دەكڕن، ئەوانە خراپترین شت دێنن و بەنرخی شتی چاك دەیفرۆشن.. كۆچەران بەرهەمەكانیان بەنرخێكی زۆر هەرزان دەفرۆشن، وەكو: پێستەی مەڕ و مانگا و حوشتر و خوری و هەندیٚ بەرهەمی تر، كە سوودیان لیٚ نابینیٚ وەكو: شیر و داری سووتان و مووی بزن، ئەگەر هێڵی ئاسنین لەو ناوچانە دابمەزریٚ ئەوا دەمەزراندنی نووسینگەی پیشەسازی و كشتوكاڵی ئاسان دەبیٚ بۆ ئەم ولاّتە بەتایبەتی و ئینجا گشتگیر دەبیٚ. ئەگەر فێربوون و زانییان چۆن هەلس و كەوت لەگەڵ بەرهەمەكانیان دەكەن و چۆن سوودی لیٚ دەبینن و بۆ پێویستی خۆیان بەكاری دێنن، وەكو: پێستە خۆشكردن و چنینی پەمۆ و خوری و موو و دارتاشی و ئاسنگەری و دروستكردنی رۆن و پەنیر، ئەوا دەكەونە بەختەوەری و دەوڵەمەند دەبن و چیتر لە ولاّتانەوە كەل و پەل ناهێنن و هێرش ناكەنە سەر یەكتری و سەر ئەوانە كە بەخاكیانا ڕەت دەبن.

سوودی پێنجەم: بەهۆی هێڵی ئاسنینەوە گەڕان بەدوای كانزای بیابان و دەشتە چۆڵەكان كە هێشتا هیچیان لیٚ دەرنەهێنراوە ئاسان دەبیٚ، ئەگەر ئەم هێڵە دامەزرا گەڕان لەو ناوچانەدا ئاسانە و دەتوانریٚ زەوی هەڵ بكەنریٚ و قوم هەڵ بدرێتەوە و بەرد دەربهێنریٚ و هەر خەڵووز و كانزایەكی كە تێیدا شاردراوەیە سوودی لیٚ وەربگیریٚ، بەمجۆرە ئەو ولاّتە دەكەوێتە رۆڵی گەشەسەندنەوە و رۆژی هەڵدیٚ و مانگی دەگەشێتەوە و دەكەوێتە ناوجەرگەی دەوڵەمەندی و ژیانێكی هێدی و خۆشگوزەرانییەكی بالاّوە.

سوودی شەشەم: دامەزراندنی شارستانی و ژیار لـەناویان و بڵاوبوونـەوەی زانسـت و زانیاری لە نێوانیان و ئەمینبوون لە سەر و ماڵ و منداڵیان.

سوودی حەفتەم: دەوڵەتی عوسمانیی شکۆدار ئەوەی لێی بووەشـێتەوە لـە کاروبـاری هێڵە ئاسنینەکە بەکاری دێنێ و کرێشیان دەداتێ.

سوودی هەشتەم: ئەوانە شت (خواردن و خواردنـەوە) دەفرۆشـنە ئـەو کەسـانەی کـە بەهۆی هێڵی ئاسنینەوە بەلایان دا ڕەت دەبن، خۆ ئەگەر ئەم هێڵە نەبوایـە ئـەم شـتانە نەدەفرۆشران، وەکو: نان و گۆشت و هێلکە و ئاوی سارد و... ئەمەش قازانجێکی زۆری تێدایە.

سوودی نۆیەم: بەهۆی هێڵـی ئاسـنینەوە مـەڕ و ماڵاتیـان زۆر دەبێـت و کشـتوکاڵ پێشدەکەوێ و بڵاو دەبێتەوە، ئەگەر کشتوکاڵ زیادی کرد پاوان و ئالفی بەرزە زۆر دەبێ و پەرەدەسێنێ. دانیشتوانی هەردوو حەرەم زۆر پێویستیان بە زێـدەبوونی مـاڵات هەیـە لەوانە: مەڕ و مانگا بۆ شیر و ڕۆن و گۆشـت و... ئـەم سـوودانە و جگـە لـە قـازانجی بەکرێدانی حوشتر لە مەککەوە بۆ عەرەفات کە بۆ گیرفانی کۆچەرەکان دەگەڕێتەوە. "

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو نارەزاییەی کە دەڵـێ: هێڵـی ئاسـنینی حیجـاز دەبێتـە هـۆی پەکخستنی بەرزەکانی عەرەبی بیابانی حیجازی و هەندێ دنیشتوانی مەککە و مەدینە. شێخ (محمد عارف الدمشقی) دەڵێت:

"ئەو حوشترانەی کە کۆچەرەکانی حیجـاز بـەکرێیان دەدایـە گەشـتیار و بازرگـان و حاجیەکان لە یەنبوعەوە بۆ مەدینەی مونەووەرە، چەندەها جار ژمارەیـان زۆرتـر دەبـێ دوای ڕاکێشانی هێڵی ئاسنین، چونکە خەڵکی ئەو لایانە کە بە یەنبوعدا ڕەت دەبـن بـۆ جدە، یان بۆ یەنبوع دەردەچن و بەکرێ لەگەڵ کاروانەکان دەچنە مەدینـە و لەگـەڵ ئـەو سوارانە کە لە مەککە دەردەچن بۆ مەدینە، یـا لەگـەڵ کـاروانی شـامی و لـەوێوە بـۆ یەنبوع و بۆ جدە و لەوێوە بۆ مەککە، ئینجا لەگـەڵ ئـەو کاروانانـەی کـە لـە مەککـە دەرچن بۆ مەدینە، یاخود لەگەڵ کاروانی شامی و لەوێوە بۆ یەنبوع و بـۆ وڵاتـەکانیان. ئەم گەشتیارانە یەك جار پێشی حەج یان پاشی حەج سەردان دەکەن بـەپێی توانینیـان و لەبەر ترسی ڕێگا و ناخۆشیەکەی دوو سەردان ناکەن لەگەڵ کاروانەکان.

بەڵام دوای بەرپابوونی هێڵی ئاسنین، حەسانەوە و ئاسایشی ڕێگا بەرپا دەبێ و هەموویان دێنە یەنبوع و لەوێوە بۆ مەدینە و ئینجا سواری هێڵەكە دەبن بۆ مەككە و لەسەر ئەو هێڵە دەگەڕێنەوە مەدینەو لەوێوە بۆ یەنبوع و وڵاتەكەیان.

كۆچەرانی حیجازی خاوەن كاروانەكان لە یەنبوع بۆ مەدینە دوو هێندەی جاران قازانج دەكەن، ئەمە جگە لە ئاسایشی ڕێگە و حەسانەوەی هێڵە ئاسنینەكە لە یەنبوعدا.

* * *

هەروەها كۆچەرەكانی شام سوود لە هێڵی ئاسنینی حیجاز- پڕۆژەی سەرەكیی سوڵتان عبدالحمید- وەردەگرن، پێشەوای شافیعیەكان لە دیمەشق ڕوونی كردۆتەوە كە دامەزراندنی ئەم هێڵە دەكەوێتە خانەی هێز پەیداكردنی موسڵمانان بەرامبەر دوژمن و دەبێتە هۆی ئاوەدانكردنەوەی هەردوو حەرەمەكە و جۆرە بەخشینێكە لە ڕێگەی خوا، هەروەها یارمەتیدانێكی موسڵمانانە بۆ جێبەجێكردنی ئەركی حەج و عەمرە و سەردانی پێغەمبەر ﷺ و بازرگانی و پیشەسازی و كشتوكاڵ و شارستانیكردنی كۆچەرە دڕندەكان و دەوڵەمەندكردنی هەژاران و تێركردنی برسیەكان و سامانی وڵات و ئاسانكردنی پەیوەندیكردنی باوەڕداران بە یەكتری.

شێخ (محمد عارف الدمشقی) لە بارەی (پێویستی گوێڕایەڵیكردنی میر، لەسەر هەموو باوەڕدارێكە دەستی یارمەتیی هەبێ بۆ دامەزراندنی ئەم هێڵە و دژی نەوەستێ و خۆی لێ دوور نەخاتەوە) شیعرێكی هۆنیوەتەوە:

**طاعة السلطان حق واجب جاءنا القرآن فيها والحديث**

**گوێڕایەڵیكردنی سوڵتان هەق و ئەركە     قورئان و حەدیس بۆمانیان هێناوە**

* * *

لە ساڵی ١٩٠١ كار لە پڕۆژەی هێڵی ئاسنینی حیجاز دەستی پێكرد، سوڵتان (عزت پاشا)ی كردە سەرۆكی لیژنەی پڕۆژەكە، ئەمەش بانگێكی بێشەی (تبرع) ئاڕاستەی جیهانی ئیسلامی كرد بۆ تەواوكردنی تێچوونی پڕۆژەكە، سوڵتان عبدالحمید سەرەتا پەنجا هەزار زێڕی عوسمانییی لە گیرفانی خۆی دانا و بڕیاری دا كە سەد هەزار زێڕی

عوسمانی لە سندووقی قازانجەکان بدات و بە ملیۆنێ کاغەز چاپکران و "کۆمەڵە خێرخوازیەکان دامەزران و موسڵمانەکان لە هەموو لایەکەوە پێشبڕکێی دامەزراندنیان دەکرد بە سەر و ماڵ".[1]

* * *

کەسێتیە گرنگەکانی دەوڵەت بێشەیان بۆ ئەم پرۆژەیە کرد، لەوانەش سەرۆك وەزیری جەنگ (حسن پاشا) وەزیری بازرگانی و کاروبارەکان (ذهنیی پاشا)، سەرۆکی لیژنەی پرۆژەکە (عزت پاشا).

هەروەها فەرمانبەری کۆمپانیاکان بۆ ئەم بێشەیە دەرکەوتن، وەکو: فەرمانبەرانی کۆمپانیای کەشتیەکانی عوسمانی. فەرمانبەرە گشتیەکانی دەوڵەتیش لەم ڕووەوە دەستێکیان هەبوو. ویلایەتەکانیش وەکو: ویلایەتی بێروت و دیمەشق و حەلەب و بۆرسە و هیدیکە.

کۆشکی فەرمانڕەوا لە میسر بەشداریی کرد و لە میسر لیژنەیێ بەسەرۆکایەتیی (أحمد پاشا المنشاوی) پێکهێنرا بۆ بانگەشەی ئەم پرۆژەیە و کۆکردنەوەی بێشە بۆی، هەروەها ڕۆژنامەگەریی میسری بەشداریی هەڵمەتی هێڵی ئاسنینی حیجازی کرد، بۆ نموونە ڕۆژنامەی (المؤید). ڕۆژنامەی (اللواء)ی میسری بێشەی بۆ پرۆژەکە کۆ کردەوە و تا لە ساڵی ١٩٠٤ گەیشتە سێ هەزار لیرەی عوسمانی ئەمەش بە سەرۆکایەتی (مصطفی کامل پاشا)، هەروەها (علی کامل) بڕی (٢٠٠٠) لیرەی عوسمانیی بۆ پرۆژەکە کۆ کردەوە تا ساڵی ١٩٠١ع.

* * *

پرۆژەکە جێبەجێکرا و لە سێپتێمبەری ١٩٠٨ گەیشتە مەدینەی مونەووەرە کە دوا قۆناغی بوو. لەبارەی بەردەوامبوونی هێڵەکە بۆ مەککەی پیرۆز (شریف حسین) نارەزاییی خۆی لەسەر پرۆژەکە دەربڕی لە ترسی دەسەلات و پلە و پایەی خۆی.

* * *

١ محمد عارف، المرجع السابق، ص٢٠٩ و صفحات ٢٨٧-٢٩٠ و ٢١٦ و ٢١٤ و ١٩١-١٩٢ علی التوالي.

خاوەنی بیرۆکەی پرۆژەکە (عزت پاشا العابد) بوو-کە لە دواییدا بووە سەرۆکی لیژنەی پرۆژەکە- هەر چەندە (محمد کرد علی) دەڵێ: کە بیرۆکەی دامەزراندنی ئەم هێڵە لە ساڵی ١٨٨٠ دەستی پێکرد هەر کە وەزیری کاروباری عوسمانی بیرۆکەی ئەم پرۆژەیەی پێشکەشی میری کرد و لەبەر بێ پارەیی لەکاتی خۆی جێبەجێ نەکرا.[١]

ڕۆژنامەی (المنار) و (الرائد المصری) بەشداریی ئەم هەڵمەتەیان کرد و چەند لیژنەیەکی بێشە بۆ پرۆژەکە لە قاهیرە و ئەسکەندەریە و شارەکانی دیی میسر پێکهات.

موسڵمانەکانی هیند لە هەموو موسڵمانەکانی جیهان زیاتر بە حەماس و سۆز و بێشەوە بۆ پرۆژەکە چوون، میری حەیدەر ئاباد لە هیند ئێستگەی مەدینەی مونەووەرەی پرۆژەکەی دامەزراند، هەروەها شای ئێران بریی (٥٠,٠٠٠) لیرەی عوسمانیی کردە بێشە.

هەر چەندە پرۆژەکە پێویستی بە هەندێ کارمەندی هونەریی بێگانە هەبوو بۆ دروستکردنی پرد و تونێڵەکان، بەڵام لە باری زۆر پێویست نەبوایە بەکار نەدەهێنران، بۆ زانین بە هیچ شێوەیەك بێگانەکان لە پرۆژەکەدا بەشدارییان نەکرد سەرەتا لە ئێستگەی (الاخضر)ەوە-لە دووریی ٧٦٠کم لە خوارووی دیمەشق- تا کۆتایی پرۆژەکە، چونکە لیژنەی پرۆژەکە بەکاری نەهێنان و کارمەندە میسرییەکانی لەجێی ئەوان بەکارهێنا.

ژمارەی کرێکارە نا پسپۆرەکان لە ساڵی ١٩٠٧ گەیشتە (٧٥٠٠) کرێکار.

سەرجەم تێچوونی پرۆژەکە گەیشتە (٤,٢٨٣,٠٠٠) لیرەی عوسمانی.

پرۆژەکە لە کات و تێچوونێکی کەمتر تەواو دەبوو ئەگەر کۆمپانیا بێگانەکان لە خاکی دەوڵەتی عوسمانی کاریان بکردایە.



دەوڵەتی عوسمانی وەڵامی ڕۆژنامەی (المنار)ی دایەوە لە ١٩٠٨/١١/٢٣ هەر کە گوتی: "بێگومان ئەگەر بتوانرێ هێڵی ئاسنینی حیجازی بگەیەنرێتە یەمەن ئەوا چاکترین پرۆژەی سوود بەخشە بۆ وڵاتی عەرەب و موسڵمانەکان بە گشتی.. بە تایبەتی

١ محمد کرد علي في خطط الشام، ج٥، ص١٨٨، عن الشوابكة ١٨٦-١٩٩.

نەوى نەوەى دەرياى سوور پڕى دەولّەتى بێگانە بوو و لە پێشتر دەرياچەيەكى عوسمانى بوو -. چونكە لە نێوان بەلّگەنامەكانى عوسمانى، چەند بەلّگەنامەيێ هەيە كە هێلكارى و لێكۆلّينەوەى هێلّى ئاسنينى حيجاز بۆ يەمەنى تێدايە". [1]

## هێلّى ئاسنينى بەغدا:

مەبەست لەم هێلّە گرێدانى ئەستەنبۆلّە بە بەسرەوە، سولّتان عبدالحميد مافى دامەزراندنى هێلّى ئاسنينى (قونيە- بەسرە)ى دايە دكتۆر (سيمينز)ى سەرۆكى ئەنجوومەنى كارگێڕى كۆمپانياى هێلّە ئاسنينەكانى ئەنادۆلّ (سالّى ١٨٩٩)، ئەم كارە لە سالّى ١٩٠٢ دەستى پێكرا و لە ١٩٠٤ كەرتى تايبەتى كە لە (قونيە)وە دەگاتە (ئەركەلى) كرايەوە، بەلاّم ئەو بەشە تايبەتيەى كە لە ئەركەليەوە دەگاتە (بەلغورلى) لە ماوەى كۆتايى فەرمانڕەوايى سولّتان عبدالحميد تەواو كرا و پڕۆژەكە تەواو نەبوو. [2]

* * *

## ز- سياسەتى خۆشويستن و دلّدانەوە:

سولّتان عبدالحميد -لە هەردوو لايەنى واتايى و بانگاشەيى- ويستى پەيڕەوى سياسەتى خۆشويستن بكات، بەتايبەتى دەربڕينى خۆشەويستى بۆ ئەو كەسانەى، كە لەناو كۆمەلاّنى خەلّك دەسەلاّتيان هەيە لە شوێنە جياجياكاندا. لە لايەكەوە ڕێزى خۆى بۆ ئەهلى زانست دەردەبڕى و پايەيانى بەرز دەكردەوە، لەبەر ئەمە ئەنجوومەنى شێخەكانى دانا و مووچەى بۆ ئەندامەكانى بڕيەوە و نيازى چاك بوو لەگەلّ رابەرەكانيان و زاناكان پلەى بەرزيان هەبوو.

لە لايەكى دى خۆشەويستى خۆى بۆ ئەو كەسێتيە ديارانە دەردەبڕى، كە لايەنگرى بيروبۆچوونى بوون، وەكو (مصطفى كامل پاشا) لە ميسر، ئارامى دەگرت لەسەر هەلّەى گەورە پياوان-ئەگەر نيازيان لەگەلّى پاك بوايە و لە بوارى كۆمەلّگاى ئيسلامى پشتيان بگرتايە- وەكو (نامق پاشا).

---

١ سەرچاوەى پێشوو.

٢ قارال، ص٤٦٧.

لەبارەی سیاسەتی دڵدانەوەی دامەزراندنی قوتابخانەی هۆزە عەرەبیەکان لە ئەستەنبۆڵ، لە لایەك ئەو قوتابیانەی بە تیر و پشك هەڵدەبژێردران و لە لایەکی دی لە منداڵی خانەوادەی ڕەسەنی کۆنی خاوەن دەسەڵات و ناو و ناوبانگی چاك، لە ڕۆڵەی سەرۆکەکانی عەرەب هەڵدەبژێردران. لە دواییدا ئەم قوتابخانەیە فراوان بوو لە ڕۆڵەی کورد و ئەلبانیەکانیشی وەردەگرت.

کە سوڵتان عبدالحمید زانیی بەریتانیا پەیوەندی بە هۆزە عەرەبیەکانەوە دەکا و هانیان دەدا کە دژی عوسمانی بوەستن و-هەروەك لە یاداشتی کۆلۆنێل (هربرت تشارم ساید) هاتووە و سەلماندوویەتی، کە بەریتانیا پەیوەندیی بە شەریفی مەککە و شێخ حمیدالدین و شێخ عەسیر و هەندێ شێخی هۆزەکانەوە کردووە- هانیان بدەن بەرێگەی سیخوڕەکانیان کە لە وڵاتی عەرەبی بڵاوبوونەتەوە کە لەژێر گوێڕایەڵی سوڵتان عبدالحمید دەربچن و لە دەوڵەتی عوسمانی جودا ببنەوە.

سوڵتان هەر بەوەندە وازی نەهێنا کە ڕاستەوخۆ پرسیاریان لێ بکات، هەروەك پرسیاری لە شەریفی مەککە کرد کە هۆی پەیوەندیکردنی بە ئینگلیزەوە لە ڕێگەی باڵیۆزەکانیەوە چیبوو، هەر تەنیا لە ئەنجامی کارەکەی ئاگاداری نەکردەوە، بەڵکو چەند نامەیەکی خۆشەویستی بۆ سەرۆك هۆز و میرەکانی دوورگەی عەرەبی و شوێنی دی نارد لەگەڵ چەند نێردراوێکی خۆی بۆ دڵدانەوەیان و چەند پلە و نیشانیشی بۆ هەناردن.[1]

سوڵتان عبدالحمید لەوە نەپەنگایەوە کە ئەوانەی گومانی لێیان هەیە کە دژی خەلیفایەتین لە ئەستەنبۆڵ دەستیان بەسەر دابگرێ و بەناو هەندێ پلە و پایەیان بداتێ بۆ ئەوەی دڵنیابێ لە کودەتایان، هەروەك لەگەڵ شەریفی مەککەی کرد، کە کردیە ئەندامی ئەنجوومەنی ڕاوێژی دەوڵەت لە ئەستەنبۆڵ بۆ ئەوەی لە گەڕانەوەی بۆ مەککە قەدەغەی بکات. سوڵتان عبدالحمید لەکاتی گفتوگۆی لەگەڵ (فرید پاشا)ی سەرۆك وەزیران بیر و بۆچوونی خۆی لەبارەی شەریفی مەککە دەردەبڕی و دەڵێ: "شەریف حوسێن ئێمەی خۆش ناوێ، ئێستا هێور و لەسەرەخۆیە، بەڵام خوا دەزانێ سبەی دەبێ

---

١ الغامدي، ص٨٢-٨٣.

شەریف چی بکات!. ".[1]

* * *

لەبەر ئەمە شۆڕشی عەرەبی بە سەرۆکایەتی شەریف حوسێن دوا کەوت بۆ پاش ئەوەی کە یەکگرتووەکان (الاتحادیون) سوڵتان عبدالحميديان لادا.

هەر کە یەکگرتووەکان فەرمانڕەواییان کرد، شەریف حوسێنیان گەڕاندەوە مەککە و لەوێ دەستی بە شۆڕش کرد و عوسمانی و عەرەبەکان لەیەکدی جودا بوونەوە.

١ جلال الدين ثاشا، عكس الوسام، استانبول ص٨.

# پاری یەکەم

# بەرهەڵستکاری ئایینەکانی تر و ئەو ڕێبازە هزرییانەی کە لە ڕۆژئاواوە هاتوون

## ا/بەرهەڵستکاری جوولەکەکان:

### ١-بەرهەڵستکاریی جوولەکە بەناوی زانست:

### =ڕۆژهەڵاتناسە جوولەکەکان لە ئەورووپا:

بەرهەڵستکاری جوولەکەکان دوو بەش بوو، یەکەم: تیۆری: بریتی بوو لە چالاکی ڕۆژهەڵاتناسە جوولەکەکان لە ئەورووپا. ئەو ڕۆژهەڵاتناسانە بە نووسین و بڵاوکراوەکانیان هەوڵیان دەدا کە بیردۆزیی نەتەوەییی تورکی دابنێن، لەسەرووی هەموو ئەوانەوە کە بیرۆکەی نەتەوەیی تۆرانییان داهێنا (لاملی دافیدز) و (لیون کاهون) و (فامبری) بوون.

ئەوانە بە هزر و لایەنگیریکردن دەستیان هەبوو لە کۆمەڵەی (الاتحاد و الترقی). ئەوەی دواییان (فامبری) ماوەیەك ڕاوێژکاری سوڵتان عبدالحمید بوو، بەڵام لە ڕاستیدا سیخوڕی بەریتانیا بوو و سوڵتان ئەم ڕاستیەی دەزانی، بەڵام هیچ کاتێ دەری نەخست.

دیارترین بیریارە جوولەکەکانی دەرەوە بێ لە ڕۆژهەڵاتناسەکان (أمیل دورکاریم)ی جوولەکەی فەرەنیسی خاوەن ڕێبازی کۆمەڵایەتی بوو، کە دانەری تیۆریی نەتەوەیی بوو، کاریگەریی بەسەر بیری پێشەوای نەتەوەی تورکی و فەیلەسووفەکەی (محمد رضا کوك آلب) هەبوو.

ڕۆژهەڵاتناسە جوولەکەکانی ئەورووپا پەیوەندی هزرییان بە بیریارە نەتەوەییە جوولەکەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی هەبوو، ئەوانەی ناوەوە ژێری بیریاری کۆمەڵەی (الاتحاد و الترقی) بوون. هەروەها جوولەکەکانی ناو عوسمانی کاریگەرییەکی زۆریان بەسەر ئەفسەرە گەنجەکانی ئەندامانی شانەی نهێنی (الاتحاد و الترقی)دا هەبوو.

### =بیریارە جوولەکەکان لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا:

دیارترین جوولەکەی ناوەوە (موئیز کوهین) بوو، لە گۆڤار و ڕۆژنامە تورکیەکان

ـەرتـی تورکیی دەنووسی و ئەندامێکی بنچینەیی کۆمەڵەی (الاتحـاد و الترقـی) بـوو، یەکێ لەکارەکانی ناساندنی کۆمەڵەی (الاتحاد و الترقی) و بانگەشە بۆ کردنـی بـوو لـە ڕۆژنامە ئەوروپیەکاندا. ڕۆڵی هەبوو لە داڕشتنی سیاسەتی ڕەگەز پەرستیی تـۆرانی کـە لە دواییدا میریی (الاتحاد و الترقی) لەسەری ڕۆیشت دوای لادانـی سـوڵتان عبدالحمیـد. کاریگەریی (موئیز کوهین) زۆر ترسناك بـوو بەتایبـەتی لـە سـوپای عوسمـانی، بـەپێی سیاسەتی ڕەگەز پەرستیی تۆرانی، دەبێ دەوڵەتێکی تورکیی تۆرانی دابمەزرێ و هـەموو تورکەکانی جیهان لە دەوڵەتێکدا کۆ بکاتەوە و ئەو وڵاتانەی، کە لەژێر دەستی عوسمانین بکرێنە تورك.

ئەم بیرۆکەیە یەکەم هۆی سەرەکی بێزاربوونی عەرەب بوو لە تورکەکان.

هەروەها لە جوولەکەکانی ناوەوە (أبراهام غالانتی)ی نووسەر و بیریاری هەڵکـەوتوو بوو.

یەکێ لە جوولەکە دیارەکانی ناوەوە (إیمانوئیل قراصو) بوو، کە مامۆستایەکی مەزن بوو لە ماسۆنیدا و لە گەورە لێپرسراوانی (الاتحاد و الترقی) و ئەندامی ئەو شاندە بـوو، کە چاویان بە سوڵتان عبدالحمید کەوت و بڕیاری لادانیان پێڕاگەیاند.[1]

## ٢-بەرهەڵستکاریی بزووتنەوەیی (الحرکیة) جوولەکە:

## -بزووتنەوەی هرتزل:

بەشی دووەمی بەرهەڵستکاریی جوولەکە کردەوەیی و بزووتنەوەیی بوو، بریتـی بـوو لە بزووتنەوەی جوولەکەی سەهیۆنیزمی جیهانی بە سەرۆکایەتیی (تیـۆدۆر هرتـزل) کـە توانی لایەنگیری ئەوروپی بۆ کێشـەی جوولەکـە کـۆ بکاتـەوە: ئـەڵمانیا و بـەریتانیا و فەڕەنسا، ئەم دەوڵەتانەی کردە هێزێکی پاڵنەر لەسەر دەوڵەتی عوسمانی بۆ ئەوەی چاوی بە سوڵتان عبدالحمید بکەوێ و داوای فەڵەستینی لێ بکـات. تـەنیا قەیسـەری ڕوسـی لەبەر هۆی ئایینی قینێکی زۆری لە جوولەکە بوو و بە تەنیا ئەو یارمەتیدانی هرتـزل و داوای جوولەکەی ڕەد کردەوە.

---

١ محمد حرب، العثمانیون في التأریخ و الحضارة، ص٥١.

(هرتزل) هات بۆ ئەوەی چاوی بە سولّتان عبدالحمید بكەویّ و داوای سنجقی قودس بكا بۆ دامەزراندنی نیشتمانێكی جوولەكە.

بەلاّم بنچینەی داوای (هرتزل) دروستكردنی چەند گوندێكی جوولەكە بوو لە فەلّەستین لە شوێنێك، كە دەولّەتی عوسمانی دەستنیشانی بكات و بەلّێنی دا كە ئەو جوولەكانەی لە دەرەوەڕا دێن پەیڕەویی یاساكانی دەولّەتی عوسمانی بكەن.

(هرتزل) لە بەرامبەر ئەمە بەلّێنی دا كە جوولەكە "خزمەت و ئاسانكاریی پێویست پێشكەشی عوسمانی بكەن بۆ ئەوەی كێشە مالّیەكانی نەمێنیّ كە لە وامەكانی دەرەوەی پەیدا بووە. " بە مەرجیّ (هرتزل) بەلّگەنامە و كۆمپیالەی نووسراو پێشكەش بكات.

سولّتان عبدالحمید بینیی كە چەند شتیّ كۆسپن لەپێش ئەم داوایە و هەستی بەمە كرد كە "فەلّەستین بە شوێنە پیرۆزەكانیەوە خاكێك لەبەردەم تەماع و چاوتێبڕینە رامیاریەكان پێكدێنیّ. ".

هەروەك پێشتر ئاماژەی پێكرا، سولّتان دوای ئەمە دوو فەرمانی سولّتانیی دەركرد: یەكەم لە (٢٨)ی یۆنیۆ و دووەم لە (٧)ی یۆلیۆی سالّی ١٨٩٠ع لە بارەی "قەبوولّ نەكردنی سەهیۆنیزمەكان لە ولاّتی عوسمانی و گێڕانەوەیان بۆ ئەو شوێنانەی كە لێیانەوە هاتوون. ". سولّتان عبدالحمید فەرمانی دا چاودێری كاروباری زەوی و زار كە زەوی نەفرۆشرێتە ئەو كۆچەرانەی كە هاتوونەتە فەلّەستین.

هەركە جوولەكەكان-لەسەروویانەوە هرتزل- زانییان كە ناتوانن سولّتان عبدالحمید بۆ لای خۆیان ڕابكێشن و ناتوانن بگەنە ئاواتی خۆیان لە دامەزراندنی نیشتمانێك لەسەر حسێبی موسلّمانەكانی فەلّەستین، جوولەكەی جیهانی پشتی دوژمنەكانی سولّتانیان گرت كە بریتی بوون لە (ئەرمەنە یاخیبووەكان و نەتەوەییەكانی بەلقان و بزووتنەوەی پارتی- الاتحادوالترقی-) هەروەها لەگەلّ هەموو بزووتنەوەیەكی جیاواز خوازی لە دەولّەتی عوسمانی وەستان.[1]

---

١ سەرچاوەی پێشوو، ص٤٣.

### -پیلانی (نوردلنج)ی جوولەکە بۆ کوشتنی سوڵتان عبدالحمید:

ئەمە پیلانی جوولەکەی سوێدییە کە موسڵمان بووە و ناوی لەخۆ ناوە (علی نوری) و هاتۆتە ناو سلکی دەوڵەتی عوسمانییەوە و پسوولەیەکی هەڵگرتووە و ناو و کارەکەی لەسەر نووسراوە "علی نوری بگ بالێوزی یەکەمی عوسمانیی پێشوو" لە تەمەنی هەژدە ساڵی هاتۆتە وڵاتی عوسمانی و وای نیشان داوە کە موسڵمان بووە، چاوی بە هرتزل کەوتووە و تەمەنی ٤١ ساڵ بووە- بیرۆکەکەی خۆی پێ ڕاگەیاندووە و بریتیە لە دوو کەشتیی جەنگ کە لە ٤٠٠,٠٠٠ لیرەی زێڕی عوسمانیی زیاتر تێ ناچێ و هەموو کارەکە لەنیو ملیۆن زێڕی عوسمانیی زیاتر تێ ناچێ، واتا ١٠٠,٠٠٠ لیرە دەمێنێتەوە و هەزار پیاو بەکرێ بگیرێن. هەردوو کەشتیەکە دێنە ناو (بۆسفۆر) و کۆشکی (یەلدز) دەرووخێنن و سولتان عبدالحمید دەستگیر دەکەن یان چاو لە هەڵاتنی دەپۆشرێ و ئەو کاتە سولتانێکی دی لە شوێنی دادەنرێ و میرییەکی کاتی دادەمەزرێ و لە ڕێگەی ئەم میرییەوە جوولەکە فەلەستین وەردەگرن".

(هرتزل و نوردلنج) لەسەر ئەمە تەواو ڕێك نەکەوتن، چونکە هرتزل ترسا لەدوای ئەمە- کە کوشتارێ بۆ جوولەکەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی بەرپا ببێ ئەگەر ئەو پیلانە پووچەڵ بوویەوە.[1]

❊ ❊ ❊

### ب/بەرهەڵستکاریی دیانەکان:

**١-لە میسر:** پارتی نیشتمانی لە میسر بەسەرۆکایەتی (مصطفی کامل پاشا) دەیگوت: تاکە هۆی ڕزگاربوونی میسر لە دەستی ئینگلیز ڕووکردنە دەوڵەتی عوسمانییە و لایەنگیریکردنی سیاسەتی سولتان عبدالحمیدە.

"گەنجە قیبتیەکان هەندێ شتیان بەدەست دەکەوت لە بانگەوازە ئایینیەکەی پارتی

---

١ حکمت طانیو، المرجع السابق، ج١، ص٤٧١، لە یاداشتەکانی هرتزل لە ڕۆژانی ١٩٠٤/٢/٢٤ و ١٩٠٤/٤/١٠ و وتاری شاهێن ئەلب ئای لەم بارەیەوە لە گۆڤاری کۆمەڵگا و مێژوو، ژمارە (٣) ساڵی ١٩٨٤.

نیشتمانی و هەروەها بانگەوازی عوسمانی، لۆجێكی[1] ئەو گەنجانە دەیگوت: ئەگەر ئێوە بانگەوازی كۆمەڵگای ئیسلامی دەكـەن و داوای لایـەنگیریكردنی مافـەكانی عوسـمانی دەكەن، ئێمەش مافی خۆمانە كە متمانە بكەینە سەر داگیركردنی بەریتانی. ".[2]

ڕۆژنامەگەریی قیبتی لە میسر (ڕۆژنامەی نیشـتمان و ڕۆژنامــەی میسـر) زورنـای بەرھەڵستكاری بوون، ڕۆژنامەی نیشتمان گەلێ جار تانەی لە سیاسەتی عوسمانی دەدا و ڕەخنەی لە هەڵوێستەكانی دەوڵەتی عوسمانی دەگرت و ڕۆژنامەی (نیشـتمان)ی قیبتـی لایەنگیریی ئینگلیزی دەكرد و هێرشی دەكردە سەر كۆمەڵگای ئیسلامی.[3]

ڕۆژنامەی میسر لە ساڵی ١٨٩٧ لەكاتی جەنگی عوسـمانی- یۆنـانی دژی دەوڵـەتی عوسمانی وەستا -كە گەرم و گوڕیی میسرییەكانی بینـی بـۆ لایـەنگیریكردنی دەوڵـەتی عوسمانی و خەلیفە سوڵتان عبدالحمید- وای دەرخست "كە دەوڵەتی عوسـمانی پێویسـتی بەم یارمەتییانە نییە و ئەگەر هەر یارمەتیش دەدەن، با بەناوێكی دی بێت جگە لەناوی كۆمەڵگای ئیسلامی. ".[4]

ڕۆژنامە مەسیحیەكانی شام كە خاوەنەكانیان كۆچیان بۆ میسر كردووە دەچـنە پـاڵ بەرھەڵستكاریی مەسیحی لە میسر، یەكێ لەوانـە ڕۆژنامـەی (المقطـم) كـە لایـەنگری سیاسەتی ئینگلیز بوو و بەردەوام تانـەی لـە دەوڵـەتی عوسـمانی و سـەكردەكانی دەدا، هـەروەها بەگـژ سیاسـەتی دەرەوە و نـاوەوەی عوسـمـانی دا دەچـوو بەتایبـەتی بـارە داراییەكانی و لەتەك لایەنە دژكارەكانی دەوڵەتی عوسمانی دەوەستا و زۆر باسی ئەرمەن و شۆڕشەكانیان و بار و زرووفیانی دەكرد لە دەوڵەتی عوسمانیدا.

لە دژایەتیكردنی سوڵتان عبدالحمید، ڕۆژنامەی (المقطم) مـاوەی دابـووە ئەنـدامانی پارتی (الاتحاد و الترقی) كە هەڵاتبوونە میسـر تێیـدا بنووسـن و هێـرش بكەنـە سـەر

١ لۆجیك: ژیریێژی ، منطق

٢ سەلامە مووسا لە یاداشتەكانی لە گۆڤاری نووسەری میسری ب٣، ژمارە (١٠) و ڕۆژنامەی نیشتمانی میسری لە ١٥ یۆنیۆی ١٩٠٨ بە تەرتیب لەشەوابكەوە وەرگیراوە، ل١٧١-١٧٢، ١٧٤، ١٠٤ بەڕیز.

٣ سەرچاوەی پێشوو.

٤ سەرچاوەی پێشوو.

سوتێن و نەسەر لاپەڕەکانی تانەی لێبدەن. ڕۆژنامەی (المقطم) دژی هەموو ئەو یارمەتینە بوو کە میسرییەکان لەکاتی تەنگانەی ماڵی دەیاندایە دەوڵەتی عوسمانی، یاخود یارمەتیی عوسمانییان دەدا لە جەنگکردنی دژی دوژمنەکانی. ڕۆژنامەی (المقطم) داوای لەمیریی میسری کرد، کە بڵاوکراوەیێ لە ڕۆژنامەکان بڵاو بکاتەوە و ڕای بگەیەنێ، کە ئەو یارمەتیانەی میسرییەکان کۆی دەکەنەوە لەپێناو جیهادی دەوڵەتی عوسمانی نییە، بەڵکو لەپێناو یارمەتیدانی دەوڵەتی عوسمانییە.

هەروەها ڕۆژنامەی (الضیاء) کە (إبراهیم الیازجی) لە ساڵی ١٨٩٨ لە قاهیرە دایەزراند، شمشێرێکی هەڵکێشراو بوو لەسەر عوسمانییەکان، ڕۆژنامەی (المشیر) کە (سلیم سرکیس) لە ١٨٩٤ لە ئەسکەندەرییە دەری کرد و لە ساڵی ١٨٩٩ بۆ نیوبۆرك گواسترایەوە، لەسەر عوسمانی و فەرمانڕەوایی عوسمانییەکان و لەسەر کۆمەڵگای ئیسلامی زۆر توند و تیژ بوو. ڕۆژنامەی (المشیر) ڕای وابوو کە پێویستە خەلیفایەتی عوسمانی لەناو ببرێت و سورییەکانی هان دەدا کە دژی عوسمانییەکان شۆڕش بکەن، بەرادەیەکی وا دادگای سزایەکان لە میسر فەرمانێکی دەرکرد کە دەبێ (سلیم سرکیس)ی خاوەنی ئەم ڕۆژنامەیە بدرێتە دەست دەسەڵاتی عوسمانی. ویلایەتی بێروت داوای لە میسر کرد کە ناوبراو بدرێتە ئەو، بەڵام (اللورد کرومر)ی متمانەکەری ئینگلیز لە میسر نەیدایە دەست و پاراستی.

لەو ڕۆژنامە سورییە مەسیحیانەی لە میسر کە دژی فەرمانڕەوایی عوسمانی و کۆمەڵگای ئیسلامی بوو، ڕۆژنامەی (تحریر سوریا) بوو کە لە ساڵی ١٩٠١ لە قاهیرە لە لایەن کۆمەڵەی چاکسازیی سوری دەرچوو، (جۆرج عساف) سەرپەرشتیی دەکرد.

**٢-لە شام:** بەرهەڵستکاریی سوڵتان عبدالحمید لە شام شێوەی کۆمەڵەی ئەدەبی و زانستی بەخۆوە گرتبوو، ئەندامەکانی لە دیانە عەرەبکان و دیانە بێگانەکان بوو، دوایی هەوڵی دا کە "هەندێ ڕەگەزی ئیسلامی بەگەڵ خۆی بدا بۆ سەرپۆشکردنی سروشت و مەبەستەکانی. ".[١]

سەرەڕای ئەو ناوانەی کە ئەو کۆمەڵانە لە خۆیان نابوو، ئەوەرەی چالاکی و

---

١ سەرچاوەی پێشوو.

کارەکەیان بریتی بوو لە دژایەتیکردنی فەرمانڕەوایی عوسمانی و کۆبوونەوەی ئیسلامی و کۆمەڵگای ئیسلامی و کارکردن دژی سوڵتان عبدالحمید و تاوانبارکردنی عوسمانیەکان بەزەوتکردنی خەلیفایەتی بە داوای ئەوەی کە زیاتر مافی عەرەبەکانە.

لە شام چەند نوسەرێکی دیان پەیدابوو کە دژایەتیی فەرمانڕەواییی سوڵتان و سیاسەتەکەیان دەکرد لە کۆمەڵگای ئیسلامی. دیارترینیان (شبلی شمیل)ی ئەرسۆزکسی بوو. باوەڕی بە تیۆری (داروین) هەبوو لە پەرەسەندن و لە وڵاتی عەرەبی برەوی پێدەدا. قینی لە سوڵتان عبدالحمید وایلێکرد، کە بچێتە پاڵ کۆمەڵەی (ترکیا الفتاة)ی ناحەزی سوڵتان.

هەروەها (نجیب العازوری) لەو نووسەرانە بوو، ئەرسۆزکسی بوو، لە خزمەتکردنی دەوڵەتی عوسمانی لە قودس کاری دەکرد، ئەو بوو کە کۆمەڵەی نیشتمانی عەرەبیی لە پاریس پێکهێنا بۆ دژایەتیکردنی فەرمانڕەوایی عوسمانی. لە فەرەنسا گۆڤارێکی مانگانەی بە ناونیشانی (الاستقلال العربی) دەردەکرد بە زمانی فەرەنسی، نەجیب عازووری لەکاتی بانگهێشتی کۆمەڵگای ئیسلامی- داوای لابردنی خەلیفایەتیی دەکرد لە دەست عوسمانییەکان و دانی بە عەرەبەکان. هەروەهاوەکو: شبلی شمیل- داوای بە عەلمانیەتکردنی دەوڵەتی خەلیفایەتیی عەرەبی دەکرد لەکاتی دامەزراندنی، ئەمەش بە دامەزراندنی دوو دەسەڵات یەکێکیان گیانی(روحی) بێ لە حیجاز و ئەویتر کاتی بێ لەهەر شوێنێ.

ڕۆژنامەگەریی سوریی مەسیحی هەمیشە دوژمنی عوسمانی و کۆمەڵگای ئیسلامی بووە، دیارترین ڕەگەزەکانی ئەم ڕۆژنامەگەرییە:

ڕۆژنامەی (الجنان) کە (بطرس البستانی) لە یەنایەری ساڵی ١٨٧٠ دایمەزراند، ڕۆژنامەی (مرآة الاحوال) کە (رزق الله حسون) لە ساڵی ١٨٥٤ لە ئەستەنبۆڵ دایمەزراند و ئینجا لە ساڵی ١٨٧٦ گواستیەوە لەندەن.[1]

١ لویس سابوونچیی حەلەبی ڕۆژنامەیەکی عەرەبیی لە لەندەن دامەزراند و ناوی لێنا (القبلة) و بانگهێشتی گواستنەوەی خەلیفایەتی بۆ عەرەب کرد، ئەوەی لێرەدا شایانی گوتنە کە (کۆنگرەی عەرەبی) نەتەوەییە عەرەبەکان لە پاریس لە ساڵی ١٩١٣ بەستیان و ڕەسافیی شاعیری عیراق لە بارەیەوە دەڵێ: **لوکان فی غیر باریس إجتماعهم ماکنت أحسبهم قوما مناحیسا**

### ٣-لە ناوچەکانی سەر بەدەوڵەت لە ئەوروپا:

ناوچە ئەوروپییەکانی سەر بەعوسمانی بە بزوتنـەوەی جیـاوازخوازی و سـەربەخۆبوون دەکولا، بزوێنەری ئەم بزووتنەوانە ڕێبازی نەتـەوەیی و هانـدانی ڕوسـیا و ئینگلتـەرا و کەنیسە بوو.

ئەوەی لێرە باسی دەکەین ڕۆڵـی کەنیسـەیە لـە بزوتنـەوەی بـەلقانی دژی دەوڵـەتی عوسمانی.

سیاسەتی عوسمانییەکان-دوای فەتحی ئیسلامی بۆ قوستەنتینیە- دەست تێوەرنـەدان لە کاروبـاری خـەڵکی ئایینـەکانی دی بـوو، دەوڵـەت دەسـتی لـە کاروبـاری کەنیسـە وەرنەدەدا و هەموو کەنیسەیەك قوتابخانە و دامەزراوەکانی خۆی هـەبوو. خوێنـدن لـەم قوتابخانانە لە لایەن راهیب و قەشەکانەوە ئەنجام دەدرا و کەنیسە بـووە (دەوڵـەت لـەناو دەوڵەت).

بەڵام بەتریق و پیاوانی ئایینیی ئەرسۆزۆکسی ئەم مافانەیان بـەخراپی بـەکار هێنـا. بەتریرکی وشـیاریی نەتـەوەیـی گـەلی مەسـیحیی ورووژانـد و لـە دەوری کەنیسـەکان کۆبوونـەوە و دڵنیـا بـوون لـە سـەرکردایەتیکردنی بـەتریریکی. ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ ئـەم گرنگیدانە بە هەستی نەتەوەیی لەزیادبووندا بوو. بەتریرکیە بۆ بنەمای زیندووکردنەوەی بیژەنتـەی نـویێ خـۆی بـە پـارێزەر و ئاڕاسـتەکەر دەزانـی و لـە خـەیاڵی دەرکردنـی عوسمانییەکان بوون لە بەلقان و ئەورووپا و ئەنادۆڵ بەرەو بیابانەکانی ئاسیای ناوەڕاسـت هەروەك لەوێوە هاتبوون.

بەتریرکیە تـەنیا ئـاگری زیندووکردنـەوەی بیژەنتـەی لـەناو دەسـت و پێوەنـدەکانی نەکردەوە لە ئەوروپای عوسمانی بەڕێگـەی قوتابخانـە و قەشـەکانی-ئەوانـە مامۆسـتای مەشق پێکەری ئەم کـارەبوون- بـەڵکو زمـانی عوسمـانیی- کـە زمـانی دەوڵەتـە- لـە قوتابخانەکانی نەهێشت و بەرەبەرە خوێندنی یۆنانی لە فراوانی دا بوو.

---

واتا: ئەگەر کۆبوونەوەیان لە پاریس نەبوایەبەچینێکی شوومم حسێب نەدەکردن

جەمال پاشای والیی سوریا و یەکێ لە قوتبەکانی (الاتحاد و الترقي) ژمارەیەکی زۆریان لە سێدارە دان لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهاندا.

بەتریرکیە دەستی یارمەتیی بۆ کۆمەڵەی ئیتریا-ی نهێنی درێژ کرد- کە بۆ جێبەجێکردنی بیرۆکەی زیندووکردنەوەی بیژەنتی دامەزرا- تا (مورە) دژی دەوڵەتی عوسمانیی یاخیبوونی ئەنجام بدات، هەروەها بتریرکیە یارمەتیی یۆنانی دا لە پرۆژە فراوانخوازیەکانی لەسەر حسێبی خاکی عوسمانی، هەروەها بتریرکیە لە ساڵی ١٨٩٨ع پشتی یۆنانی گرت هەر کە لەو ساڵەدا جەنگی ڕاگەیاند و سنووری عوسمانیی بەزاند.

لە لایەکی دی هەر بەتریکیە بوو کە یاخیبوونی (کریت)ی بەڕێوە دەبرد، ئەو یاخیبوونەی کە دەوڵەتی عوسمانیی لەسەردەمی سوڵتان عبدالحمید بێزار کردبوو.

(فنزیلوس) رای خۆی لە بارەی ڕۆڵی بەتریرکی لەهێنانەدیی ئاواتە ئایینی و نەتەوەیی ڕۆمیی یۆنانی لە ناوچەی ئەورووپای عوسمانی لەسەر حسێبی عوسمانییەکان بەجۆرە دەربڕی "شوێنی خوا پەرستی و قوتابخانەکانی سەر بە بەتریرکی بوو بوونە کۆگای چەك. " دژی سوڵتان عبدالحمید و دەوڵەتی عوسمانی. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە "بەتریرکی و دامەزراوەکانی بەدرێژایی مێژوو- ڕۆڵی بنکەی ڕامیاری و سەربازییان بینیبوو. ".

گەرم و گوڕیی بەتریرکیە گەیشتە ئەوەی لە دوایدا- کە سەرکردایەتی دەست و پێوەندەکانی کرد لە هێرشێکی شەوانەی کت و پڕ بۆسەر مزگەوتی (ئەیاسۆفیا) لە ئەستەنبۆڵ بۆ داگیرکردنی، تاکو ببێتە هێمای بیرۆکەی زیندووکردنەوەی بیژەنتی، پیاوەکانی ئاڵایەکی یۆنانی و ناقووسێکی کەنیسەیان هەڵگرتبوو.[1]

* * *

## ج-بەرهەڵستکاریی خاوەن ڕێبازە هزرییە هاتووەکانی ئەورووپی:

هزری ئەورووپی کاریگەریەکی زۆری هەبوو لە وەرگەڕانی بار و زرووفی دەوڵەتی عوسمانی. ڕێبازی: نەتەوەیی و مرۆڤایەتی و عیلمانی و دیموکراتی ئەورووپی یەکێ بوو لەو کۆمەڵە هۆیانەی، کە بووە ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی: ئەم ڕێبازانە بۆ ئەوە هاتن کە کۆمەڵێ دەست و پێوەند لە گەنجی عوسمانی بۆ لای خۆیان کێش بکەن و لەرێگەی

---

١ م. ثريا شاهين، البطريركية الارثوذكسية اليونانية و تركيا، ص٢٤٠، أستانبول، ١٩٨٠.

وەرگێڕان و هەناردنەوە- بچنە ژێر ئاڵاکەیەوە و ئینجا دژایەتیی ڕژێمی دەوڵەتی عوسمانی بکەن کە لە باوەشی دەژین.

لە پێشەکی ئەم ڕێبازانەش: نەتەوەییە.

## ١-نەتەوەییەکان:

نەتەوەیی لەنێوان گەنجی عوسمانی ڕوون و ئاشکرا بوو و بە ئیسلامەوە پەیوەستدار بوو و بە وشەی (میللیەت) دەردەبڕا.

بەڵام نەتەوەیی لە جیهانی عەرەبی بە مەسیحیەتەوە پەیوەستدار بوو، واتا: مەسیحیەکانی شام ئاڵای نەتەوەییان بە بیرۆکە عەلمانیەکەی هەڵگرتبوو، لەڕێگەی کۆمەڵە و ڕۆژنامەکانیان ئەمەیان بڵاو دەکردەوە.

نەتەوەیی لە ناوچەی ئەورووپای عوسمانی لە ڕەگەوە بە کەنیسەوە بەند بوو و نەدەتوانرا جیاوازی بکرێ لەنێوان مەسیحیەت و میللیەت.

نەتەوەیی لە شام بە بزووتنەوەی بەدیانکردنی جیهانی و بەفێرکردنی بێگانەوە بەند بوو بەتایبەتی لەو قوتابخانانەی کە (جزویت و کاسۆلیك و پرۆتستانت) و هیدی دایان مەزراند. بیرۆکەی ئاینیان لەو قوتابخانانە بڵاو کردبوویەوە لەگەڵ هاندانی جیابوونەوە لە دەوڵەتی عوسمانی. پرۆتستانیەکان لە ساڵی ١٨٦٢ کۆلێژێکیان لە بێرووت دامەزراند و (دانیال بلس)یان کردە سەرۆکی و دوایی پەرەی سەند و بووە (کۆلێژی سووریی ئینجیلی) و ئێستا بووەتە (زانکۆی ئەمریکی) لە بێروت.

نەتەوەیی لە شام بە بەدیانکردنەوە پابەند بوو هەروەك لە هەوڵدانێ ڕوویدا بەناوی (شارستانی کردنی کۆچەران لە بیابانی شام) بە مەبەستی کێشکردنی منداڵەکانیان بۆ مەسیحیەت، ئەمەش وای لە سوڵتان عبدالحمید کرد کە قوتابخانەی بەدیانکەرەکان لە ساڵی ١٣٠٦ك- ١٨٨٨ع داخات.

ئەم بەدیانکەرانە ئاژاوەیان لە دەوڵەتی عوسمانی دەنایەوە و سیخوڕیی ڕامیاری و سەربازییان بۆ دەوڵەتەکانیان دەکرد و، تۆوی دووبەرەکییان لە نێوان دانیشتوانی

دەوڵەتی عوسمانی دەنایەوە.[1]

چالاكیی نەتەوەیی لە شام لەناو هەندێ كەسێتی ڕەنگیدایەوە كە لە گۆڕەپانی ڕووداوەكان دەركەوتن و ڕۆڵێكی دیاریان هەبوو لە بڵاوكردنەوەی كتێب و دامەزراندنی ڕۆژنامە و گۆڤار كە ناوەڕۆكی هزری (نەتەوەیی عەرەبی)یان بڵاو دەكردەوە بەشێوەیەكی نهێنی و بەپارێزەوە.

ئەوانەی بانگەوازی نەتەوەییان دەكرد زۆرن و لە سەرووییانەوە (بطرس البستاني)یە، پیاوێكی دیانی پرۆتستانییە پەیوەندی بە گەلێ لە نێردراوەكانی ڕۆژئاواوە هەبووە و دەستی هەبووە لە وەرگێڕانی ئینجیل بۆ زمانی عەرەبی و فەرهەنگێكی بۆ زمانی عەرەبی لە دوو بەش دەركردووە بۆ ئەوەی بڵاوبوونەوەی ئاسان بێ بەناوی (قطر المحيط) و كۆ زانیارییەكانی بوستانیشی دانا و لە ژیانی خۆیدا شەش بەرگی دەرچوو و منداڵەكانی تەواویان كرد و گەیشتە یازدە بەرگ. جگە لەمانە چالاكیی ڕۆژنامەگەریی هەبووە و گۆڤاری (الجنان)ی دەركردووە و (مدحت پاشا) كە والیی سوریا بوو هانی دەدا.

(بطرس) لە هەموو چالاكیەكانی لەسەر هۆكاری ڕۆشنبیركردن سوور بوو و ژیانی نەتەوەیی و ئەدەبی میللیی لە دەروونی شامیەكان بڵاو دەكردەوە.[2]

سوڵتان عبدالحميد هەستی بەوە كرد كە چالاكیی ڕۆژنامەگەریی نەتەوەیی سنووری ئەو یاسایانەی بەزاندووە، كە دەوڵەتی عوسمانی دایانی ناوە و بەسووكی سەیری كیانی دەوڵەت دەكا و نەرمی نواندنی دەوڵەتی بەهەل زانیوە لە جێبەجێكردنی ئەو یاسایانە، بۆیە فەرمانی دایە (مدحت پاشا)ی سەرۆك وەزیرانی كە هەموو ئەو ڕۆژنامانەی لە لایەن پارتی ناوەوە و مەزهەبیەكانی وڵاتی عوسمانی دەردەچن دابخرێن، هەروەها هەندێ بابەتی نوێی خستە سەر یاسای ڕۆژنامەگەریی كە لە ساڵی ١٨٧٨ع لە لایەن سوڵتان عبدالعزيزی مامی دەرچوو بوو، بۆ ئەوەی سنووری دانێ بۆ ئەو بڵاوكراوانەی كە هانی

١ الغامدي، صفحات ١٢٧-١٢٩ و ١٣٢ و ١٤٠- ١٤١، و كذلك الشوابكة، ص٣٠.

٢ سەرچاوەی پێشوو.

بیرۆکەی جیاوازکاری و نەتەوەیی دەدەن لە ڕۆژنامە و کتێب و هیدی.[1]

کۆمەڵەی بێروتی نهێنی کە پێش هاتنە سەر عەرشی سوڵتان عبدالحميد بە ساڵی دامەزرا، کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لە پەرەسەندنی هەستی دژایەتیکردنی عوسمانییەکان و مەبەستی ئەم کۆمەڵەیە جودابوونەوەی سوریا و لوبنان و سەربەخۆبوونیان بوو لە دەوڵەتی عوسمانی، ئەم کۆمەڵەیە دیانەکانی شام دایان مەزراند و خەڵکیدی بوونە ئەندامی، چالاکیەکەی بریتی بوو لە دەرکردنی بڵاوکراوە و هەڵواسینی لەسەر شەقامەکان لەکاتی تاریکیدا. لەم بڵاوکراوانەدا هێرش دەکرایە سەر ڕژێمی عوسمانی و داوا لە عەرەب دەکرا، کە دژی شۆڕش بکەن و ڕژێمی سوڵتان عبدالحميد لەناو ببەن.

ئەم کۆمەڵەیە لەو کاتە پەیدابوو کە (مدحت پاشا) والیی عوسمانی بوو لەسەر سوریا و، مەدحەت پاشا بەوە تاوانبار کرا کە هەوڵ دەدا سوریا سەربەخۆیی وەربگرێ، بۆیە گواستیانەوە (ئەزمیر) بە والییەتی.[2]

لە ڕاستیدا بەرنامەی کۆمەڵەی بێرووتی نهێنی داوای سەربەخۆیی سوریا دەکات، کە لەسەر بنچینەیەکی نەتەوەیی لەگەڵ لوبنان یەك بگرێ.

لە ڕووبەڕووبوونەوەی فەرمانڕەوایی سوڵتان عبدالحميد چەند کۆمەڵەیەك لە سوریا دامەزرا دوای ئەوەی گیانی نەتەوەیی تێدا بڵاو بوویەوە، وەکو کۆمەڵەی (المقاصد الخيرية) لە ساڵی ١٨٧٨، ئەم کۆمەڵەیە لە لایەن مەدحەت پاشای والیی سوریای عوسمانییەوە پشتگیری دەکرا، بەڵام میریی عوسمانی نەیهێشت بەردەوام بێت. هەروەها کۆمەڵەی (النهضة العربية) لە ساڵی ١٩٠٦ دامەزرا و بنکەی سەرەکیی لە ئەستەنبۆڵ بوو و دوایی کردیانە (المنتدى الادبي) و لقەکەی لە دیمەشق بوو بەناوی (جمعية النهضة السورية) "مەبەستی دیاری کۆمەڵەکە بڵاوکردنەوەی زمانی عەرەبی بوو، مەبەستە نهێنیەکەی بەپێی بۆچوونی دامەزرێنەرەکانی ڕزگارکردنی وڵاتی عەرەب بوو لە زوڵم و ستەمی عوسمانییەکان" و "داوای دژایەتیکردنی فەرمانڕەوایی عوسمانیی و یەکبوونی

١ سەرچاوەی پێشوو.

٢ سەرچاوەی پێشوو.

ولاتی عەرەبی لە دەولەتێکی سەربەخۆ و جیاواز لە دەولەتی عوسمانی کە خودان کیان و بنەما تایبەتییەکانی خۆی بێت". [1]

*　*　*

بەلام نەتەوەییەکانی میسر هێرشیان کردە سەر پەیوەندی ئایینی بە گشتی و کۆمەڵگای ئیسلامی بە تایبەتی. (حزب الامة) کە لە (٢١) سێپتێمبەری ١٩٠٧ بەرەسمی لە میسر دامەزرا نوێنەرایەتی ئەوانەی دەکرد و سەرۆکی پارتەکە (محمود سلیمان پاشا) بوو، لایەنگرانی ئەم پارتە بریتی بوون لە کۆمەڵێ پاشا و خاوەن زەوی و زارە کشتوکاڵیەکان، ئەوانەی بیرکردنەوەی ڕامیارییان لە بەرژەوەندیی کەسیی خۆیان تێنەدەپەڕی و، تا ڕادەیەکی گەورە لەگەڵ بەرژەوەندیی داگیرکردن دەگونجا. هەر کە دەسەلاتی داگیرکەر ویستی مولکە کشتوکاڵیەکان بچەسپێنێ، ئەو کاتە گەورە مولکدارەکان هەستیان بە جۆرە دڵنیاییەك کرد و لەوانەش (أحمد لطفي السيد) بوو کە بە فەیلەسوفی نەوە بەناوبانگ بوو. پارتی نەتەوە ڕۆژنامەی (الجريدة)ی دەرکرد و زمان حالی بوو. [2]

*　*　*

ڕۆژنامەی (الجريدة) داوای بەهێزکردنی کەسێتی میسری و زیاتر پەیوەستبوون بە میسری دەکرد لە بریتیی بانگەشەکردن بۆ کۆمەڵگای ئیسلامی، لەم بارەیەوە دەڵێ: "ولاتمان و-میسر- خۆمان دەکەینە قوربانی ئەوەی بە هەڵە ناوی لێنراوە کۆمەڵگای ئیسلامی". [3]

*　*　*

نەتەوەیی لای ئەرمەن-یەکێ لە گەلەکانی دەولەتی عوسمانی- بە ئارەزووی سەربەخۆیی ئایینیەوە پەیوەستدار بوو، ویست و حەزی ئەرمەن لەوەدا بوو، کە

---

١ خيرية قاسم، الحكومة العربية في دمشق، ص٢١٦، نقلاً عن الغامدي ص١٥٧.

٢ العقاد، مقال الاحزاب السياسية في مصر في جريدة أخبار اليوم القاهرية في ١٩١٦/١١/١٦ و (الجريدة) العدد ١٦٦٧ في ٢ سبتمر ١٩١٢ نقلا عن الشوابكة، ص١٦٥-١٦٨.

٣ سەرچاوەی پێشوو.

هەمیشە نەو کورد و تورکە موسـڵمانانەی کـە لـە گـەڵیان دەژیـن تـەنگاویان بکـەن، بەتایبەتی لەناوچەی (مووش) و (ئەدەنە) و شوێنی دی، کە ئەرمەنەکان لێی نیشتەجێن و داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەرمەنیی تێدا دەکەن، واتا: ناوچەی ئـەنادۆڵ سـوڵتان عـبدالحميد بە توندی بەرامبەریان دەوەستا.

بەرهەڵستکاریی ئەرمەنەکان بۆ سوڵتان عبدالحميد گەیشتە رادەیێ، کە پیلانێکیـان داناوە بۆ لەناوبردنی، ئەمەش پێی دەگوترێ (حادث القنبلة). ئەرمەنە نەتەوەییەکان لـە ساڵی ١٩٠٥ لەگەڵ تیرۆرستێکی نێو دەوڵـەتی بـەناوی (أدوارد جـوریس)ی بـە بنەچـە ئەرمەنی و بە ڕەگەز بەلجیکی ڕێك کەوتن کە سوڵتان بکوژن.

لە (٢١)ی یۆلیۆی ١٩٠٦ ئەم تیرۆریستە و هەندێ لـە یاریـدەدەرانی قونبەلەیـەکی کاتیی ئامادە کرد، کە لە چرکەیەکی دیاری کراو بتەقێتەوە. لەو کاتەی کە سـوڵتان لـە نوێژی هەینی لە مزگەفتی (یەلدیز) دێتە دەرەوە. ئینجا (إدوارد جـوریس) خـۆی لـەناو عارەبانەیەك شاردەوە کە وڵاخ رایان دەکێشا، هەروەك بڵێی گەڕۆکێکی بێگانەیە هاتووە سەیری ئاهەنگی نوێژی هەینی دەکات، بەڵام سوڵتان لەکاتی تەقینەوەکە درەنگتر هات، چونکە کتوپڕ وەستا بۆ ئەوەی پرسیارێ لە شێخی ئیسلام بکـات لـەبارەی کێشـەیەك و قونبەلەکە تەقیەوە و سوڵتان رزگاری بوو، بەڵام (٢٦)کەس کـوژران و هەنـدێکی دیـش بریندار بوون، باڵیۆزخانەی بەلجیکی بەپێی یاسـای مـافی تایبـەتی بێگانـەکان دەسـتی خستە ناو کارەکەوە و (إدوارد جوریس)ی پاراست، سـەیر و سـەمەرە لـەوە دا بـوو کـە سوڵتان بووردی و دوایی (٥٠٠) جونێهی زێڕی عوسمانیی دایێ، بەڵام سەیر و سەمەرەی لەمە گەورەتر سوڵتان دڵدانەوەی کرد و بۆ لای خۆی راکێشـا و لـە ڕشـتەی هـەواڵگری عوسمانی لە ئەوروپا بەکاری هێنا.[1]

* * *

بەرهەڵستکاریی نەتەوەیی لە (مەقدۆنیا) و (بەلقان) بەگشتی لە خاکی عوسمانی لـە ئـەوروپا هـەروەك پەیوەنـدیی بـە ئەرمەنـەوە هـەبوو- پەیوەنـدیی بـە بزووتنـەوە تیرۆریستەکانەوە هەبوو و ئارەزووی لەجودابوونەوە بوو لە دەوڵەت.

١ سینا آق شین، ترکیا الفتاة و الاتحاد و الترقي أستانبول، ١٩٨٠، ص٤٩.

تەنیا لە ناوچەی مەقدۆنیا ملیۆن و نیوێ موسڵمان لـە نێـوان تـورك و ئەلبانیـەکان هەبوو، سەرەڕای دیانەکان لە بولگاریا کە ژمارەیان ٩٠٠,٠٠٠ کەس بـوو، یۆنانیـەکان ژمارەیان ٣٠٠,٠٠٠ کەس بوو، سیربەکان ١٠٠,٠٠٠، پۆڵەندییەکان ١٠٠,٠٠٠ کەس دەبوو.

بەڵام ئەوروپا یارمەتیدەری دیانەکانی دەوڵەتی عوسمانی بوو، لایەنگیری دەکردن و بۆ کردەوەی تیرۆریستی دژی موسڵمانەکان هانی دەدان، هـەروەها دژی دەوڵـەتی عوسـمانی بوو بۆ ئەوەی ببێتە سەرەتای سەربەخۆبوونیان لە دەوڵەتی عوسمانی.

## ٢-ماسۆنییەکان:

گروپە ماسۆنییەکان دیـوارێکی بـەتینی بەرهەڵسـتکاریی دژی سـوڵتان عبدالحمیـد دروستکرد و بەفراوانییەوە لەناو دەوڵەتی عوسمانی پەلی هاویشت و گەیشـتە تاکـەکانی کۆشك، میر (مراد)ی برا گەورەی سوڵتان عبدالحمید ماسۆنی بوو، لە دوای ئەوەی هاتـە سەرعەرش بەمرادی پێنجەم ناسرا، مـراد یەکسـەر پـێش هاتنـە سەرعەرشـی سـوڵتان عبدالحمید بووە سوڵتان، (مراد) لە لایەن میر (إدوارد)ی جێگری پاشای ئینگلتـەرا کـە دوایی بووە پاشای ئینگلتەرا بەناوی ئەدواردی حەفتەم بەرەو ماسۆنیزم چوو.

ماسۆنیزم گەمارۆی سوڵتان عبدالحمیدی دا، هـەر لـە سـەرەتای دانیشـتنی لەسـەر عەرش تا وەکو لەسەر عەرشی دابەزاند، زۆربەی وەزیر و سەرۆك وەزیران و ئەمینداڕانی کۆشکی فەرمانڕەوا ماسۆنی بوون. "کار گەیشتە ئەوەی جەمالودینی ئەفغانی کە یەکێ بوو لە کۆڵەگەکانی بانگاشەکردن بۆ کۆمەڵگای ئیسلامی کە سوڵتان عبدالحمیـد داوای بۆ دەکرد ماسۆنی بوو".[1]



دیارترین سەرۆك وەزیرانی سەردەمی سوڵتان عبدالحمید-کـە مەدحـەت پاشـا بـوو- ماسۆنی بوو. دکتۆر (حکمت طانیو)ی سەرۆکی کۆلێژی خواییەکان لە زانکۆی ئەنقەرە و دانەری کتێبی (الیهود و الاتـراك عـبر التـأريخ) دەڵـێ: مەدحـەت پاشـا لـە بنەچـەڕا جوولەکە بووە. دکتۆر ئەمە دەگێڕێتەوە سەر سەرچاوەکەی کە کتێبی (یهـود فرنسـا)ی

١ الهامي صوى صال، المرجع السابق، ص٢٠٦.

دانانی: ئیدوارد دارمۆنتە، لە ساڵی ١٨٨٩ چاپکراوە لە پاریس لاپەڕە (١١٣)، بەرگی یەکەم.

دەقی ئەو پەرەگرافەی کە دانەر گەواهیی پێداوە ئەمەیە:

"مەدحەت پاشا کوڕی حاخامێکی جوولەکەی مەجەرییە و پێشڕەوی بزووتنەوەی نوێگەریە زانراوەکانی دەوڵەتی تورکییە، چەند قوتابخانەیەکی کردەوە کە متمانەیان دەکردە سەر بنەماکانی جوولەکە و سەرەتاکانی شۆڕشگێڕیتییان فێر دەکرد. مەدحەت پاشا دامەزرێنەری پارتی (ترکیا الفتاة)ە، ئەم هەموو باڵەخانانە بەپێی ڕێنماییەکانی (سیمون دویتش)ی هاوڕێیە نهێنگیرەکەی ئەورووپای دروستکراوە. تاوانی کوشتنی سوڵتان عبدالعزیز لە پێش چاوی مەدحەت پاشا ئەنجام درا. ".[1]

مەدحەت پاشا لە ئەورووپا زۆر بەناوبانگ بوو، بەشێوەیکی وا ئینگلتەرا پیلانێکی دانا کە بەهۆی کەشتیەکی جەنگەوە مەدحەت پاشا لە تایفی تاراوگەی بیڕفێنێ. لەو کاتەی دادگای عوسمانی ویستی لەسەر کوشتنی سوڵتان عبدالعزیز دادگاییی بکات، مەدحەت پاشا پەنای بردە بەر باڵیۆزخانەی فەرەنسی لە ئەستەنبۆڵ.

هەواڵگریی سوڵتان عبدالحمید بەدوای چالاکی ماسۆنیزمەکاندا دەگەڕا، هەر چەندە ئەوانە خۆیان بە باڵیۆزە بێگانەکانەوە دەپاراست و پەنایان دەبردە بەر ئەو کەسێتیە بێگانانەی، کە بەپێی یاسای مافەکانی بێگانە مافی پاراستنیان هەبوو.

لەگەڵ هەموو هەوڵەکانی سوڵتان عبدالحمید، ماسۆنی پەلی هاویشتە ناو پارتی (الاتحاد و الترقی) و زۆربەی سەرۆکەکانی ئەم پارتە لە ماسۆنیزمەکان بوون.

گروپە ماسۆنیزمەکان لە ئەستەنبۆڵ هەبوون و لە سلانیك گروپێکی ماسۆنی هەبوو کە گروپی (مەقدۆنیا-ڕیزۆرتا)ی سەر بە گروپی ئیتالیای گەورە بوو، هەروەها گروپی (لا أفنیردی لورینت)ی سەر بە گروپی فەرەنسیی گەورە بوو. گروپی (فریتاس)ی سەر بە گروپی ڕۆژهەڵاتیی فەرەنسی و هیدیش.

گروپی (مەقدۆنیا-ڕیزۆرتا) ڕۆڵێکی مەزنی لە ڕووخاندنی سوڵتان عبدالحمید هەبوو،

١ طانیو، المرجع السابق، ص٢٥٦-٢٦٠.

چونکە سەرکردە گەورەکانی (الاتحاد و الترقی) لەودا ئەندام بوون و ئەمانە بوون: تەلعەت پاشا و مەدحەت شوکری پلادا و کازم پاشا و مانیاس زادە رەفیق و کازم نامی زووروو بەگباشی نەقیبی ئەندامی ئەنجوومەنی (المبعوثان) لە ویلایەتی مووش و حوسێن و محێدین سەرۆکی هێزەکانی جەندرمەی ناوچەی دراما.

بەڵام گروپی (فریتاس) بەشێکی گەورەی بەرکەوت لە بزووتنەوەی کۆ کردنەوەی هێزە شۆڕشگێڕەکان بۆ ڕووخاندنی سوڵتان عبدالحمید. چونکە ئەوان سەر بەو گروپە بوون بەشەکەی تری سەرکردە گەورەکانی (الاتحاد و الترقی) بوون، کە ئەمانە بوون:

ئیمانۆئێل قراسوو (جوولەکەی دۆژمەی عوسمانی) و جەمال پاشا و فائیق سلێمان پاشا و ئیسماعیل جانبولات و شێخ فەهمی ئەفەندیی ئەندامی ئەنجوومەنی (المبعوثان) لە لایەن ناوچەی کۆمۆ لجنە لە تەراقیای ڕۆژئاوا (یۆنانی ئێستا) و مستەفا نەجیب، هەر چەندە تەلعەت پاشا و بەگباشی نەقی بەگ لەوانیتر جودا بوو، یەکەمیان بووە سەرۆکی وەزیران لە میریی (الاتحاد و الترقی) و دووەمیان لە هەردوو گروپی (مقدونیا- ڕیزورتا) و (فریتاس) بەشداریی کردبوو.

ماسۆنیزمەکان نەیانتوانی ڕێکخراوێکی ماسۆنیی ناوەوە- واتا:عوسمانی- دابمەزرێنن تا ئەو کاتەی گروپە ماسۆنیەکانی سەر بە هێزەکانی دەرەوە سوڵتان عبدالحمید بڕوخێنن.[1]

### ٣-عەلمانییەکان:

عەلمانیزمی-وەکو تاکە بنەمایەکی ڕۆژئاوایی- دەشێ ئەو نەتەوەییانە بەشداریی تێدا بکەن کە گرنکی نادەنە ئایین لەحوکم و لە ژیان، ئەوانەش دەتوانن دیان بن یا موسڵمان.

لە شام گەلێ نموونەی ئاشکرا لەم جۆرە بیریارانە هەیە لە لایەنی دیانەکانەوە، بەڵام لە لایەنی موسڵمانەکانەوە دەتوانرێ ناوی شێخ (عبدالرحمن الکواکبی) بهێنرێ.

عبدالرحمانی کەواکیبی یەکێکە لە بانگخوازەکانی هزری نەتەوەیی دوور لە ئایین،

١ الماسي، المرجع السابق، ص٢٠٨-٢١١.

بۆیــە زۆر دژایــەتیی کۆمــەڵگای ئیســلامیی کــرد و هــەروەها لــە پێشــەکی بەرهەڵستکارەکانی سوڵتان عبدالحمید بوو.

عبدالرحمانی کەواکیبی لەبارەی سروشتی یاسای ڕامیارییــەوە کاریگــەریی بیرۆکــەی کەنیســەی لەســەر بــوو، ئەمــەش چــونکە نووســینی بیریارەکــانی شۆڕشــی فەرەنســی دەخوێندەوە و لەم بارەیەوە لەو دیانانەی شام وەکو نەجیب عازووری نزیــك بوویــەوە کــە دژایەتیی کۆمەڵگای ئیسلامێیان دەکرد.[1]

* * *

کەواکیبی لای وایە ئاین پەیوەندیی بە کاروباری دواییەوە هەیە و هیچ پەیوەندی بــە کاروباری جیهانەوە نییە، کە خەڵکی بەپێی بیروبۆچوون و یاسا جیهانییەکانیان دەتــوانن ڕێکی بخەن، لەم ڕووەوە دەڵێ: "... لێمان گەڕێن تەگبیری ژیانی جیهانمان بکەین و وا لە ئایینەکان بکەین، کە تەنیا لە دوایی کار بکات. ". لەبەر ئەوەی لــە زووەوە کــەواکیبی داوای جودابوونەوەی ئایینی لە دەوڵەت کردووە، بۆیــە هاوچــەرخەکانی لەوانــەش شــێخ (محمد رشید رضا) ڕەخنەی لێگرت و دەڵێت: "ئێمــە لــە چــەندەها کێشــە و لەســەرووی هەموویانەوە داواکردنی جودابوونەوەی هەردوو دەسەڵاتی ئایینی و ڕامیاری پێچــەوانەی ئەو بووین. ".[2]

* * *

کەواکیبی نزیکەی دوو ساڵ لە میسر مایەوە و دژی دەســەڵاتی ســوڵتان عبدالحمیــد کاری دەکرد و لە میسر پلە و پایەیەکی چــاکی پەیــدا کــرد، خــدێوی (عبــاس حلمــی) لەخۆی نزیك کردەوە و پەیوەندییان زۆر بەتین بوو، خدێوی هەوڵی دەدا کــە خەلیفایــەتی ئیسلامی لە دەوڵەتی عوسمانییەوە بدرێتە عەرەب و بەمەرجێ خۆی سوڵتانی کاتی بێ و شەریف حوسێن جێنشینی گیانیی بێت.

بەمجۆرە میسر لە بریتیــی دەوڵــەتی عوســمانی دەبێتــە بنکــەی ڕامیــاریی دەوڵــەتی

---

١ بطرس غالي، الكواكبي و الجامعة الاسلامية، ص٣٩ و محمود السمرة، مجلة العربي، عدد أبريل ١٩٦٥ و طبائع الاستبداد ص١٠٠-١٠١، على التوالي نقلا عن الشوابكة، ص٧٤-٧٥.

٢ سەرچاوەی پێشوو.

ئیسلامی، کەواکیبی لە پێشەکی کتێبەکەی (طبائع الاستبداد) کە بە شێوەی زنجیرە وتارێك لە ڕۆژنامەی (المؤید)ی قاهیر بڵاوی کردبوونەوە لە (١٥)ی ئۆکتۆبەری ١٩٠٠ ناوی (عباس)ی هێناوە. ئەم وتارانە توند و تیژ و بوێرانە بوون، لە دەوروبەری تاکڕەوی دەڕۆن و هێرش دەکەنە سەر سوڵتان عبدالحمید و سیاسەتەکەی. هەرکە ئەم وتارانەی کۆ کردەوە بۆ بڵاوکردنەوە شتی دیی خستە سەریان. کەواکیبی لە کتێبەکەی (أم القری) ڕەخنە لە کارگێڕیی مەرکەزیی دەوڵەتی عوسمانی دەگرێ و بە ئاشکرا داوا دەکات کە خەلیفەیەکی عەرەبیی قورەیشی لە مەککەی پیرۆز هەبێ نەك لە ئەستەنبۆڵ و هەڵمەتێکی توند و تیژ دەکاتە سەر عوسمانییەکان.[1]



کەواکیبی بە نموونەیەکی نەتەوەییە عەرەبەکان دەژمێردرێ کە هەموو هەوڵ و کۆششیان لەپێناو جودابوونەوەی عەرەب بووە لە دەوڵەتی عوسمانی.

## ٤-بانگخوازی مرۆڤایەتیی ئەوروپی:

ئەمانە پەیڕەوی ڕێبازی مرۆڤایەتی دەکەن و بەشێوازی ئەوروپی (هیومانیزم)ن، بە واتای: عەشقی مرۆڤایەتی، یاخۆ خۆشەویستی مرۆڤایەتی بەواتای فەلسەفی، یەکێ لە واتاکانی ئەم وشەیە لە ئەدەبدا: ڕزگاربوونە لە دەسەڵاتی ئایین و ڕەگەز پەرستی و پەیڕەوکردنی شارستانیی نوێی ئەوروپییە. مرۆڤایەتی زاراوەیەکی دەمامکدارە و خۆی لەژێر دروشمی عەشقی مرۆڤایەتیی حەشارداوە و داوای وازهێنان لە ئایین دەکات. مرۆڤایەتی بەم واتایە ڕێبازێ بوو لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتاکانی سەدەی بیستەم لە ئەوروپا بڵاو بوو بوویەوە و لەڕێگەی وەرگێڕان لە زمانە ئەوروپییەکان و ئەو قوتابیانەی، کە نێردرابوونە دەرەوە لە دەوڵەتی عوسمانیی بڵاو بوویەوە.

نوێنەری ئەم ڕێبازە فەلسەفیە ئەدەبیە لە دەوڵەتی عوسمانی (توفیق فکرت)ی شاعیرە، تورکە و لە ئەستەنبۆڵ لە دایکبووە، گەورەترین شاعیری قۆناغێکی ئەدەبیی دیاریکراوە لە مێژووی ئەدەبی عوسمانی و پێی دەگوترێ قۆناغی (ثروة الفنون). ئەم شاعیرە بواری ئەدەبی بێ خوایی و ئەدەبی ریالیزمی سۆشیالیزمی (مارکسی)ی لە

١ الغامدي، ص٢٧٧-٢٧٨.

توزکیں کردەوە.

کارەکانی (توفیق فکرت) لەسەر دوو بیرۆکەی بنچینەیی دامەزراون:

یەکەم: بێ خوایی، دووەم: هێرش کردنە سەر سوڵتان عبدالحمید و دەوڵەتی عوسمانی. تۆفیق فیکرەت بە ئاشکرا لە شیعرەکانیدا دەڵێ: "من پەرستراو و خواپەرست ناناسم، تەنیا سروشت کتێبی منە. بەڵام ئایین ئەگەر هەر دەبێ ببێ- ژیانە. ". هەروەها دەڵێ: "من منە، تۆ تۆیە و لە ئەنجام نەخوا هەیە و نە بەندە. ".

تۆفیق فکرەت هەڵوێستی هەبوو، هەر کە جەردە ئەرمەنیەکان بەسەرۆکایەتیی (إدوارد جوریس) ویستیان دوای نوێژی هەینی سوڵتان عبدالحمید بکوژن، بەڵام سوڵتان هیچ زیانی پێ نەگەیی، تۆفیق فکرەت زویر بوو و قەسیدەیەکی دانا و دەستخۆشی لەو ئەرمەنیە دەکات کە ویستی سوڵتان بکوژێ و زۆر خەمبار بوو لەبەر نەکوژرانی سوڵتان عبدالحمید، ئەم قەسیدەیە پێی دەگوترێ (لحظة تأخر) و تێیدا دەڵێ:

**ئەی راوچیی مەزن**

**بەڵێ چەکت تەقاند، بەڵام بەداخەوە**

**چونکە نەت پێکا.**[1]

## ٥-هۆشگەراییەکان:

هۆشگەرایی لەسەدەی نۆزدەم وڵاتی عوسمانی و گەلێ وڵاتی دیی موسڵمانانی گرت. هەندێ هۆشگەرایی دەرکەوتن و داوای ئەوەیان دەکرد، کە متمانەیەکی رەها بکرێتە سەر هۆش و باوەڕیان بە غەیب نەبوو و پێیان وابوو، کە تەنیا ڕاستیە زانستیەکان دەبێ خاوەن دەسەڵات بێ، دامەزرێنەری ئەم رێبازە هزرییە (ئۆگست کینت)ە. ئەمەش جوولەکەیەکی گەورەی ماسۆنیەکانە لە فەرەنسا.[2]

* * *

١ طانيو، المرجع السابق، ص٤٧٢.

٢ سيد كمال، معجم الادب (باللغة التركية أيضا) استانبول ١٩٧٨، ص٣١٦.

دیارترین نوێنەری ئەم هزرە هاتووە (أحمد رضا بگ)ە، ئەمە یەکێ بوو لـە پیـاوانی پەروەردە و فێرکردن لە دەوڵەتی عوسمـانی لەسـەردەمی سـوڵتان عبدالحمیـد دا، سـاڵی ١٨٨٩ چووە فەڕەنسا و لەوێ نیشتەجێ بوو و ڕێبازی هۆشگەراییی(العقلاني) خوێنـد و باوەڕی پێهێنا، ئەحمەد ڕەزا یەکێ بوو لە (أتحادی)یەکان و بووە سەرۆکی هۆبەی (الاتحاد و الترقی) لە پاریس.

لەوێ ڕۆژنامــەی (مشــورت)ی دژی فـەرمانڕەواییی سـوڵتان عبدالحمیـد دەرکـرد و ئەمانە یارمەتییان دا لـە دەرکردنیـدا: (ئـەلبرت فـووا) کـە جوولەکەیـەکی سـلانیکە، (آریستد پاشا) ڕۆمییەکی کاسۆلیکیی یۆنانیـە و (خلیـل غـانم) عـەرەبێکی مـارۆنیی لوبنانییە.

ئەحمەد ڕەزا بەگ بـاوەڕی بـە ڕێبـازی هۆشـگەرایی هێنـا و-کـە لـە پـاریس بـوو- ئامادەی وانەکانی گەورەی هۆشگەرایـیەکان و فەیلەسووفەکەیان لەو کاتە (لافیت) بوو.

* * *

ئەحمەد ڕەزا بەگ لای وابوو کە پێویستە فەرمانڕەواییی سوڵتان عبدالحمید لابـبرێ و دەوڵەتێ دابمەزرێ، کـە پـەیڕەویی تەوژمـەکانی سـەردەم بکـا و گرنگـی بەدەرچـوانی قوتابخانە نوێ و هاوچەرخەکان بدرێ و بخرێنە ڕشتەی فەرمانڕەواییەوە و مـافی تـەواوی ڕامیـاری بدرێتـە ناموسـڵمانەکان و لـەم ڕووەوە دەڵـێ: لەوانەیـە ئەمـە دەسـتەبەریی بەردەوامیی دەوڵەتی عوسمانی بکا دوای ئـەوەی بووەتـە تـالأنی هێـزە ئەورووپیـەکان و هەوڵدان لەپێناو بزووتنەوەی وڵات، بەلای ئەوەوە بۆچوونی کەسـەکان گـرنگ نییـە کـە باوەڕی بە هۆشگەرایی بێ یا ئیسلام یاخود نەتەوەییی تورکی یا نەبوونی مەرکـەزی یـا پەیوەندی عوسمانی یاخود ئاوارەیی، مادام هەموویان هەوڵی چارەسەرکردنی کێشـەکانی دەوڵەت دەدەن و بەرەو پێشی دەبەن.

ڕۆژنامەی (مشورت) بەزمانی فەڕەنسی لە پاریس دژی ڕژێمـی سـوڵتان عبدالحمیـد دەردەچوو و جوولەکە و ڕۆم و مارۆنەکان یارمەتیی دەرچوونیان دەدا. ئەحمەد ڕەزا بـەگ لـە ژمـارەی یەکـەمی (مشـورت)-٣ دیسـەمبەری ١٨٩٥- باسـی بەرنامـەی پـارتی (الاتحـاد و الترقـی) دەکـا و بـەگیانێکی نیشـتمانیی ڕوون بۆچـوونەکانی دەردەبـڕێ و

وتارەکەی رەنگدانەوەی هزری خۆیەتی، چونکە باسی دەستوور و دیموکراسی ناکات- بنێشتە شینکەی ئیتیحاد و تەرەقی- بەڵکو زیاتر هزر و رێبازە هۆشگەراییەکەی خۆی دەردەبڕێ.

ئەحمەد رەزا بەگ-لە رۆژنامەی (مشورت) لەدانە تورکیەکەی- رای وایە کە هەتا نەخوێندەواری هەبێ ناتوانرێ سوود لە دەستوور وەربگیرێ، زۆر پێویستە هەنگاو بەرەو پەروەردە و بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری بنرێ. ئەو کەسەی پارووی ژیانی بە ئارەقی ناوچەوانی پەیدا دەکا ئەو کەسەیە کە لە گەڕانی بەدوای قازانجیدا زیان بەکەس ناگەینێ و پێویستە ئەم پیاوە ئامادە بکرێ. هەرکە ئەم پیاوە گوم دەکەین دەستوور هیچ سوودێ ناگەیەنێ. لەگەڵ ئەمەش کە ئیتیحادیەکانی تر خەمی هەرە گەورەیان دەستوور بوو.

بەڵام ئەحەمەد رەزا بەگ دواتر بۆچوونەکانی خۆی هەموار کرد، دوای ئەوەی بینیی کە ئیتیحادیەکان دژی ئەون لە بارەی پێویستیی هەبوونی دەستوور.[1]

١ آق شين، المرجع السابق، ص٢٨-٢٩.

# پاری دووەم

# بەرهەڵستکاریی هەندێ لە گەورە کەسێتیە ئیسلامیەکان

## (چەند نموونەیێ)

هەندێ فەرمانڕەوا وزانایانی ئایینی و گەورە کەسێتیە ئیسلامیە بەناوبانگەکان دژایەتیی فەرمانڕەواییی سوڵتان عبدالحمیدیان دەکرد. لە فەرمانڕەوایەکان وەکو: (شریف حسین) گەورە پیاوی مەککەی پیرۆز و خدێوی (عباس حلمی) والیی میسری عوسمانی.

فەرمانڕەوایەکان لە روانگەی گواستنەوەی خەلیفایەتی بۆ عەرەب و، زانایەکان لە ڕووانگەی حوکمی تاکڕەویی سوڵتان عبدالحمیدەوە سەری هەڵدا و هەندێ لە گەورە پیاوی موسڵمانەکان بەشداریی زاناکانیان کرد.

ئەوەی لێرەدا پێویست نییە بڵێین کە: سوڵتان عبدالحمید حوکمەکەی خۆی بە دەستووری دەست پێکرد و لەگەڵ رایەکانی (مدحت پاشا) و هاورێیانی دەگونجا، بەلام سوڵتان دوایی لە تەشەنەی دەسەڵاتی پیاوانی (ترکیا الفتاة) یاخود عوسمانیە نوێیەکان بێزار بوو و خۆی لەبەردەستیان دەرهێنا و سیاسەتە تاکڕەویەکەی بەرپا کرد و، خۆی سەرپەرشتیی هەموو شتێکی گەورە و بچووکی لە دەوڵەت دەکرد. لەوانەی کە دژایەتییان دەکرد ئەمانە بوون:

### ١-خدێوی (عباس حلمی) لە میسردا:

سوڵتان عبدالحمید لە یاداشتەکانیدا دەڵێ: ئینگلیزەکان (عباس حلمی)ی و والیی میسری عوسمانییان کردۆتە ئامێری دەستیان و هەڕەشە لە سوڵتان دەکەن کە ئەوان خەلیفایەتیی لێ دەستێننەوە و دەیدەنە دەست عەرەبەکان.[1]

خدێوی (عباس حلمی پاشا) بەئومێدی ئەوە بوو کە خەلیفایەتی بدرێتە دەست عەرەبەکان و خۆی ببێتە سوڵتان، نێردراوی خدێوی لە وڵاتانی عەرەبی بلاو بووبوونەوە بۆ ئەوەی داوای ئومێدەکەی خدێوی بکەن. بۆیە خدێوی (حلمی عباس) پیاوەکانی دژی

١ المذكرات، ص٦ من المقدمة.

سوڵتان عبدالحميد لەخۆی نزيك كردەوە، وەكو: كەواكيبی خاوەنی (طبائع الاستبداد).[1]

هەروەها خديوی يارمەتيی ئەندامانی كۆمەڵەی (تركيا الفتاة) ياخود (اتحادی)يەكانی دژی سوڵتان دا لەو كاتەی كە لە ميسر بوون، بەشێوەيەك كە ڕاستەوخۆ وێك نەكەون.

لەو كەسێتيە ئيسلاميە گەورانەی كە دژی سياسەتی سوڵتان عبدالحميد بون، بەتايبەتی فەرمانڕەواييە تاكڕەوييەكەی:

(جمال الدين الافغانی) و قوتابيە شامييەكەی بەڕێز (محمد رشيد رضا) و قوتابيە توركيەكەی (محمد عاكف) بوو.

## ٢-بەڕێز (محمد رشيد رضا) لە شام:

(محمد رشيد رضا) بە بيروبۆچوونەكانی (أفغانی) كاريگەر بوو، چونكە وتارەكانی (أفغانی)ی دەخوێندەوە كە لە گۆڤاری (عروة الوثقی) بڵاوی دەكردەوە، ئەم گۆڤارەش ئەفغانی و (شێخ محمد عبده) دەريان دەكرد.

(رشيد رضا) لە كاريگەريی (عروة الوثقیٰ) لەسەری دەڵێت: "گەورەترين كارتێكردنی لەسەرم ئەوە بوو كە ئاڕاستەی نەفسمی دەكرد بۆ هەوڵدان لە پێناو چاكسازيی ئيسلاميی گشتی. ".

دوای ئەوەی ئەفغانی و (محمد عبده) ناتەباييان كەوتە نێوانەوە و (محمد عبده) پەيڕەويی ڕێبازی تايبەتی خۆيكرد لە چاكسازی كە متمانە دەكاتە سەر كردەی پەروەردەيی، دەبينين (رشيد رضا) لە ١٨٩٨ لە بێروتەوە دەچێتە ميسر* "بۆ نارەزايی دەربڕين لەسەر ئەو را و تەگبيرانەی كە سوڵتان عبدالحميد پەنای بۆ بردن و لەبەر ئەوەی (محمد رشيد رضا) نەيتوانی بيروبۆچوونەكانی خۆی لە لاپەڕەكانی (العروة الوثقی) دەربڕێ، (محمد رشيد رضا) لە لای مامۆستايەكەی خۆی (محمد عبده) مايەوە بۆ سوود

١ محمد رشيد رضا، مختارات سياسية من مجلة المنار، تقديم و دراسة وجيه كوثرانی، صفحات ١٠-١٥، ١٩٨" ١٣٤-١٣٦ علی التوالي نقلا عن الغامدي ٢٦٠-٢٦١-٢٦٣-٢٦٤-٢٦٦.

* لێرەدا هەست بەقرتاندن دەكەم (وەرگێڕ).

وەرگرتن. ".[1]

(رشد رضا) ڕۆژنامەی (المنار)ی دەكرد و قەدەغەبوو كە بچێتە ناو ئەو دەوڵەتە عەرەبیانەی ڕاستەوخۆ لەژێر دەسەلاتی سولتان دا بوو.

بەڕێز (محمد رشید رضا) هەلوێستی بەرامبەر هەردوو ڕێبازی قادری و روفاعی هەبوو و لە كتێبەكەی "الحكمة الشرعیة في محاكمة القادریة و الرفاعیة" ڕەخنەی "لەو هەڵس و كەوتە غەیبی و جادووگەرییانە گرت كە خراونەتە ناو ڕێبازە سۆفیگەریەكانەوە. ئالێرەدا ناكۆكی لە نێوان (محمد رشید رضا) و شێخ (أبو الهدی الصیادی) پەیدا بوو، (صیادی) لە سولتان عبدالحمیدەوە نزیك بوو".

بەڕێز (محمد رشید رضا) دوای مردنی مامۆستایەكەی شێخ (محمد عبده) لە ساڵی ١٩٠٥ "خۆی گلاندە ناو مەیدانی سیاسەتەوە" و دوای ئەمە بانگەوازی چاكسازیی دەوڵەتی عوسمانی و بەگژداچوونی تاكڕەوی و بانگەوازی فەرمانڕەوایی دەستووری دەكرد.

هەر كە شۆڕشگێڕە عوسمانییە (إتحادی)یەكان توانییان لە دەرەوەی ولاتی عوسمانی بزووتنەوەكەیان گەورە بكەن و چالاكیەكەیان چڕ بكەنەوە بۆ لادانی سولتان عبدالحمید لەسەر عەرش و ڕاگەیاندنی دەستوور، پەیوەندییان بەو كەسێتیانە كرد كە لە دەرەوە دژی فەرمانڕەوایی سولتان بوون. لەبەر ئەمە لە قاهیرە لیژنەیەك بەناوی "جمعیة الشوری العثمانیة" دامەزرا بە سەرۆكایەتیی (محمد رشید رضا). ئەمە ڕۆڵی خۆی لە گۆڕانی ئاڕاستەی (المنار) هەبوو، (محمد رشید) لەو كاتەوە وتارەكانی لە بارەی تاكڕەوی و سیاسەتی حەمیدی و فەرمانڕەوایی ڕاوێژ و ڕێگاكانی چاكسازیی دەوڵەتی عوسمانی بوو".[2]

* * *

(رشید رضا) باوەڕی وابوو كە بوونی دەوڵەتێكی عەرەبیی جیاواز لە دەوڵەتی خەلیفایەتیی عوسمانیی شتێكی پێویستە و دەڵێ: "بەرژەوەندیی سیاسەتی عەرەب لەوەدایە كە دەوڵەتێكی سەربەخۆیان هەبێت".[3]

---

١ سەرچاوەی پێشوو.

٢ سەرچاوەی پێشوو.

٣ سەرچاوەی پێشوو.

ئەو کاتەی کە (محمد رشید رضا) دەبینێ پێویستە هێرش بکرێتە سەر فەرمانڕەوایی سوڵتان عبدالحمید، ستایشی کۆمەڵەی (ترکیا الفتاة) دەکا ئەوانەی کۆمەڵەی (الاتحاد و الترقی)یان دامەزراند.

هەروەها (محمد رشید رضا)ی سەرۆکی کۆمەڵەی ڕاوێژی دژکاری فەرمانڕەوایی سوڵتان عبدالحمید هەندێ لە پیاوانی (الاتحاد والترقی)ی کە لە میسر بوون خستە ناو لیژنەی ناوەندیی ئەو کۆمەڵەیەی کە سەرۆکایەتی دەکات.

* * *

بەڕێز (محمد رشید رضا) هەر لە خۆیەوە بەرگریی لە خدێوی (عباس حلمی پاشا) کرد و ئەو تاوانانەی ڕەتکردەوە کە درابوونە پاڵی و گوایا لەگەڵ ئینگلیز پێکهاتووە و گوتی: ئەم تاوانانە دەستکردی پیاوانی سوڵتان عبدالحمیدن.[1]

* * *

بەڕێز (محمد رشید رضا) ستایشی زەیدییەکانی یەمەن دەکات چونکە سەریان بۆ سوڵتانەکانی عوسمانی دانەنواند و جەنگیان لەگەڵیان کرد، تا بێزاریان کردن و سوڵتانەکان ناچاربوون لەگەڵ (یحی)ی پێشەوای یەمەن پێك بێن و دانیان بە پێشەوایەتی نا لەناو نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆی.[2]

بە بۆنەی سەرکەوتنی کۆمەڵەی (الاتحاد و الترقی) بەسەر سوڵتان عبدالحمید و ناچارکردنی کە دووبارە کار بە دەستوور بکا و کردنەوەی ئەنجوومەنی (المبعوثان) و دەست بەسەراگرتنی (إتحادی)یەکان لەسەر دەوڵەت و لابردنی سوڵتان، بەڕێز (محمد رشید رضا) لە دووانێکیدا لە باخی (أزبکیة) لە قاهیرە دەڵێ: "کۆمەڵەی اتحاد و ترقی- بەردەوام کۆششی دەکرد و هەوڵی دەدا و بەرەنگاریی کارە سەختەکانی دەکرد تا پەی بە سەرکەوتن برد و گەیشتە ئارەزووەکانی. ".

---

١ سەرچاوەی پێشوو.

٢ سەرچاوەی پێشوو.

## ٣-(محمد عاكف) لە ئەنادۆڵ:

لای ئەوانەی بەزمانی توركی دەئاخفن شاعیری ئیسلامە و یەكێكە لە بانگخوازەكانی كۆمەڵگای ئیسلامی، لە پابەند بوونی بە كۆمەڵگای ئیسلامی كاریگەریی سێ (٣) كەسی بەسەرەوەیە كە ئەمانەن: (جمال الدین الافغانی) و (محمد عبده) و (عبدالرشید إبراهیم).

(محمد عاكف) رای وایە كە هۆی كزیی موسڵمانەكان بۆ دووریيان لەئیسلام و بە هەڵە تێگەیشتنیان لە ئیسلام دەگەڕێتەوە. (محمد عاكف) پێی وابوو كە دەبێ قورئانی پیرۆز سەرچاوەی بنەڕەتیی بزووتنەوە بێ لە كۆمەڵگادا و داوای دووركەوتنەوە لە بیدعە و شتی پڕ و پووچ و دووبارە تێگەیشتنەوەی ئیسلام دەكات، چونكە ئیسلام یاسای ژیانە و ژیانی كۆمەڵگا رێك دەخات و قورئان بۆ ئەوە دانەبەزیوە كە لە گۆڕستان بخوێنرێتەوە و فاڵی لێ دەربهێنرێ.

(محمد عاكف) دەڵێت: "دەبێ ڕاستەوخۆ ئیلهام لە قورئان وەربگیرێ و وا لەسەردەم بگەیەنین كە بانگەوازی ئیسلام بكات. ". (محمد عاكف) رای وایە كە پێویستە دژایەتیی هزری نەتەوەیی بكرێ و لەم بارەوە دەڵێ: "كابووسی خوێناوی رۆژئاوا دەستی بەسەرمان دا گرتووە و بینینمانی كوێر كردووە و هزری ئیسلامیمانی پەكخستووە. ". هەروەها (عاكف) رای وایە كە پێویستە موسڵمانەكان "تف لەدەم و چاوی خاچییەكان و وشە ناپاكەكانیان و ویژدانی چەرخە دەمامك كراوەكە بكەن. " و بەردەوام مەترسییان لە ڕوس بێ و هەمیشە لەسەر ئەوە سوورە كە دەبێ موسڵمانەكان ئومێدیان بە ئەمڕۆ و سبەینێیان هەبێ و گەشبین بن "مادام ئەو بەڵێنەی خوا بە ئێمەی داوە هەقە، بەیانیی هەمیشەییمان هەر هەڵدێ. ".

بەڵام لەبارەی یەكێتیی ڕەگەزەكانی وڵاتی ئیسلامی، لە یەكێ لە گوتەكانی دەربارەی كۆمەڵگای ئیسلامی دەڵێ "توركی ناتوانێ بەبێ عەرەبی بژی، توركی بەلای عەرەبییەوە چاو و باسكی ڕاستیەتی و هەردەبێ موسڵمانەكان یەك بگرن چونكە ئیسلام ئایینی یەكگرتنە. ".[1]

---

١ محمد حرب، المرجع السابق، ص٢٨٤.

(محمد عاکف) -بەپێی گەواهی هاوچەرخەکانی- نموونەی تەقوا و خۆپارێزی و چکخوازی بوو، بۆ ئیسلام دڵسۆز بوو، ئیسلام لە ژیانی تایبەتی و گشتیدا دەژیا، بۆ ئیسلام ژیا و لەپێناو ئیسلام مرد، میللەتەکەی نازناوی شاعیری ئیسلامیان لێنا.

* * *

بەڵام بۆچوونی (محمد عاکف) بەرامبەر سوڵتان عبدالحمید لە بۆچوونی گەلێ بیریار و ئەدیب و زانا موسڵمانەکانی هاوچەرخی خۆی جودا بوو، (محمد عاکف) باوەڕی بە دیموکراتیەت هەبوو و دەیبینی کە سوڵتان عبدالحمید هەموو کاروبارەکانی دەوڵەتی لە دەستی خۆی کۆکردۆتەوە، بۆیە (محمد عاکف) دژی سیاسەتی فەرمانڕەوایی سوڵتان بوو و لە کۆمەڵگای ئیسلامی لەگەڵی ناتەبا نەبوو.

* * *

(محمد عاکف)-بەنیاز پاکییەوە- بووە ئەندامی کۆمەڵەی (اتحاد و ترقی) دوای ئەوەی هەڵیان خەڵەتاند، کە مەبەستیان رزگارکردنی دەوڵەتی عوسمانییە لە زۆرداری و دامەزراندنی دەوڵەتێکی دەستوریە کە موسڵمانەکان لە بۆتەیەکدا کۆ دەکاتەوە، بۆیە لەگەڵیان رێك کەوت و یارمەتیی دان و دووانی بۆدان، میریی (اتحاد و ترقی) هەڵی خەڵەتان و هەواڵگرییەکەی بۆ لای (عبدالعزیز آل سعود)ی هەنارد بۆ ئەوەی چاوی پێ بکەوێ و لاسی بدا تا لەگەڵ میریی (اتحاد و ترقی) کار بکا، (عاکف) لە گەشتەکەیدا ئازارێکی زۆری لە بیابانی (نەجد) بینی و نەیتوانی چاوی بە (عبدالعزیز آل سعود) بکەوێ و (عبدالعزیز)یش حەزی لەچاو پێکەوتنی نەبوو.[1]

بەڵام ئەم گەشتە واتای خۆی هەبوو و کۆمەڵەی (اتحاد و ترقی) هەستی بەوە دەکرد کە (محمد عاکف) ناو و ناوبانگێکی چاکی لە جیهانی ئیسلامی بە گشتی و وڵاتی عەرەبی بە تایبەتی هەیە.

---

١ جمال قرطای، محمد عاکف في صحراء نجد.

# پاری سێیەم

# بەرهەڵستكاریی كۆمەڵە شۆڕشگێڕی و نهێنیەكان

## ١-كۆمەڵەی عوسمانییە نوێیەكان:

گەنجی ڕۆشنبیری عوسمانی لە سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمەوە، كەوتبووە ژێر كاریگەری هەر یەك لە: شۆڕشی فەرەنسی كە حوكمێكی دیموكراتی بۆ فەرنسا هێنا كایەوە و بیر و باوەڕی نەتەوەیی و عیلمانی و رزگاربوون لە حوكمی تاكە كەسیی هێنا و، هەروەها بە بزوتنەوەی نەتەوەییی ئیتالی كاریگەر بوو كە (ماتزینی) سەركردایەتیی یاسا و خانەكانی دەكرد.

لەو كاتەدا سوڵتان (عبدالعزیز بن محمود)ی دووەم كە مامی سوڵتان (عبدالحمید) بوو حوكمی دەوڵەتی عوسمانیی دەكرد. سەرۆكایەتی وەزیرانی ئەوكاتە لەنێوان دوو وەزیر (عالی، فؤاد)دا بوو، ئەوانە هەردووكیان ئارەزوویان لە بەكارهێنانی فشاری ڕامیاری بوو لە فەرمانڕەوایی لە كاتێكدا دەوڵەتی عوسمانی لە ئەنجامی كزی و دارمانی گەلێ پارچەی لە خاكەكەی لە دەست چوو بوو: ناوچە مەسیحیەكانی وەكو: (رومانیا و جبل الاسود و الصرب) لە نێوان ساڵانی ١٨٦٠-١٨٦٤ لە ململانێی وەرگرتنی سەربەخۆیی دا بوون و دەست تێوەردانی دەوڵەتە ئەوروپییەكان لە كاروباری دەوڵەتی عوسمانی ئاشكرا بوو، بەتایبەتی ئەم دەوڵەتانە بار و زرووفی دیانەكانی دەوڵەتی عوسمانییان كردبووە بیانووی دەست تێوەردانیان.

لەم بارودۆخە و بەتەواوی لە ساڵی ١٨٦٥ شەش گەنجی عوسمانیی ڕۆشنبیر بە دزییەوە لە باخێكی دەوروبەری ئەستەمبوڵ بەناوی (غابة بلغراد) باسی هەندێ بابەتی ڕامیاری دەكەن و دێنە سەر ئەوەی كە كۆمەڵەیەكی نهێنی لەسەر شێوازی كۆمەڵەی (أیطالیا الفتاة) كە زەعیمی ئیتالی (ماتزینی) لە ساڵی ١٨٣١ دایمەزراند بە مەبەستی یەكێتی ئیتالی لەژێر سایەی كۆماریدا، دابمەزرێنن.

ناویان لەو كۆمەڵەیە نا (اتفاق الحمیة)، یەكێ لەو گەنجانە (نامق كمال)ی شاعیر بوو

کە زۆر ناوبانگی دەرکرد. ئەندامانی (اتفاق الحمیة) ڕێك کەوتن لەسەر دژایەتیکردنی سیاسەتی هەردوو وەزیران (عالی و فؤاد) و لایان وابوو کە ئەم دووانە لە پێویست زیاتر ملیان بۆ دەوڵەتە ئەوروپیەکان کەچکردووە، لەگەڵ ئەمەش و سەرەڕای ئەوەی کە ئەم دوو وەزیرە پێشکەشیان کرد دەوڵەت هەر بەرەو دارمان دەچوو. ئەم گەنجانە بینیان کە ئەم دوو وەزیرە فشارێکی ڕامیاری زۆر دەخەنە سەر هزر و ڕۆژنامەکان لە ناوەوە. ڕۆژنامەگەری بە واتا نوێیەکەی تازە لە ولات پەیدا بوو بوو، بۆچوونی ئەم گەنجانە وابوو کە پێویستە گەل مافە ڕامیارییەکانی خۆی بزانێ و بەدەستی بێنێ، نارەزووکردنی گەلە مەسیحیەکان لەسەربەخۆیی هیچ پاساوێك ناداتە دەوڵەتە بێگانەکان کە بەبیانووی یارمەتیدانی کەمینە ئایینیەکان دەست بخەنە کاروباری دەوڵەتی عوسمانییەوە.

بەم ڕێگەیە گەل دەتوانێ "توانا ڕامیارییەکانی خۆی دەستنیشان بکا. " و لە ئەنجامدا فشاری ڕامیاریی هەردوو وەزیرەکە لەسەر ڕۆشنبیرە عوسمانییەکان نامێنێ.

واتای ئەم بزووتنەوەیە بریتیە لە باوەڕهێنانی گەنجەکان بە ململانێ لە یاسایەکی ڕامیاریی دیموکراسی و ئینجا ڕزگارکردنی دەوڵەتە لەو بارە نالەبارەی کە گەیشتووەتێ.[1]

وا ڕێکەوت کە میری میسری (مصطفی فاضل) بەهۆی ناتەبایی لەگەڵ (فؤاد پاشا) و نارەزووی میر کە بچێتە سەر عەرشی میسر و رازی نەبوونی دەوڵەتی عوسمانی لەسەر ئەمە- بەرەو پاریس چوو بۆ ئەوەی لە تاراوگە ژیانێکی خۆش رابوێرێ و لەوێ هەندێ نامەی بەزمانی فەڕەنسی بلاو کردەوە بەمەبەستی ئەوەی خۆی وا دەربخات کە یەکێکە لەوانەی داوای دەستوور دەکەن لە دەوڵەتی عوسمانی. لە یەکێ لە نامەکانی بە زمانی فەڕەنسی خۆی وا نیشان دا کە نوێنەری پارتی (ترکیا الفتاة)ە، ئەم ناوە سەرسوڕمانێکی لە کۆمەڵگا ئەوروپییەکان پەیداکرد و ناوی پارتی (ترکیا الفتاة) لە ئەوروپا بلاوبوویەوە.

سێ ڕۆژنامەوانی شۆڕشگێڕی عوسمانی (نامق کمال و محمد ضیا و علی سعاوی) گەیشتنە لای (مصطفی فاضل)ی میری میسری لە پاریس و دامەزراوێکیان بەناوی

---

١ آق شین، المرجع السابق.

کۆمەڵەی (عوسمانییە نوێیەکان) پێکهێنا. دیارترین کەسێتیەکانی کۆمەڵەی عوسمانییە نوێیەکان ڕۆژنامەوان و شاعیر و ئەدیب بوون و لە سەرووی هەموویانەوە (نامق کمال و علی سعاوی).

## ١-نامق کمال:

شاعیر و ڕۆژنامەوان و نووسەر و مێژوونووسێکی عوسمانی بوو، ڕۆشنبیرییەکەی ئیسلامی بوو، هەروەها کاریگەریی فەیلەسووفەکانی شۆڕشی فەرەنسی وەکو (روسو) لەسەر بوو. ژیانێکی ئەدەبیی فراوان و بۆ ماوەی چوارەکە سەدەیێك نووسینی هەبوو.

لە نووسینەکانیدا بەدیار دەکەوێ کە هەوڵی وەڵامدانەوەی سێ پرسیار دەدات:

١-هۆیەکانی دواکەوتنی دەوڵەتی عوسمانی چین؟

٢-ئەو ڕێگایانە چین کە بە هۆیانەوە دەتوانین ئەم دواکەوتنە راگرین؟

٣-ئەو چاکسازییە پێویستانە چین کە دەبێ لەم ڕێگەوە بکرێن؟

دەتوانرێ وەڵامەکانی (نامق کمال) لەم سێ خاڵە سەرەکیە کۆ بکرێنەوە:

١-هۆیەکانی دواکەوتنی دەوڵەتی عوسمانی هۆی ڕامیاری و ئابوورین.

٢-پەروەردە دەتوانێ ئەم دواکەوتنە رابگرێت.

٣-چاکسازیی سەرەکی کە دەبێ بکرێ دامەزراندنی یاسای دەوڵەتێکی مەرکەزیی دەستوورییە.

(نامق کمال) فەرمانی ڕێکخراوەکان وەکو دەستووری دەوڵەت دادەنێ لەسەر شێوازی ئەورووپی و ڕەخنە لە بزووتنەوەی ڕێکخراوەکان دەگرێ و دەڵێ: فەرمانی ڕێکخراوەکان دەستورێکی هاوچەرخانەیە، یاسایەکی وای نەهێناوە خەڵکی لێیڕازی بن. ڕێکخراوەکان هەر ئەوەیان کرد کە هەرسێ دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادیان لەدەستی سەرۆك وەزیران کۆ کردەوە.

(نامق کمال) رای وایە کە بزووتنەوەی ڕێکخراوە عوسمانییەکان لەبریتی دەسەڵاتی سوڵتانەکان، واتا: سەرۆك وەزیر و وەزیرەکان دانراوە، بۆیە ئەو یاسایانەی کە ڕێکخراوەکان هێنایان لە یاسای کۆنی عوسمانی کەمترە، بۆیە ڕێکخراوەکان نەیانتوانی

بزووتنەوەیەکی ئابووری لە دەوڵەت بەرپا بکەن.

ئەم ڕێکخراوانە دەرگایان بۆ دەوڵەتە ئەورووپییەکان خستە سەر گازی پشت تا دەست لە کاروباری ناوەخۆی دەوڵەتی عوسمانی وەربدەن، ئەمەش لە ئەنجامدا نێوانی ئەو گەلانەی تێکدا کە لە دەوڵەتی عوسمانی بە یەکێتی دەژیان، ڕێکخراوەکان بەبۆچوونی نامق کمال- هیچ یاسایەکی فەرمانڕەوایان دانەنا کە نوێنەرێتی ویستی گەل بکات.

ئەگەر گەلی عوسمانیی توانیبای یاسایەك دابمەزرێنێ کە نوێنەرێتی گەل بکات، دەتوانرا پەیوەندیی ئابووری نوێ لەگەڵ دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان ببەسترێت و دەستەبەریی پێشکەوتنی ئەم گەلەی دەکرد و لە ئەنجامدا پێشدەکەوت.

(نامق کمال) بۆ یەکەم جار باسی هزری مافە سروشتیەکانی کرد کە بنچینەی فەلسەفیی ژیاری ڕۆژئاوایی هاوچەرخە.

(نامق کمال) لە نووسینەکانی هەوڵ دەدا بیسەلمێنێ کە جیاوازی نییە لە نێوان شەریعەتی ئیسلامی و یاسای (مشروطي) واتا: دیموکراسی، دان نان بە یاسای نوێنەرایەتی چاولێکردنی یاسا ڕۆژئاواییەکان نییە و یاسای دیموکراسی نوێنەرایەتی- بەهۆی پێکهاتەی- بەپێی بار و زرووفی کۆبوونەوەی میللەت و حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلامی دەتوانێ گۆڕانی بەسەردا بێت.

(نامق کمال) پرۆژەیەکی بۆ دەستووری عوسمانی پێشکەشکرد کە جیاوازی لەگەڵ ئەو دەستوورەی ڕاگەیەنرا بوو نەبوو تەنیا لە دوو خاڵ نەبێت. بەڵام دەبێ بگوترێ: کە پرۆژەکەی (نامق کمال)-کە پێشکەشی مەدحەت پاشای کردبوو- بە دەستووری فەرەنسی (دەستووری ناپلیۆنی سێیەم ساڵی ١٨٥٢). کاریگەر بوو و (نامق کمال) بینی کە ئەمە تەواو لەگەڵ باروزروفی ئەوکاتەی دەوڵەتی عوسمانی دەگونجێ. دوای ئەوەی بەراوردی یاسا دەستووریەکانی ئینگلتەرا و فەرەنسا و بەلجیکای کرد ئینجا ئەمەی گوت. (نامق کمال) پێشنیازی ئەم ئەنجوومەنانەی خوارەوەی بۆ دەستووری یەکەمی عوسمانی کرد:

١-ئەنجوومەنی ڕاوێژی دەوڵەت: بەمەرجێ دەبێ لە-بە بۆچوونی نامق کمال- پەنجا ئەندام پێکهاتبێ. ئەم ئەنجوومەنە پرۆژەی یاسایەکان ئامادە دەکات و

ئەنجوومەنێکە دەتوانێ بڕیاری پێویست وەرگرێ بۆ جێبەجێکردنی یاساکانی کارگێڕی.

٢-**ئەنجوومەنی ڕاوێژی میللەت:** ئەو پرۆژە یاساییانە دادەنێ کە ئەنجوومەنی ڕاوێژی دەوڵەت ئامادەی دەکات، هەروەها ئەنجوومەنی ڕاوێژ چاودێری بوودجەی دەوڵەت دەکات.

٣-**ئەنجوومەنی پیاوماقوولان:** ئەم ئەنجوومەنە دەستەبەریی پاراستنی دەستوور و مافەکانی گەل دەکات و نێوانی ئەنجوومەنی یاسادانان و دەستەی جێبەجێکردن دەسازێنێ و تەسدیقی جێبەجێکردنی ئەو یاسایانە دەکا، کە بەشێوەیەکی گونجاو ئەم بارانە ڕێك دەخات.

نامق کمال وای دەبینی کە ئەم ئەنجومەنانە-ئەگەر دابنرێن- حکومەت لە بەڕێوەبردنی تاکەکەسی بەدور دەخات و مافەکانی گەل دەپارێزێت.

لەگەڵ ئەمەش (نامق کمال) بەرگریی لە بیرۆکەی دامەزراندنی یاسایەکی مەرکەزیی بەتین دەکرد و بنەمای پێکهاتنی یاسایەکی یەکگرتووی فیدراڵی لە دەوڵەتی عوسمانی ڕەد دەکردەوە و پێی وابوو کە دامەزراندنی ئەم جۆرە یەکگرتنە لەوانەیە یەکێتیی دەوڵەتی عوسمانی بپچڕێنێ.[١]

پەیوەندی نێوان سوڵتان (عبدالحمید) و (نامق کمال) سەرەڕای دژایەتیی بیروبۆچوونیان لە بارەی کێشەی دەستوورەوە پەیوەندییەکی باش بوو. سوڵتان وای بۆ دەچوو کە هێزی سەربەستی و دیموکراسی بە واتای ڕۆژئاوایی لەسەردەمی خۆی نەخراوەتە ڕوو، بەڵام (نامق کمال) ئەم هزرەی لا پێویست بوو.

هەر کە سوڵتان ناچار بوو کە (مدحت پاشا) لێ بخات، (نامق کمال) بە ئاشکرا بەمە ڕازی نەبوو، سوڵتان زانیی کە (نامق کمال) لە هەوڵی دابەزاندنی سوڵتانە لەسەر عەرش. لەبەر ئەوەی (نامق کمال) هاوڕێی (مدحت پاشا) بوو و کاریگەری بەسەر کۆمەڵگادا هەبوو، سوڵتان ویستی بەهۆی وەزیفەیەك لە ئەستەنبۆڵی دوور بخاتەوە،

١ نیازی برکس، المعاصرة في ترکیا، صفحات: ٢٨٣-٢٨٤ و ٢٨٩ و ٢٩١ و ٣٠١.

نامق) ئەمەی ڕەد کردەوە و گرتیان و پێنج مانگ و نیو بەند کرا. دوای ئەوەی لە دادگایەکی تردا دادگایی کرا بەردرا و پاکانەی بۆکرا. بەڵام دەوڵەتی عوسمانی بڕیارێکی دەرکرد کە (نامق کمال) لە دوورگەی (میدیللی) بەدەست بەسەری بژی بە مووچەی پێنج هەزار قرۆشی عوسمانیی. (نامق کمال) قینی لە سوڵتان (عبدالحمید) هەڵنەگرت و سوڵتانیش نیازی پاك بوو بەرامبەر (نامق کمال).[1]

سوڵتان (عبدالحمید) دانی پێدا دەنێ کە نامق کمال- "مرۆڤێکی زۆر دڵسۆز بوو." و "خانەوادەی عوسمانیی زۆر بە مەزن دەزانی."، بەڵام سوڵتان لە بارەی (نامق کمال)ەوە دەڵێت:

"کمال بگ لە نێوان کۆمەڵێ کەس کە ناویان لەخۆیان نابوو (عوسمانییە نوێیەکان) زیاتر سەرنجی بۆ لای خۆی کێشکرد. مرۆڤێکی زۆر شڵەژاو بوو، ژیانی خێزانیی لەگەڵ ژیانی تایبەتی نەدەگونجا، هەروەها ژیانی قەڵەمیی لەگەڵ ژیانی هزریی ڕێك نەدەکەوت. دەتوانیی جەخت لەسەر ئەوە بکەیت کە مرۆڤێك دەتوانێ کارێ بکا یاخود ناتوانێ، بەڵام ناتوانی لە بارەی (کمال بگ) هیچ بڕیارێ بدەی، چونکە خۆی خۆی نەدەناسی. دەتوانی بڵێی: ئەو یەکێکە لەو دەگمەنانەی کە لەناو دوو ژیانی تێکەڵ دەژی، هەر ژیانێ لەویدی جودایە بەپێی سروشتی، ئەوانەی لە نزیکەوە دەیناسن، دەزانن ئەو هەر کە پەیوەندی لەگەڵ سەرای چاکبوو و مێژووی عوسمانیی نووسی، هەر کە ئەم پەیوەندیە تێکچوو بەم گوتەیە سەری ئەژدیهای بڕی (ئەوەی لە خزمەتکردنی ڕاوچیەکی بێ ویژدان دڵنیایە سەگە). مرۆڤێکی ڕاڕابوو، لەوانەیە مرۆڤێکی زۆر دڵسۆز بووە، بە چەند کاتژمێرێ دەتوانی وای لێ بکەی وەکو تۆ بیربکاتەوە و بەڵام ناتوانی بزانی چەند کاتژمێر یا چەند ڕۆژ ئەم هزرە هەڵدەگرێ. ".[2]

لێرەدا سوڵتان ئاماژە بەوە دەکا کە (نامق کمال) هەر کە پەیوەندی لەگەڵ کۆشکی سوڵتانی چاکبوو بەشانازییەوە مێژووی عوسمانیی نووسی و هەرکە لەگەڵ کۆشکی سوڵتانی ناتەبا بوو بەشیعرێکی داشۆرین هێرشی کردە سەر سوڵتان (عبدالحمید).

---

١ مصطفی خالد ایللي، نامق کمال، استانبول، ص٣٥.

٢ المذکرات،ص٤٧.

## ٢-علی سعاوی:

هەروەها (علی سعاوی)ش لـە کۆمـەڵی عوسمانییـە نوێیەکانـە و نووسـەرێکی فـرە زانیاریی سەردەمی ڕێکخراوەکانە و هاوڕێی (نـامق کمـال)ی شـاعیر و (ضـیا پاشـا) و ئەوانیدیی ئەم کۆمەڵەیە، (علی سعاوی) لە برادەرەکانی جودایە، چـونکە ئـەوان زیـاتر گرنگییان بە نووسین دا، بەڵام ئەو گرنگیی بە بزووتنـەوەی زانسـتی دا لـە پیـادەکردنی هزرەکانی.

(علی سـعاوی) گـەلێ لـە نووسـینەکانی بـەبیری یـەکێتیی ئیسـلامی و هاوشـانی هاولاتیە عوسمانییەکان نووسیووە، بەڵام لە گـەورە نووسـەرە نەتەوەییـە نیشـتمانیەکان دەژمێردرێ، بەڵکو هەندێ مێژوونووسی ئەدەبی عوسمانی لە چینی یەکـەمی نەتەوەییـە تۆرانییەکانی دادەنێن بەپێی جۆری نووسینەکانی.

(علی سعاوی) لـە ژیـانی نووسـین و ئـەدەبیی چـالاك بـووە، هـەروەها لـە ژیـانی ڕامیاریشی، ئەو یەکێك بووە لە نووسەرەکانی سەردەمی ڕێکخراوەکان، بەڵام لە بـارەی کۆمەلایەتییەوە لە هاوڕێکانی جودا بووە، چونکەن ئەو بەتـەنیا لـەو سـەردەمەدا سـەر بەخانەوادەیەکی هەژار بووە. لە بواری پەروەردە کاری کردووە، هەروەها لە مزگەفتەکان ئامۆژگاریکەر بووە و لە گەلێ لە ولاتەکانی دەولەتی عوسـمانی گـەڕاوە و لـە ئـەنجامی توانایەکەی لە ئامۆژگاری و دووان ناوبانگی دەرکردووە. لە ساڵی ١٨٦٦ هـەر کـە لـە ڕۆژنامەی (مخبر)ی دەنووسی کە لە ئەستەنبۆڵ دەردەچـوو خـەریکی کاروبـاری ڕامیـاری بوو، وتارەکانی لە بارەی ململانێـی هزرەکـانی سەربەسـتی بـوو، ئەمـەش بـووە هـۆی دوورخستنەوەی بۆ شاری (قسطمونی).

بەڵام میری میسری (مصطفی فاضل پاشا)-کە لە پاریس بوو- بۆ (علـی سـعاوی)ی نووسی-چونکە یەکێك بوو لە عوسمانییە نوێیەکان- کە یارمەتی بدات. (علـی سـعاوی) لە شاری (قسطمونی)یەوە بەرەو ئەوروپا هەلات و لە لەندەن بەیاریـدەی مـیر (مصـطفی فاضـل) ڕۆژنامەی (مخبر)ی دەرکرد، بەو پێیەی کە مـیر پـارێزەری کۆمـەڵی عوسمانییـە نوێیەکانە. میر مووچـەیەکی مانگانـەی بـۆ بڕیـەوە بـەبڕیی (١٥٠٠) فرەنـك، یەکـەم ژمارەی (مخبر) لەوێ لە ٣١ ئوگستۆسی ١٨٦٧ دەرچوو.

(علی سعاوی) لە ئەوروپا لەگەڵ هەردوو برادەری (نامق كمال و ضیا پاشا) ڕێك نەكەوت، كۆمەڵەی بەجێهێشت و لە پاریس ڕۆژنامەی (علوم)ی دەركرد، ئینجا لە شاری لیۆنی فەڕەنسی ڕۆژنامەی (مؤقتا)ی دەركرد و لە ساڵی ١٨٧٦ گەڕایەوە ئەستەنبۆڵ. سوڵتان (عبدالحمید) لە كتێبخانەی سوڵتانی دایمەزراند بەناوی (حافظ كتب)، لەم ماوەیەدا (علی سعاوی) دژی هەردوو هاوڕێی خەباتی (مدحت پاشا و نامق پاشا)ی نووسی. ئینجا (علی سعاوی) كرایە بەڕێوەبەری گرنگترین دامەزراوی ئاوارەیی لە ئەستەنبۆڵ كە قوتابخانەی (غالاطە سرای) سوڵتانی بوو، بەڵام لەم پلە و پایەیە لادرا و دەڵێن: ژنە ئینگلیزەكەی-كە سەربەست بوو- ڕۆڵی هەبوو لەم دەركردنە.

(نامق كمال) قینی لە (علی سعاوی) بوو لە قەسیدەیەكی داشۆرین هێرش دەكاتە سەری و دەڵێ: "ئەو پیاوە بچووكەی كە پێی دەڵێن-علی سعاوی-، لە پاریس دەژی و مەدامی لە تەنیشتە و وامان دەزانی پیاوە."

* * *

دوای ئەوەی (علی سعاوی) لە بەڕێوەبەرێتیی قوتابخانەی (غالاطە سرای) سوڵتانی لادرا ئومێد بڕ بوو لەوەی، كە سوود لە سوڵتان (عبدالحمید) ببینێ، بزووتنەوەیەكی تیرۆریستی دژی سوڵتان (عبدالحمید) پێكهێنا و (٥٠٠) كۆچەرە بەلقانییەكانی ئەستەنبۆڵی كۆ كردەوە و هێرشی كردە سەر كۆشكی (جیراغان)، سوڵتان (مراد)ی لادراو لەو كۆشكە دا بوو، پلانەكەی (علی سعاوی) وابوو كە بەم كۆچەرانەوە هێرش بكەنە سەر كۆشك و (مراد) لە كۆشك دەربێنن و لەبریتیی سوڵتانی شەرعی (عبدالحمید) بیكەنە سوڵتان.

بەڵام لە سەرەتای هێرشەكە دەوڵەت توانی بیكوژێنێتەوە و (حسن پاشا)ی سەرۆكی سەربازییەكە (علی سعاوی)ی بەدار كوشت لە ساڵی ١٨٧٨ع.[1]

## ب-كۆمەڵەی یەكێتی و پێشكەوتن (الاتحاد و الترقی):

دوای ئەوەی سوڵتان (عبدالحمید) بینیی كەوا كۆمەڵەی عوسمانییە نوێیەكان بەردەوام

---

١ نهاد سامی بانارلی، تأریخ الادب الترکیی المصور، ج٢، ص١٠٧٢/١، أستانبول ١٩٧١.

فشاری دەخەنە سەر بۆ قبووڵ كردنی بیروبۆچوونەكانیان و ناچاریان كرد كە بچێتە ناو جەنگی عوسمانی-ڕوسی، سولتان هەولێدا كە ئەندامانی ئەم كۆمەڵەیە لێك دوور بخاتەوە. سەرەتا گەورەكەیانی دوورخستەوە كە (مدحت پاشا)ی سەرۆك وەزیران بوو، یەكسەر دوای ئەمە دوو پیلان لە سولتان كرا بۆ لادانی، یەكێكیان: بە سەرۆكایەتیی (علی سعاوی) كە یەكێ بوو لە ئەندامەكانی ئەم كۆمەڵەیە، ئەویتر ماسۆنی بوو كە كۆمەڵەی كلانتی سكالیری- عزیز ئەنجامی دا.

هەردوو پیلانەكە لە لایەن ئینگلتەراوە پشتگیری دەكرا و هەردووكیشیان پووچەڵ بوونەوە، بەڵام كارێكی گەورەیان كردە سەر سولتان و چاودێرییەكی توندی خستە سەر ئەو هزرانەی كە لە دەرەوەڕا دێن و چاودێریشی خستە سەر هەڵگری ئەم بیرانە. هەر لەو كاتەدا خانەیەكی نهێنی لە قوتابیانی قوتابخانەی جەنگی لە ئەستەنبوڵ پێكهات، كە خاوەنی هزری نوێبوون و مەبەستیان دژایەتیكردنی فەرمانڕەواییی سولتان (عبدالحمید) بوو، بەڵام زانیاری لە بارەی ئەم خانەیەوە كەمە و بزووتنەوەی ئەم قوتابیانەش پێش هەردوو پیلانە ناوبراوەكە كەوتبوون.

یەكێ لە ئەندامەكانی كۆمەڵەی (كلانتی- عزیز بگ)ی ماسۆنی (علی شفقتی بگ) توانی هەڵێتە (ناپۆلی) و لەوێوە بۆ جنێڤ، ئینجا لە نێوان ساڵانی ١٨٧٩-١٨٨١ ڕۆژنامەیەكی دژی فەرمانڕەواییی عوسمانیی دەركرد بەناوی (استقبال) بەواتای: دوا ڕۆژ.

ڕێكخراوێكی قوتابیانەی نهێنی لە ساڵی ١٨٨٩ لە قوتابخانەی سەربازیی پزیشكی لە ئەستەنبوڵ دامەزرا، مامۆستایەكان هەندێكیان هانی قوتابیەكانیان دەدا كە دژایەتیی فەرمانڕەوایی عوسمانی بكەن و هزری عوسمانییە نوێیەكانیان لە نێوان قوتابیەكان بڵاو دەكردەوە.

قوتابیانی سەربازی پزیشكی ناویان لە ڕێكخراوە نهێنیەكەی خۆیان نا "الاتحاد العثمانی" و قوتابیە دامەزرێنەرەكانی (اسحق سكوتی و محمد رشید و عبدالله جودت و ابراهیم تیمو) كە دامەزرێنەر بوو.

(ابراهیم تیمو رومانی)-ڕۆمانیا بەشێك بوو لە دەوڵەتی عوسمانی- دەم نادەمێ لە ئەستەنبوڵەوە كە شوێنی خوێندنی بوو دەچۆوە وڵاتەكەی و بە ئیتالیادا ڕەت دەبوو و

نهێنی سەری لە گروپە ماسۆنییەکان دەدا و پێیان کاریگەر بوو.

گەرم و گوڕیی قوتابیـانی ڕێکخـراوی (الاتحـاد العثمـانی)ی نهێنـی گەیشـتە رادەی ئەوەی کە ڕۆژی ئاهەنگ گێڕان بەیادی سەد ساڵەی شۆڕشی فەڕەنسـی بکەنـە مێـژووی دامەزراندنی ڕێکخراوەکەیان.

ئامـانجی قوتابیـە ئەندامـەکانی (الاتحـاد العثمـاني)ی نهێنـی: دژایـەتیکردنی فەرمانڕەواییی سوڵتان (عبدالحمید) و دامەزراندنی دەوڵەتێك کە لەگەڵ هزری ڕامیاریی سەردەم بگونجێ و دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکانی وەکو ئینگلتەرا و فەڕەنسـا و ئـەڵمانیا ببنـە نموونە بۆی و داواکردنی دەستوور و سەربەستی و دیموکراسی.[1]

لە قوتابخانەی سەربازی پزیشکیەوە بیروباوەڕەکانی کۆمەڵەی یەکێتی عوسمـانیی بـۆ قوتابخانە باڵا جۆرا و جۆرەکانی دی ڕۆیشت و خانـەکانی ئـەم کۆمەڵەیـە وەکـو یاسـای کۆمەڵەی (الکاربوناری)ی ئیتالی نهێنی بوو.

کۆمەڵەکە نە لە بانگەشەکردنی بیروباوەڕەکانی بەپەلە بوو نـە لـە بزووتنـەوەی دژی دەسەڵات، بەڕادەیەك کە (أحمد رضا بگ) گەیشتە پلەی بەڕێوەبەری کارگێڕی مەعاریف لە ناوچەی بۆرسە و لە سـاڵی ١٨٨٩ بـەرەو پـاریس چـو و بـەیانووی ئامـادەبوون لـە پێشانگای پاریسـی نێـو دەوڵـەتی دا و گەیشـتە ئـەوێ و رایگەیانـد کـە ناگەڕێتـەوە وڵاتەکەی و شەش ساڵ لە فەڕەنسا مایەوە و هیچ دژایەتییـەکی وا بـەنموودی لێ تۆمـار نەکرا تا ئەو کاتە لە ساڵی ١٨٩٥ ڕۆژنامەی (مشورت)ی دەرکرد.

(إبراهیم تیمو)ی دامەزرێنەری کۆمەڵەی یەکێتی (الاتحاد) دەڵێ: (أحمد رضا بگ) تا سـاڵی ١٨٩٥ کاتـەکانی لـە دەرەوە ڕادەبـوارد بـۆ پەیـداکردنی ئەنـدامی نـوێ بـۆ بزووتنەوەکەی و پـەروەردەکردنیان بەشـێوەیەکی شۆڕشـگێڕی، کۆبوونـەوە نهێنیـەکانی ئەنجام دەدا و ئەو کارە ئەدەبییانەی دەخوێندەوە کە ئەندامەکانی کۆمەڵـەی عوسمانییـە نوێیەکان دایان دەنا وەکو (نامق کمال و ضیا پاشـا) و هـەروەها بڵاوکراوەکـانی (علـی شفقتی بگ)ی دەخوێندەوە کە ئەندامی کۆمەڵەی کلانیتی ماسـۆنی بـوو و هـەڵاتبووە ئەوروپا و بڵاوکراوەکانی ئێرانیە شۆڕشگێڕەکانی دژی حوکمی وڵاتەکەیانی دەخوێنـدەوە

١ آق شین، ص١٧.

کە لە لەندەنەوە دەگەیشتنە دەستی، (أحمد رضا) بەرەو کاری بزووتنەوەی ڕاستەوخۆی دژی دەوڵەتەکەی نەچوو.[1]

کۆمەڵەی یەکێتی ئەوکاتە بەرەو کاری بزووتنەوەی ڕاستەوخۆ هەنگاوی نا هەر کە کردەی ئەرمەنیەکان بەرەو زیادبوون چوو دژی سوڵتان (عبدالحمید) و کێشەی ئەرمەن شێوەیەکی ڕوونی بەخۆیەوە بینی لە سیاسەتی ناوەوە و دەرەوەدا.

لە ئەنجامی ئەو نامە ناردنە نهێنییانەی نێوان ئەندامانی کۆمەڵەی یەکێتیی عوسمانیی نهێنی لە ناوەوە کە پەلیان هاویشتبووە ناو زۆربەی دامەزراوە سەربازییەکان و نێوان (أحمد رضا بگ) لە پاریس کە نوێنەری شارستانییەکان بوو، ڕێك کەوتن کە کاری سەربازی و شارستانی دژی سوڵتان بکەنە یەك و متمانە بکەنە سەر کۆمەڵەی یەکێتی و پێشکەوتن بۆ هەردوو باڵی دژایەتیی سەربازی و شارستانی کە لە چوار چێوەی کۆمەڵەکەدا کار دەکەن.

ناوی کۆمەڵەکە لەناو سەربازەکان (یەکێتی عوسمانی) بوو، (أحمد رضا بگ)- نوێنەری باڵی شارستانی- بە بیروباوەڕی (أوگست کانت)ی فەیلەسووف کاریگەر بوو، دەستووری ئەم فەیلەسووفە ڕێکی و پێکی و پێشکەوتن (الانتظام و الترقي) بوو.

(أحمد رضا) وشەی (الاتحاد)یان بۆ خۆیان پاراست و هەموو ڕێك کەوتن کەناوی کۆمەڵەکە (الاتحاد و الترقی) بێت.[2]

خانەکانی یەکێتی و پێشکەوتن (لاتحاد و الترقی) لەناو یەکەکانی سوپادا پەلیهاوێشتبوو، هەروەها لە نێوان فەرمانبەرانی شارستانیی دەوڵەتدا، هەردوو لایەنی سەربازی و شارستانی دوای ڕێککەوتنی هەردوو باڵی سەربازی و شارستانی لە پاریس یەکیان گرت کە بە تەواوی دژی سوڵتان (عبدالحمید) دەست بەکار بن.

کۆمەڵەکە توانی لە ٢٤ی یۆلیۆی ١٩٠٨ سوڵتان ناچار بکا کە ئەو دەستوورە رابگەیەنێ کە پێشتر لە ساڵی ١٨٧٧ فەرمانی لەکاروەستانی دابوو.

١ ابراهیم تیمو، مذکراته، ص٩.

٢ آق شین، ص١٩.

ئینجا سوپا لە رۆمەڵییەوە کە ناوچەیەکی عوسمانییی ئەوروپیی بوو بەرەو ئەستەنبوڵ خشی و دەستی بەسەر داگرت و ئینجا سوڵتان (عبدالحمید)یان لادا و رژێمی میریی، پارتی یەکێتی و پێشکەوتن(الاتحاد و الترقی)یان دامەزراند.

دیارترین ئەندامەکانی کۆمەڵەی یەکێتی و پێشکەوتن ئەمانە بوون: (أحمد رضا بگ، طلعت پاشا، أنور پاشا، دکتور ناظم، فیلسوف محمد ضیا کوك الب). ئەندامە سەربازییەکانی کۆمەڵەی یەکێتی و پێشکەوتن لەژێر کاریگەریی ئەڵمانیدا بوون.

هەردوو باڵی سەربازی و شارستانیی کۆمەڵەی یەکێتی و پێشکەوتن لەژێر دەسەڵاتی ماسۆنی دا بوون، زۆربەی ئەندامەکانی یەکێتی و پێشکەوتن لە گروپە ماسۆنیە هەمە جۆرەکان ئەندام بوون و هزری ماسۆنی کاری تێکردبوون، هەروەها دامەزرێنەری (الاتحاد و الترقی)ی یەکەم (ابراهیم تیمو) ماسۆنی بوو، ئەوەی شایانی گوتنە (أنور پاشا) ماسۆنی نەبوو.

ئەگەر (ئیبراهیم تیمو) یەکەم بەرهەڵستکاری رێکخەرە لە کۆمەڵەکە و دیارترین ناوی کۆمەڵەیە لە ماوەی دامەزراندنیدا، ئەوا دیارترین ناوی (اتحادی)یەکان لەدوا کاتی دژایەتییان و لەو کاتەی دەستیان بەسەر دەسەڵاتدا گرت ئەمانە بوون (طلعت پاشا) لە شارستانیەکان، (أنور پاشا و جمال پاشا) لە سەربازییەکان.

ئەوەی پێویستە بگوترێ: کۆمەڵەی یەکێتی و پێشکەوتنی عوسمانی بیروباوەڕە رۆژئاواییەکانی هەڵگرت کە دژی ئیسلام و هزری ئیسلامی بوون، بەڵام کە خەڵکی دەدواند لە روانگەیەکی ئایینیەوە بوو بۆ ئەوەی کاریان تێ بکات و لایەنگر پەیدا بکەن دژی سوڵتان (عبدالحمید) و لەمەشدا سەرکەوتن.

کۆمەڵە لە راگەیاندنەکانی بۆ عوسمانییەکان دەڵێت: "ئەی عوسمانییەکان، مەبەستمان ئاسایشی دەوڵەت و خەلیفایەتییە، هیچ کەسێ نییە ئەمە نەزانێ. " و "بە یارمەتیی خوا و هیمەتی برایەکان. " و "ئەی موسڵمانەکان! بەسیە تاکەی هەر سەیری سوڵتانێکی زۆرداری بێ باوەڕ بکەین، کە قورئان دەخاتە ژێر پێیەکانی و هەروەها ویژدان و باوەڕ ورد و خاش دەکات. ". "وشیار بنەوە ئەی نەتەوەی محەمەد. " و "ئازابن ئەی موسڵمانەکان، ئازایەتی لە ئێمە و یارمەتی لە خوا، سەرکەوتن لای خواوەیە و

فەتح نزیكە. " و "ئەی موسڵمانی یەكتاپەرست! بەناوی خوای خۆت بخوێنە. " و "ئەی موسڵمانی یەكتاپەرست راپەڕە! ئاییندكەت و باوەڕەكەت لە دەستی زۆرداران رزگار بكە، نەفسی خۆت رزگار بكە! شەیتانێكی زۆرداری زەبر بەدەست لێرەیە، تاجێكی لەسەر سەرە و ئایین و باوەڕەكەتی لە دەستە، ئەی یەكتاپەرست ئایین و باوەڕەكەت رزگار بكە!. " "ئەی موسڵمانەكان سوڵتان (عبدالحمید)-بەپێی شەرع- سوڵتان نییە، خەلیفە نییە! ئەوەی باوەڕ بە قسەكەمان ناكا با سەیری قورئان و فەرموودەكانی پێغەمبەر ﷺ بكات. كۆمەڵەكەمان بە ئایاتی قورئان و فەرموودەكانی پێغەمبەر ﷺ فەرمانەكانی خوا و پێغەمبەریان ﷺ بۆ دەوڵەت و خەڵكی دەرخستووە، بەلاّم سوڵتان (عبدالحمید) ڕووی لە فەرمانەكانی خوا و پێغەمبەر وەرگێڕاوە و لە ئەنجامدا ستەمكاریەكەی دەركەوت و شەرم لەوە ناكا كە گازاندە لە خوا دەكات، بۆیە لەسەر گەلەكەمان پێویستە كە دژی سوڵتان پەنا بۆ چەك بەرێت، ئەگەر گەل ئەمە نەكات با بەرگەی تاوان و ستەمی سوڵتان (عبدالحمید) بگرێت. ".

هزری فەرمانڕەوایی كۆمەڵەی یەكێتی و پێشكەوتن (الاتحاد و الترقی) ماسۆنییە و دان بە ئایینەكان نانێ و، فەلسەفی دەستكردە (عەقلانیە و دین رەت دەكاتەوە) و، عەلمانیە (دین لە ژیان دوور دەخاتەوە). لەگەڵ ئەمەش شۆڕشگێڕە (اتحادی)یەكان ئایینیان بۆ دژایەتیكردنی سوڵتان (عبدالحمید) بەكارهێنا و بەناوی ئایین بۆختانیان پێكرد.[1]

---

١ م. لشكري، تركيا الفتاة و الاتحاد و الترقي، صفحات: ٤٣٧-٤٤٨-٤٦٥.

# پاشکۆ

## لە بارەی سوڵتان (عبدالحمید)ەوە گوتراوە

* سوڵتان (عبدالحمید) نموونەی پاکی و گرانی بوو، لەدوا ڕۆژدا مێژوو بەڕێزەوە ناوی دێنێ و بەزەییی پێدێتەوە.

**(إسماعیل حامی دانشمند)**
**مێژوونووسێکی بەناوبانگی تورکی**

* پڕ بە پێستی وشە مرۆڤێکی پاکبوو، چاوی لە ئابڕوو و سامانی کەس نەبوو.

**(رشید بەگ)**
**سکرتێر لە نووسینگەی سوڵتان (عبدالحمید) و یەکێ لە وەزیرە ناوەخۆیەکانی**

* لەکاتی خۆی نوێژەکانی دەکرد و زۆر قورئانی دەخوێندەوە و هاتوچۆی مزگەفتەکانی دەکرد.

**(شازادە عائشە کچی عبدالحمید)**

* بەدکار و زۆردار و بەرتیل خۆر نەبوو.

**(اللورد دبیکو نسفیلد) -وزرائیلی-**

* (عبدالحمید)ی دووەم یەکێکە لە گەورەترین ئەو کەسێتیانەی کە لە مێژوودا درۆی بۆ هەڵبەستراوە.

**(آت صز) نووسەرێکی تورکی**

* (عبدالحمید) چەوسێنەری ئیسرائیل.. دوژمنی ئیسرائیلە.

**ڕۆژنامەی -سلانیك-ی جوولەکە**

* ئەسەر كۆنگرەكانی جوولەكە پێویست بوو كە ڕووبەڕووی دەسەڵاتێكی تاكڕەویی تاكە كەسێك و چاوێكی یاخیبووی گوماندار ببێتەوە، ئەویش (عبدالحميد) بوو.

(ڕۆژنامەی –أورور–ی جوولەكە) بەبۆنەی
بەستانی كۆنگرەی نۆیەمی سەهیۆنی

* (عبدالحميد)!.. بكوژە گەورەكە.

(گلادستون)
سەرۆكی وەزیرانی بەریتانیا

* هەڵس و كەوتی سوڵتان (عبدالحميد) بەرامبەر بزووتنەوەی سەهیۆنی واتای ئەوە بوو كە دەبێتە هۆی لەناوچوونی تاج و عەرشەكەی.

حسام الدين أرتورك
(عەقید لە سوپای توركی)

* لە دیدگای منەوە (عبدالحميد) سوڵتانێكی زۆر فێڵباز و پیس بوو و بەقای (ثقة) بەكەس نەدەكرد.

هرتزل
سەرۆكی بزووتنەوەی سەهیۆنیزم

* هەڵس و كەوتی سوڵتان (عبدالحميد) بەرامبەر هیرتزل زیرەكانە بوو و ئەو هۆكارانەی دوورخستەوە كەوا لە ئەوروپا بكا كارێكی ترسناك لە وڵاتەكانی عوسمانی ئەنجام بدات.

بەڕێز جمال الدين أفغانی
(بانگخوازێ بوو لە بانگخوازەكانی یەكێتیی ئیسلامی)

* خوا ڕەحم بە (عبدالحميد) بكات، هیچ وەزیر و دەستوپێوەند و گەلێك لە ئاستی ئەودا نەبوون، بەپێش سەردەمی خۆی كەوتبوو، هێندە بە توانا و تێگەیشتی و ڕامیاری و دووربین بوو، بە تەنیا بە بلیمەتی و هەڵس و كەوتی لەگەڵ دەوڵەتان توانی سێیەكە سەدەیەك ڕووخانی دەوڵەت دوا بخات. ئەگەر

دەستوپێوەندی شیاو و میللەتێکی لەگەڵبوایە کە تێی بگەیشتبان ئەوا یەکەمین دەوڵەتی بەجێدەهێشت.

**سعيد الافغانی**

**(مامۆستایەکی زانکۆیی و نووسەر)**

* سوڵتان (عبدالحمید) گەورەی دانایان و پێشەوای سیاسەت مەداران و سەرکردەی میللەتان.

**(مصطفی کامل پاشا)**

**سەرۆکی بزووتنەوەی نیشتمانی لە میسر**

* لە ئەوروپا سوڵتان (عبدالحمید) بە پیاوی نەخۆش ناسێنراوە، لەو باوەڕەدام هێشتا حوکمێکی داد پەروەرانەی لەسەر نەدراوە.

**بسمارك**

**(سیاسەت مەداری ئەڵمانی)**

* هەر ساغ بیت میری باوەڕداران    رزگار بوونت، رزگاربوونی ئایینی پیرۆزە

**أحمد شوقی**

**(میری شاعیرانی عەرەب)**

* ئێمەی عەرەب بە گشتی و فەڵەستینیەکان بەتایبەتی مافی سوڵتان (عبدالحمید)مان لەسەرە کە باسی هەڵوێستە پیرۆزەکەی بکەین لە بزووتنەوەی سەهیۆنیزم، کە سەری بۆ دەوڵەتە داگیرکەرەکان دانەنواند و بستە خاکێکی فەڵەستینی پێ نەبەخشین سەرەڕای ئەو هەموو هەڵخەڵەتاندنە ماڵی و ڕامیارییە و بەهۆی فەڵەستینەوە عەرشەکەی لەدەست چوو.

**رفيق شاكر النتشه**

**(باڵیۆزی فەڵەستین لە ریاز)**

* لە سەردەمی سوڵتان (عبدالحمید) لوبنان و تیرەی مارۆنی بەهەزار خێر و دڵنیاییەوە ژیان.

**الياس الحويك**

**(بەتریرکی مارۆنی)**

* سولتان ئەو سیاسەتمەدارە بوو کە ئەوروپا و هەموو جیهان گەواهیی بۆ [illegible]ن کە لەهەموو کەسێ ژیرتر و زیرەکتر و وشیار تر و چالاکتر بوو.

**ڕۆژنامەی (المؤید)ی قاهیری میسریی**

* بە بۆچوونی من سولتان (عبدالحمید)ی دووەم، سەرەتا لەلایەن نووسەرە ئەوروپیەکانەوە ڕەخنەیەکی توند و تیژی لێگیرا بەهۆی سیاسەتە ئیسلامیەکەیەوە و قینیان لێی بوو، شان بە شانی ئەمانەش نووسەرە عەرەبەکان رقیان لە سولتان (عبدالحمید) و حوکمی عوسمانی بوو لە وڵاتی عەرەبی بە تایبەتی ڕۆژهەڵات، بۆیە دەتوانین بە سولتان (عبدالحمید) بڵێین: ئەو سولتانەی کە هەڵبەستەیان پێکردووە.

**د. محمود صالح منسیی**

**(مێژوونووسێکی عەرەبیی میسری)**

* ئەو بەزەیی بەیەکتری کردنەی کە لەسەردەمی سولتان (عبدالحمید)ی دووەم لە نێوان عەرەبی و تورکی زۆر بەتین بوو، لەسەردەمی یەکێتی و پێشکەوتن (الاتحاد و الترقی) گۆڕا و بووە دوورکەوتنەوە لە یەکتری.

**محمد جمیل بیهم**

**(مێژوونووسێکی عەرەبیی شام)**

* سولتانی غەزاکەر (عبدالحمید) خان، میری باوەڕداران و جێگری پێغەمبەر ﷺ: ئەو کەسەیە کە شانازی بەبوونی دەکەین و لە سێبەری دادپەروەریی دەحەسێینەوە.. هێشتا گەردوون پێی ڕووناکە، مانگ و ڕۆژ بەدەرکەوتنی بەختەوەرە، عەرشی خەلیفایەتیی ئیسلامیی پێ رازاوەتەوە، نەتەوەی عوسمانی شانازی بەشوێنەوارە مەزنەکانی دەکات.

**بەڕێز محمد عارف الحسینی**

**(ئیمامی شافیعیەکان لە شام)**

* که باسی فێرکردن و فێربوون کرا لەسەردەمی عبدالحمید- بە ناچاری دەبێ ڕاستی بڵێین و دانی پێدا بنێین کە: چەند پلەیەك بەرزتربوونەوە لەوەی کە هەبوون، هەموو عوسمانیەکان بەشێکیان لە زانست وەرگرت، لە زۆر ویلایەتەکانی عوسمانی ژمارەی خوێنەرە نووسەرەکان لە ژمارەی بێ سەوادەکان زۆرتر بوون.

سلیمان البستانی

(نووسەرێکی شامی)

* (عبدالحمید) لەوباوەڕەدا بوو کە بێ ئامادەکردن و پەروەردە بەخشینی سەربەستی بە نەتەوە زیانی پێدەگەیەنێ. بۆیە هەنگاوی چاکی ناو قوڵ و باسکی لێ هەڵکرد بۆ بنیاتنانی دامەزراوە ڕۆشنبیریەکان لە وڵاتدا.

سعدی بوراق

(نووسەر و سیاسەت مەداری تورکی)

* ئەگەر (عبدالحمید) لە فەرمانڕەوایی بەردەوام بوایە، میریی ئەنقەرە (بەسەرۆکایەتیی مصطفی کمال أتاتورك) دانەدەمەزرا.

سیر هنری وودز ١٩٢٤

(موشیر لە دەریاوانیی عوسمانیی)

* (عبدالحمید) دیپلۆماسییەکی مەزن بوو، چاك دەیزانی تا رادەیەکی زۆر سوود لەو رقەبەرییە وەربگرێ کە لە نێوان دەوڵەتە داگیرکەرەکان هەبوو، مەبەستیش دوور خستنەوەی وڵاتەکەی بوو لە مەترسیی جەنگ و بەجوانی پارێزگاریی پەیوەندییەکانی بە دەوڵەتە گەورەکانەوە دەکرد.

سیر هنری وودز

(موشیر لە دەریاوانیی عوسمانی)

* (عبدالحميد) زۆر چاپووك بوو، له هەموو وەزیرەكانی زێتر له كاركردندا توانـا و چالاكیی هەبوو، لەوپەڕی پلەی سیاسەتمەداریدا بـوو، زۆر بـه نایـابی كاروبـاری وڵاته فراوانەكەی عوسمانیی بەڕێوه دەبرد، له كاتێكدا ئەو دەوڵەته بـەرەو ڕووخـان دەچوو، سوڵتان هەوڵی چاكسازی و پێشكەوتنی دا.

الیزابیث ورملی لیتمر

(ژنه نووسەرێكی ئەمریكی)

* بەرزترین حەزی سوڵتان (عبدالحمید) لەوەدا بوو كه ببینێ موسڵمانەكان لـه سەربەرزی و بەختەوەری دانه و له دەور و بەری خەلیفایەتی كۆبوونەتەوە.

(مصطفی كامل پاشا)

(زەعیمێكی میسری)

* بەرادەیەك خاكسار(متواضع) و گران بوو كه سەرم لێی سـوڕمابوو، تـا ئـەو پەڕی پابەند بوو به ئایینەكەی، ئاگای له زانا و پیاوانی ئایینی هەبوو، به هـەموو بڕوایەكەوه دەتوانم بڵێم: ئەگەر عوسمانییەكان لەسەر ڕێگـای ئـەو بڕۆیشـتبان ئـەوا شكۆداری و هێزی پێشوویان بۆ دەگەڕایەوه و له بـواری ڕۆشـنبیری و ئـابووری لـه كاتێكی كەمدا دەگەیشتنه ئاستی دەوڵەته ئەورووپییەكان.

پرۆفیسۆر (ارمینیوس فامبری)

(ڕۆژهەڵاتناسێكی مەجەری)

* ئەمڕۆ ڕاستیەكی مێژووییه كه سوڵتان (عبدالحمید) فەرمانڕەوایـەكی خوێـن ڕێژ نەبوو.

رشاد أكرم قوجی

(مێژوونووسێكی بەناوبانگی توركی)

* ئەی سوڵتانی مەزن، بەبێ ئابڕوویی بوختانمان پێكردی.

دكتۆر (رضا توفیق)

گەورەترین بیریاری بزووتنەوەی (الاتحاد و الترقی)

* برووسكه، هەواڵه شوومەكەی پێمان گەیاند، ئەو هەواڵەی كه جـەرگی لـەت لەت كرد و جلی پرسەی لەبەر دڵان كرد، هەموو جیهانی ئیسـلامی و هینـد داخ و

کەسەی دایگرت، لەداخانا سینگ لەت لەت بوو، ئەو هەواڵە گەورەیەی کە ژانی دایە جیهانی ئیسلامی، هەواڵی لادانی سوڵتانی شکۆدار (عبدالحمید)ی دووەم لە عەرشی خەلیفایەتی و سوڵتانی.

**ڕۆژنامەی (الوطن)**
**(ڕۆژنامەیەکی هیندییە)**

* سەرەڕای ئەوەی کە سوڵتان (عبدالحمید) هێزێکی سەربازی مەزنی هەبوو و ئامادە بوو بەرگریی لیّ بکات، بەڵام جەنگ و کوشتاری نەخستە بەرچاوەکانی بۆ ئەوەی بەرگری لە عەرشەکەی بکات، ئەگەر ئەمەی بکردایە کەس نەیدەتوانی دایبەزێنی.

**سیر هنری وودز**
**(موشیر لە دەریاوانیی عوسمانی)**

* گوتمان: سوڵتان ستەمکارە، سوڵتان شێتە، گوتمان: هەر دەبیّ شۆڕش لەسەر سوڵتان بکریّ، بە گوتەی شەیتانمان باوەڕ کرد، وروژاین، ئاشووبی نووستوومان بە ئاگا هێنا، بەڵام ئەی گەورە سیاسەتمەداری سەردەم تۆ شێت نەبووی، بەڵکو ئێمە شێت بووین و نەمان دەزانی، هەر تەنیا شێت نەبووین، بەڵکو زۆڵ و شەڕفرۆش بووین و لە ئاکاری چاك بێبەش بووین.

**دکتۆر (رضا توفیق)**
**فەیلەسوفی (الاتحاد و الترقی)**

* ئەی جەمال دەزانی دەردی ئێمە چیە!؟ کودەتامان کرد و ئێمە ئامێرێکی دەستی سەهیۆنیزم بووین و بەوەمان نەدەزانی. گێژ و وێژ بووین.

**أنور**
**(لە گەورە شۆڕشگێڕانی دژی سوڵتان عبدالحمید)**

# سالنامەی ڕووداوە دیارەکان
# لەسەردەمی سوڵتان (عبدالحمید)دا

| کۆچی | عیسایی | |
|---|---|---|
| ١٢٥٥ | ١٨٣٩ | ڕاگەیاندنی فەرمانی ڕێکخراوەکان. |
| ١٢٥٨ | ١٨٤٢ | لەدایکبوونی سوڵتان (عبدالحمید). |
| ١٢٧٩ | ١٨٦٣ | سەردانی (عبدالحمید) بۆ میسر. |
| ١٢٨٤ | ١٨٦٧ | سەردانی (عبدالحمید) بۆ ئەوروپا. |
| ١٢٩٣ | ١٨٧٦ | هاتنی سوڵتان (عبدالحمید) بۆ سەر عەرش. |
| | | بوونی (مدحت پاشا) بە سەرۆك وەزیران. |
| | | ڕاگەیاندنی یەکەم دیموکراسی و (مشروطیة) و کردنەوەی ئەنجوومەنی (المبعوثان). |
| | | کۆنگرەی تەرسانە. |
| ١٢٩٤ | ١٨٧٧ | لادانی (مدحت پاشا) و دوورخستنەوەی بۆ دەرەوەی وڵات. |
| | | ڕاگەیاندنی جەنگ دژی دەوڵەتی عوسمانی لە لایەن ڕوسیای قەیسەرییەوە. |
| | | ئاگربەستی ئەدرەنە لە نێوان ڕوس و عوسمانی دا. |
| | | لەکارخستنی ئەنجوومەنی (المبعوثان). |
| | | ئاشتبوونەوەی نێوان ڕوس و عوسمانییەکان. |
| | | پووچەڵ بوونەوەی پیلانی (علی سعاوی) لە لابردنی سوڵتان (عبدالحمید) دا. |

| | | |
|---|---|---|
| | | پووچەڵ بوونەوەی پیلانی کۆمەڵەی کلانتیی ماسۆنی لە لابردنی سوڵتان (عبدالحمید) دا. |
| | | ڕێککەوتننامەی عوسمانی-ئینگلیزی دژی ڕوسیا. |
| | | مۆرکردنی پەیماننامەی قوبرس. |
| | | مۆرکردنی پەیماننامەی بەرلین. |
| ١٢٩٨ | ١٨٨١ | تونس دەکەوێتە ژێر پارێزگاری فەرەنسی |
| | | کردنەوەی لێکۆڵینەوە لە کوشتنی سوڵتان (عبدالعزیز)دا. |
| | | تاوانبارکردنی (مدحت پاشا) و دەست و پێوەندەکانی لە کوشتنی سوڵتان. |
| | | حوکمی لە سێدارە دانی (مدحت پاشا). |
| | | سوڵتان (عبدالحمید) حوکمەکە سووك دەکا لە سێدارەدان بۆ بەندی هەتا هەتایی. |
| | | وامەکانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ نیوە دادەبەزێ. |
| | | بڕیاری (محرم) و پێکهێنانی دەستەی وامە گشتییەکان. |
| ١٢٩٩ | ١٨٨٢ | کەشتی جەنگی ئینگلیزی بەبۆمبا لە ئەسکەندەریە دەدا. |
| | | داگیرکردنی میسر لە لایەن ئینگلتەراوە. |
| ١٣٠١ | ١٨٨٤ | خنکانی (مدحت پاشا) لە بەندیخانەی تائین. |
| ١٣٠٢ | ١٨٨٥ | رۆمەڵی ڕۆژهەڵات بەگەڵ بولگاریا کەوت. |
| ١٣١٢ | ١٨٩٤ | عەرد لەرزینێکی گەورە لە ئەستەنبوڵ. |
| ١٣١٣ | ١٨٩٥ | ئاشووبی دووەمی ئەرمەن=هێرشکردنە سەربانقێك |

| | | لەئەستەنبۆل |
|---|---|---|
| ١٣١٤ | ١٨٩٧ | راگەیاندنی جەنگ لەسەر یۆنان و پەرەسەندنی. |
| ١٣١٥ | ١٨٩٧ | ئاشتبونەوە لە نێوان عوسمانی و یۆنان. |
| | | دوورگەی کریت سەربەخۆیی خودی وەردەگرێ. |
| ١٣٢٠ | ١٩٠٢ | مەقدۆنیا دەست بەیاخیبوون دەکات. |
| ١٣٢١ | ١٩٠٣ | دەستپێکردنی یاخیبونە گەورەکەی مەقدۆنیا. |
| | | ئەنجامدانی هەندێ چاکسازی لە مەقدۆنیا. |
| ١٣٢٢ | ١٩٠٤ | مردنی سولتان مرادی پێنجەم. |
| ١٣٢٣ | ١٩٠٥ | ڕووداوی قونبەلە و پووچەڵ بوونەوەی هەوڵدانی کوشتنی سولتان (عبدالحمید). |
| ١٣٢٤ | ١٩٠٦ | هەڵکردنی کێشەی عەقەبە و جەختکردن لەسەر بەمیسری بونی (طابا). |
| ١٣٢٤ | ١٩٠٦ | دەستپێکردنی سیاسەتی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی دژی سیاسەتی کۆمەڵگای ئیسلامی |
| ١٣٢٦ | ١٩٠٨ | راگەیاندنی دیموکراسی (مشروطیة) دووەم. |
| | | لکاندنی بۆسنە-هەرسك بە نەمسا. |
| | | سەربەخۆیی بولگاریا. |
| | | لکاندنی دوورگەی کریت بە یۆنان |
| ١٣٢٧ | ١٩٠٩ | کردنەوەی ئەنجوومەنی (المبعوثان) |
| | | روداوی ٣١ مارت (١٣=نیسان= ٢٢ رەبیعی یەکەم). |
| | | یاخیبوونی ئەرمەنی- ڕووداوی ئەدەنە. |

| | | |
|---|---|---|
| | | سوپای بزووتنەوە لە ڕێگادایە بەرەو ئەستەنبۆڵ. |
| | | لادانی سوڵتان (عبدالحمید) سێشەممەی —٦-ی ڕەبیعی کۆتایی= ٢٧ نیسان. |
| ١٣٣٦ | ١٩١٨ | مردنی سوڵتان (عبدالحمید)ی دووەم. |

# شێخەکانی ئیسلام لەسەردەمی سوڵتان (عبدالحمید)ی دووەمدا

١-حسن خیرالله.
٢-قرا خلیل.
٣-أحمد مختار ملا.
٤-أحمد أسعد عریانی زادە.
٥-حاجی عمر لطفی البدرومي.
٦-محمد جمال الدین.
٧-محمد ضیاء الدین.

## سەرۆك وەزیرانی سەردەمی سوڵتان ( عبدالحمید )ی دووەم

١-رشدی پاشا.
٢-مدحت پاشا.
٣-ابراهیم ادهم پاشا.
٤-أحمد محمد پاشا.
٥-أحمد وفیق پاشا.
٦-محمد صادق پاشا.
٧-رشدی پاشا.
٨-محمد اسعد صفوت پاشا.
٩-خیرالدین پاشا التونسی.
١٠-أحمد عارفی پاشا.
١١- (سعید پاشا)ی بچووك.
١٢-محمد قدری پاشا.
١٣-(سعید پاشا)ی بچووك- بۆ جاری دووەم.
١٤-عبدالرحمن نورالدین پاشا.

١٥-(سعيد پاشا)ی بچووك- بۆ جاری سێیەم.
١٦-أحمد وفيق پاشا- بۆ جاری دووەم.
١٧-(سعيد پاشا)ی بچووك-بۆ جاری چوارەم.
١٨-محمد كامل پاشا.
١٩-أحمد جواد پاشا.
٢٠-(سعيد پاشا)ی بچووك-بۆ جاری پێنجەم.
٢١-محمد كامل پاشا- بۆ جاری دووەم.
٢٢-خليل رفعت پاشا.
٢٣-(سعيد پاشا)ی بچووك- بۆ جاری شەشەم.
٢٤-فريد پاشا الاولونياوی.
٢٥-(سعيد پاشا)ی بچووك بۆ جاری حەفتەم.
٢٦-محمد كامل پاشا-بۆ جاری سێیەم.
٢٧-حسين حلمی پاشا.
٢٨-أحمد توفيق پاشا.

تێبینی دەكرێ كە پێنج لە سەرۆك وەزیرەكان لە ڕەگەزی تورك نەبوون و ئەمانەن:
١-إبراهيم أدهم پاشا: یۆنانییە و لە دوورگەی ساقیزە.
٢-أحمد حمدی پاشا: ئۆبازییە لە قۆقاز.
٣-أحمد وفيق پاشا: بولگارییە لە بەلقان.
٤-خيرالدين پاشا التونسی: ئۆبازییە لە قۆقاز.
٥-فريد پاشا الاولونياوی: ئەرنائووتییە لە ئەلبانیا.

هەروەها تێبینی دەكرێ كە دوان لە سەرۆك وەزیرانی ئەم لستەیە لە كۆیلەكانن:
١-إبراهيم أدهم پاشا.
٢-خيرالدين پاشا التونسی.

# سەرچاوە و کانگاکان

## یەکەم/ عەرەبییەکان

١-ابراهيم حليم بگ: التحفة الحليمية في تريخ الدولة العلية، القاهرة ١٩٠٥م= ١٣٢٣هـ.

٢-أحمد فهد الشوابكة: حركة الجامعة الاسلامية منذ النصف الثاني من القرن التاسع عشر حتى عام ١٩٠٩، رسالة ماجستير بأشراف د. صلاح العقاد و الدكتور محمد حرب، أجيزت من جامعة عين شمس عام ١٩٨٣، طبعت فيما بعد.

٣-حسين باسلامة: تأريخ الكعبة المعظمة، جدة ١٣٥١.

٤-سعيد سفر الغامدي: موقف المعارضة في المشرق العربي من حكم السلطان عبدالحميد الثاني في الشام و مصر ١٢٩٣-١٣٢٧هـ= ١٨٧٦-١٩٠٩م. رسالة الدكتوراه بأشراف الدكتور محمد محمود السروجي. أجيزت من جامعة الامام محمد بن سعود الاسلامية بالرياض عام ١٤٠٦هـ= ١٩٨٥م.

٥-عبدالحميد الثاني: مذكرات السلطان عبدالحميد، ترجمة و تحقيق الدكتور محمد حرب، القاهرة ١٩٧٨ و ١٩٨٥.

٦-غليوم الثاني: مذكرات غليوم الثاني، ترجمها الى العربية محب الدين الخطيب و أسعد داغر، القاهرة ١٣٤١.

٧-محمد جميل بيهم: العرب و الترك في الصراع بين الشرق و الغرب ١٣٧٦هـ= ١٩٥٧م.

٨-محمد حرب: العثمانييون في التأريخ و الحضارة، بيروت ١٤٠٩هـ= ١٩٨٨م، دار القلم-دمشق.

٩-محمد حرب: خريطة لمنطقة الحرم المكي و تقرير هندسي عنها، مجلة الدارة، الرياض، العدد الثالث، السنة الثالثة عشرة، ربيع الاخر ١٤٠٨هـ ١٩٨٧م، ص٤٣-٥٤.

١٠-محمد حرب: المعالم الرئيسية للأسس التأريخية و الفكرية لحركة حزب السلامة في تركيا، بحث في "ندوة اتجاهات الفكر الاسلامي المعاصر" بالبحرين عام ١٩٨٥م، مكتب التربية لدول الخليج العربي، الرياض.

١١-محمد عارف الحسينى (محمد عارف ابن السيد أحمد المنير الحسينى الدمشقي): السعادة النامية الابدية في السكة الحجازية الحديدية.

12- jacob m. landau. The hejaz rail way and the muslim pilgrimage

acase of ottoman political propoganda detroit. U.s.a 1977.

١٣-محمد فريد: تأريخ الدولة العثمانية، الطبعة الثانية، بيروت ١٤٠٣هـ= ١٩٨٣م، تحقيق: احسان حقي.

١٤-يوسف آصاف: تأريخ سلاطين آل عثمان، تحقيق: بسام عبدالوهاب الجابي، دمشق ١٤٠٥=١٩٨٥هـ.

**دووەم-عوسمانییەکان:**

١-علی سعيد: سرای خاطره لری، سلطان عبدالحميد خانك حياتي، استانبول ١٣٣٨هـ.

٢-محمد الامين المكي: خلفاى عظام عثمانية حضراتنك حرمين شريفينده كي آثار مبرورة و مشكورة همايونلری... أستانبول ١٣١٩هـ.

**سێیەم: تورکییەکان:**

1- Abdüreşid Ibrahim 20 asrin Başlarinda Islâm Dünyasi, 2 cilt Mehmed Paksu, I stanbul 1987.

گەشتی (عبدالرشید ابراهیم) لە جیهانی ئیسلامی و بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە ژاپۆن، لە ١٣٢٨ لە ئەستەنبۆڵ بە زمانی عوسمانیی و پیتی لاتینی بەناونیشانی (جیهانی ئیسلامی و بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە ژاپۆن لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم) لە دوو بەش لە ئەستەنبۆڵ ١٩٨٧.

2- Ayşe Osmanoğlu, Babam Sultan Abdülhamid (Hatiralarim), Istanbul 1986.

-یاداشتەکانی شازادە عائیشەی کچی سوڵتان (عبدالحمید) چ٣، ئەستەنبۆڵ ١٩٨٦.

3-Celal Pasa, Madalyonan Tersi, Samih Nafiz Istanbul 1970.

-یاداشتەکانی (جلال پاشا)ی کوڕی (فرید پاشا)ی ئەولونیالی سەرۆك وەزیران، (سامح نافذطان صو) ئامادەیکرد بۆ بڵاو کردنەوە بە زمانی تورکی، ئەستەنبۆڵ ١٩٧٠.

4- Cevat Eren, Tanzimat, Islam Ansiklopedisi, clit 5.5. 709-765 Istanbul 1970.

-وتاری ڕێکخراوەکان لە کۆزانیاریی ئیسلامی (وەرگێڕانە تورکیەکە) ئەم وتارە لە دانانی مامۆستا (جواد أرن)ە.

5- Enver Ziya Karal, Osmanli Tarihi, cilt 5.8 Ankara 1983.

-(أنور ضیا قارال)، کتێبی مێژووی عوسمانی، بەرگی (٥) و (٨).

6- Hikamt Tanyo, Tarih Boyunca Yahudiler ve Türkler, 2 cilt. Istanbul 1977.

-(حکمت طانیو) سەرۆکی کۆلێژی (الهیات) لە ئەنقەرە، کتێبی جوولەکـە و تورکـەکان لـە مێژوودا، دوو بەرگە، ئەستەنبۆڵ ١٩٧٧.

7- Ibrahim Time, Ibrahim Timo'nun Ittihat ve Terakki Anilari, Istanbul 1987.

-یاداشتەکانی (ابراهیم تیمو)، دامەزرێنەری کۆمەڵەی (الاتحاد و الترقـی)، ئـەم یاداشـتانە ساڵی ١٩٣٩ لە مەجیدیە لە رۆمانیا بە زمانی تورکی چاپکران و دووبـارە لـە ئەسـتەنبۆڵ لـە ١٩٨٧ بڵاو کرایەوە.

8- Ilhami Soysal. Dünyada ve Türkiye'de masonluk ve masonlar, Istanbul 1980.

-ماسۆنیزم و ماسۆنیەکان لە جیهان و لە تورکیا، دانانی: (الهمـامی صـوی صـال) چـاپی (٢) ئەستەنبۆڵ ١٩٨٠، نووسەرەکە لە تورکە چەپڕەوە بەناوبانگەکانە.

9- Ihsan Sureyya Sirma, Il Abdülhamidin çin Müslümanlari Sünni Mezhebine Baglame Gayretlerine Dair Bir Belge, Tarih Dergisi, Istanbul 1979.

-وتاری (بەڵگەنامەی تایبەتی بە هەوڵەکانی سوڵتان (عبدالحمید)ی دووەم بە پابەند بـوونی موسڵمانەکانی چین بە رێبازی سوننی). دانانی مامۆستا (احسان ثریـا صـیرما) مامۆسـتا لـە زانکۆی ئەتاتۆرك لە ئەرزروم، لە گۆڤاری مێژوو دەرچووە، ئەستەنبۆڵ ١٩٧٩.

10- Ihsan Süreyya, Fransa'nin Kuzey Afrikadaki Sömürgeciliĝine Karşi Sultan Il Abdülhamidin'in Panislamist Faaliyetlerine ait Bir Kaç Vesika, Tarih Enstitüsü, Dergisi, sayl 7-8 Istanbul 1977.

-وتاری مامۆستا (احسـان ثریا صیرما) بەناونیشانی (چـەند بەڵگەنامەیـەکی تایبـەت بـە چالاکیە ئیسـلامیەکانی سوڵتان (عبدالحمید)ی دووەم دژی داگیرکـەری فەرەنسـی لـە بـاکووری ئەفریقیا)، گۆڤاری پەیمانگەی مێژوو لە ئەستەنبۆڵ، ١٩٧٧.

11- Ihsan Süreyya Sirma, Pekin Hamidiyye Üniversitesi, Islami Ilimler Fakültesi, Tayyib Okic Armagani, Ankara 1978.

-وتارێ بەناونیشانی (زانکۆی سوڵتان عبدالحمید لە پەکین)، دانانی مامۆستا (احسان ثریـا صـیرما) لەچوارچـێوەی "الی ذکـری طیـب اوق اریـج"، کۆلێـژی زانسـتە ئیسـلامیەکان لـە ئەرزروم، چاپی ئەنقەرە.

12- Ihsan Süreyya Sirma, Sultan II. Abdülhamid'in Panislamist Siyasetinde Rol Oynayan Tarikatlara Dair Basilmamiş Birkaç Belge, Islami Ilimler faküitesi, Ankara 1979.

-وتاری مامۆستا (احسان ثریا صیرما) لە بارەی "چەند بەڵگەنامەیەکی بڵاو نەکراوە لەبارەی ئەو ڕێبازە سۆفیانەی کە ڕۆڵێکی چاکیان لە سیاسەتی ئیسلامی سوڵتان (عبدالحمید)ی دووەم هەبوو"، گۆڤاری کۆلێژی زانستە ئیسلامیەکان لە ئەرزرووم، شوێنی چاپ: ئەنقەرە ١٩٧٩.

13- M. Süreyya Şahin, Faner Patrikhanesi ve Türkiye, Istanbul 1980.

-کتێبی (بەتریرکی ئەرسۆزکسی یۆنانی و تورکیا) کە بەتریرکی فەنارە، دانانی (م. ثریا شاهین)، ئەستەنبۆڵ ١٩٨٠، ئەمە نامەیەکی دکتۆرایە لە کۆلێژی (الهیات)ی ئەنقەرە.

14- M . Şükrü Hanioğlu, Bir Siyasal Örgüt Olarak Osmanli Ittihad ve Terakki Cemiyeti ve Jön Türklük 1889-1902, Iatanbul.

-کتێبی (م. شکری) (ترکیا الفتاة و جمعیة الاتحاد و الترقي)ی عوسمانی وەکو ڕێکخراوێکی ڕامیاری.

15- Mim Kemal Öke II. Abdülhamit. Siyonistler ve Filistin Meseles. Istanbul 1987.

-میم کمال اوکە، (السلطان عبدالحمید و الصهاینة و المسألة الفلسطینیة)، ئەستەنبۆڵ ١٩٨١.

16- Niyaze Berkes, Türkeye'de çağdaşlama. Istanbul 1978.

-مامۆستا: نیازی بەرکەس، (المعاصرة في ترکیا) ئەستەنبۆڵ ١٩٧٨، دانەر لە زانکۆی (ماکجل)ی مەنەدا مامۆستابووە و لە چەپی تورکی بەناوبانگ بووە.

17- Nihat Sayâr, Türkeye Imparatorluk Dönemi Mali Olaylari, Istanbul, 1977.

-مامۆستا: نهاد صایار، الاحداث المالیة في عهد ترکیا الامبراطوریة ئەستەنبۆڵ ١٩٧٧.

18- Ômer Sami Coşar Atatürk Ansiklopedisi cilt I, 1881-1908, Istanbul 1973.

-دائرة معارف اتاتورك، دانانی (عمر سامی جوشار)، بەرگی (١)، لە (١٨٨١-١٩٠٨)، ئەستەنبۆڵ ١٩٧٣، ئەمە کۆ زانیارییەکی تایبەتە بە ئەتاتورك، تەنیا ئەم بەرگەی لێ دەرچووە.

19- Osman Ergin, Türk Maarif Tarihi, Istanbul 1977.

-(عثمان أركين، تأريخ الدولة التربية التركية)، پێنج بەرگە، أستانبول ١٩٧٧.

20- Orhan Kuloğlu, Abdülhamit gerccgi, Istanbul.

-أورخان قول أوغلو، حقيقة عبدالحميد، استانبول.

21- Sina Akşin, Jön Türkler ve Ittihat ve Terakki, Istanbul 1980.

-سينا آق شين، تركيا الفتاة و الاتحاد و الترقي، استانبول ١٩٨٠.

22- Süleyman Kocabas, Hindistan Yolu ve Petrol uĝruna yapilanlar: Türkiy ve Ingiltere Istanbul 1985.

-سليمان قوجة باش (تركيا و انكلترا، طريق الهند وما بذل في سبيل البترول)، استانبول ١٩٨٥.

23- Sülayman Kocabas; Aurupa Türkeye'sini kaybi ve Balkanalarda Panislavizm, Istanbul 1986.

-سليمان قوجة باش، (الجامعة السلافيه (الصقلية) في بلاد البلقان و فقد تركيا الاوروبية)، استانبول ١٩٨٦.

24- Sülayman Kocabas, Tarihite ve günümüzdi Türk-Yanan Mucadelesi, Istanbul 1984.

-سليمان قوجه باش، "الصراع التركي اليوناني في التريخ وفي وقتنا الحاضر"، استانبول ١٩٨٤.

25- Şehbenderzade Ahmet Hilmi, Islam Tarihi, Ziya Nur, Istanbul 1982.

-ئەم کتێبە لە دانانی (شهبندر زاده أحمد حلمی)یە و بەناونیشانی (تأريخ الاسلام)ە دانەرەکەی بۆ بەربەرچدانەوەی تانەکانی دووزیی ڕۆژهەڵاتناس کتێبەکەی داناوە کە تانەی لە مێژووی ئیسلام داوە، مێژوونووس (ضیانور) وەری گێڕاوەتە سەر پیتی تورکیی لاتینی لەگەڵ هەندێ زیادەکاری و شرۆڤە، سوودمان لە چاپی دووەمی پیتی لاتینی وەرگرت کە خستە سەری (ضيا نور)ی لەسەرە، ئەستەنبۆڵ ١٩٨٢.

26- Şerif Mardin, Jön Türkeler'n Siyasi Fikirleri 1885-1905 Istanbul 1983.

-شريف ماردين، "الفكر السياسي لتركيا الفتاة من عام ١٨٨٥-١٩٠٨" استانبول ١٩٨٣.

27- Türk dili ve Edebiyati Ansiklopedisi, cilt I ve cilt 5. Istanbul 1977.

-(دائـرة معـارف اللغـة التركيـة و آدابهـا، اصـدار دار دركـاه للنشـر في اسـتنبول)، ئەمـە كۆزانیارییەكی تایبەتە لە شەش بەش، بەشی یەكەم لە ساڵی ١٩٧٧ دەرچووە.

28- Yusuf Akçura, Osmanli Devletinin Daĝilma Devri, Ankara 1985.

-یوسف أق جورا "عـهد انحلال الدولة العثمانیـة"،ط٢، (وێنەی گیراوەتەوە)، أنقره ١٩٨٥. دانەر لەسەركردە توركە نەتەوەییە توندڕەوەكانە.

29- Yilmaz Oztuna, Büyük Türkiye Tarihi, cilt 7, Istanbul 1978.

-ئەمە كتێبێكی ڕۆشنبیریی مێژووییە لە چواردە بەرگدا، دانەری: (یلماز أوزطونة، صـدر فی استانبول عام ١٩٧٨).

30- Yusuf Hikmat Bayur, Türk Inkilâbi Tarihi, cilt 1-1 Ankara 1983.

# پێرست

## لە بارەی سوڵتان (عبدالحمید)ەوە گوتراوە :

عبدالحمیدی دووەم یەکێکە لە گەورەترین ئەو کەسێتیانەی، کە لە مێژوودا درۆی بۆ هەڵبەستراوە.

(آت صز) نووسەرێکی تورکی

لە سەردەمی سوڵتان عبدالحمید لوبنان و تیرەی مارۆنی بەهەزار خێر و دڵنیاییەوە ژیان.

(الیاس الحویك) بەترێرکی مارۆنی

بەرادەیەک خاکسار(متواضع) و گران بوو کە سەرم لێی سوڕمابوو، تا ئەوپەڕی پابەند بوو بە ئایینەکەی، ئاگای لە زانا و پیاوانی ئایینی هەبوو، بە هەموو بڕوایەکەوە دەتوانم بڵێم: ئەگەر عوسمانییەکان لەسەر ڕێگای ئەو بڕۆیشتبان ئەوا شکۆداری و هێزی پێشوویان بۆ دەگەڕایەوە و لە بواری ڕۆشنبیری و ئابووری لە کاتێکی کەمدا دەگەیشتنە ئاستی دەوڵەتە ئەورووپییەکان.

پڕۆفیسۆر (ارمینیوس فامبری) ڕۆژهەڵاتناسێکی مەجەری

ئەی سوڵتانی مەزن، بەبێ ئابڕوویی بوختانمان پێکردی.

(د. رضا توفیق) گەورەترین بیریاری بزووتنەوەی الاتحاد و الترقی

سەرەڕای ئەوەی کە سوڵتان عبدالحمید هێزێکی سەربازی مەزنی هەبوو و ئامادە بوو بەرگریی لێ بکات، بەڵام جەنگ و کوشتاری نەخستە بەرچاوەکانی بۆ ئەوەی بەرگری لە عەرشەکەی بکات، ئەگەر ئەمەی بکردایە کەس نەیدەتوانی دایبەزێنێ.

(سیر هنری وودز) موشیر لە دەریاوانیی عوسمانی

گوتمان: سوڵتان ستەمکارە، سوڵتان شێتە، گوتمان: هەر دەبێ شۆڕش لەسەر سوڵتان بکرێ، بە گوتەی شەیتانمان باوەڕ کرد، وروژاین، ئاشووبی نووستوومان بە ئاگا هێنا، بەڵام ئەی گەورە سیاسەتمەداری سەردەم تۆ شێت نەبووی، بەڵکو ئێمە شێت بووین و نەمان دەزانی، هەر تەنیا شێت نەبووین، بەڵکو زۆڵ و شەرفرۆش بووین و لە ئاکاری چاک بێبەش بووین.

(د. رضا توفیق) فەیلەسوفی الاتحاد و الترقی

ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری و هونەر
٣٢٤ ساڵی ٢٠٠٤